# وانەکان لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام

دانراوی

شێخی ئیسلام و نوێکەرەوەی - موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب

ڕاڤەکردنی

شێخی پایەبەرز - صالح بن فوزان الفوزان



وەرگێڕانی

ئاکۆ جلیل کریم (گوخلانی)







| | |
|---|---|
| ناوی کتێب به عـەرەبی | دروس في شرح نواقض الإسلام |
| نـاوی کتێـب به کوردی | وانەکان لەڕاڤەی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام |
| دانــــــــــــــــراوی | شەیخی ئیسلام – موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب |
| ڕاڤــــــــــــەکردنی | شەیخی پایەبەرز – صالح بن فوزان الفوزان |
| وەرگێڕانــــــــــــــی | ئاکۆ جلیل کریم ( گۆخڵانی ) |
| هەڵەچــــــــــــن | سەرگورد گۆخڵانی |
| نـەخـشەسازی نـاوەوە | کۆمپیوتەری نارین (محمد علی) |
| نـــۆرەو ســاڵی چــاپ | دووەم ٢٠١٢ز |
| ژمــــــــارەی سـپاردن | (٢٤٢٠)ی ساڵی ٢٠٠٩ی پێدراوە |

# وانەكان لەڕاڤەی
# هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام

## دانراوی

شەیخی ئیسلام و نوێكەرەوەی - موحەمەدی كوڕی عبدالوهاب

## ڕاڤەكردنی

شەیخی پایەبەرز – صالح بن فوزان الفوزان

## وەرگێڕانی

ئاكۆ جلیل كریم (گۆخڵانی)

# پێشەكی وەرگێڕ

إن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَ نَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِالله من شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاَّالله وَحْدَهُ لاشَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ الله وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ.

سوپاس بۆخوای پەروەردگار كەدەرفەتی دامێ تا بتوانم هەستم بەوەرگێڕانی ئەم پەرتوكە بەنرخە كەیەكێكە لەبەهێزترین پەرتوكەكان لەبواری خۆیدا بەناوی(دروسٌ فی شرح نواقض الإسلام) لەبەرهەمەكانی مامۆستاو خۆشەویستمان (شێخ صالح فوزان الفوزان) خوای گەورە تەمەن درێژی بكات بۆخزمەتكردن بەبیروباوەڕی پاكو بێگەرد كەخۆی لەبیروباوەڕی ئەهلی سەنەوجەماعەدا دەبینێتەوە چونكە شارەزابوون لەبیروباوەڕی ڕاست و دروست ئەركی سەرشانی هەموومانە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾[١] واتە: (جا ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی مرۆڤ بزانە كەهیچ پەرستراوێ نیە بەهەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله) ئەوەتا خوای

[١] محمد: ١٩

پەروەردگار خۆی داوامان لێدەکات کەپێویستە شارەزای بیروباوەڕی ڕاست و دروست بین، وەهەروەها پێویستە شارەزای دژەکانیشی بین تا نەکەوینە ناویەوەو خۆمانی لێ بەدووربگرین، وەبەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت کەپێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان بۆمان دەگێڕێتەوە (من مات وهو یعلم أنه لاالەالاالله دخل الجنة)[1]

واتە: (هەرکەسێك مردوو زانی کە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله دەچێتە بەهەشتەوە).

دەبا وردبینەوە بزانین زانینی بیروباوەڕی ڕاست چەندە پێویستە، موسڵمانانی خۆشەویست دەبێت بزانین کە خوای گەورە زۆر ڕقی لە هاوبەش دانانە کەدژی یەکتاپەرستیە وەکو خۆی دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾[2] واتە: (بەڕاستی خوای گەورە لە کەسێك خۆش نابێت هاوبەشی بۆ دابنێ وەلەخوار هاوبەش دانانەوە خۆش دەبێت بۆ هەر کەسێك خۆی ویستی لێبێت، وەهەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دادەنێ ئەوا گومانی تیادا نیە کە درۆیەکی زۆر گەورەی کردووە) وە لە چەندان ئایەت و فەرمودەی تردا خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات بەفێربوونی یەکتاپەرستی و دوور کەوتنەوە لە هاوبەش دانان، جائەم پەرتوکەی بەردەستت زۆر بە جوانی فێری یەکتاپەرستیمان دەکات و دژەکانیشیمان پێ دەناسێنێ، لەبەرئەوە شێخ هەستاوە بەڕاڤەکردنی دەقی (نواقض الإسلام)ی زاناو نوێکەرەوەی ئاینی ئیسلام لە چەرخی خۆیدا (شێخ موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب) ڕەحمەتی خوای لێبێت کەبەڕاستی توانی گۆڕانێکی ڕیشەیی لەناو موسمانانـدا دروست بکات بەوەی هۆشیاریان کاتەوە لەبیروباوەڕی چەوتو لاروخوڕافەت و سیحرو جادو کەبەڕاستی ڕەگی لەنیمچە دوورگەی عەرەبیدا و

---

[1] رواه مسلم (٤٣/٢٦)

[2] النساء: ٤٨

تــەواوی جیهــانی ئیــسلامدا داکوتیبــوو، ئــەم زانابــەڕێزەهات وەکوپێــشینەکانی خــۆی بانگەوازی خەڵکی کردەوە لەسەر چاوڕۆشنی بـەقورئان و سـوننەت بۆئەوئاینـە پاکـەی کەپێغمبەر ﷺ وشـوێنکەوتوانی لەسـەر بـوون لـەهاوەڵان و دوای ئـەوانیش ﵃ وەکـو هەرچوار پێشەواکە (ئەبوحەنیفـەو مالیـك و شـافیعی و ئەحمـەد)کەلەسـەر بیروبـاوەڕی ڕاست و دروست ژیان و مردن، وەهەروەها هەردوو شێخەکەی ئیـسلام (ئـیبن تیمییـە و قوتابیەکەی ئیبن القیم) کەڕەنجێکی زۆریان کێشا لە پێناو هێشتنەوەی ئەم ئاینە پاکە لەسەر پاکیە تیەکەی خـۆی، پێـشەوامان بەهـەمان شـێوەی ئـەوان لەنیمـچەدوورگەی عەرەبیدا خەڵکو بەندەکانی خوای لەبیرو باوەڕی درۆو پـوچ پـاککردەوە خـوای گـەورە لـەجیاتی ئێمـە پاداشـتی بداتـەوەو پلـەی لەبەهەشـتدا بەرزبکاتـەوە، ئـەوەی ئێمـە لەخزمەتیداین یەکێکە لەبەرهەمەکانی کەپڕیەتی لە پەندو ئامۆژگاری بەسود دەربارەی ئەو قسەو ڕەفتارانەی کە ئەگەر مرۆڤ بیڵـی یـان هەسـتێت بـەکردن و ئەنجامـدانی ئـەوا ئیـسلامەتیەکەی پـێ هەڵدەوەشـێتەوە پـەنا بـەخوای گـەورە.کەواتـە لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێت ئـەم بابەتـە چـەندێ گـەورەو مەترسـیدارە، بۆیـە پێویـستە لەلایەکـەوە موسڵمان شارەزا بێت لێی و لە لایەکی تریشەوە خۆی بپارێزێت لەوەی قـسەیەك بکـات یان کردەوەیەك ئەنجام بدات کە بیرو باوەڕەکەی لـەدوای مانـدوو بـوون و نارەحـەتیی و شەونخونی و سەرماو گەرماو نەخۆشـیی و ئاگاداربوون هـەڵبووە شـێنێتەوە.بۆیـە زۆر خـۆم بەخۆشـحاڵ دەزانم کەبەیارمــەتی خــوای گــەورە تــوانیم ئــەم پەرتوکــەی کــە لەخزمەتیـداین وەریبگێڕمـە سـەر زمـانی شـیرینی کـوردی تاموسـڵمانانی کـورد زمـانی خۆشەویـستیش لــە سەرچاوڕۆشـنی بتــوانن دینــداری خۆیــان بکــەن و شــارەزابن لــە ئاینەکەیان و ئاگاداری زمان و ڕەفتاریان بن تا نەکەونە ناویەکێ لە هەڵوەشـێنەرەکانی ئیسلامەوە، ئەم نامیلکە یە زۆر کەس هەستاوە بەڕاڤە کردنـی چ بەشـێوەی سـەربەخۆ وەك ئەوەی بەردەستی بەڕێزتان یان ڕاڤەیان کردووە لەگەڵ پەرتوکە بەنرخەکەی تری

پێشەوامان (الواجبات المتحتمات المعرفة على كل مسلمٍ ومسلمة) من لەم ڕاڤە کردنەیدا زانایەکی بەڕێزو مامۆستایەکی خۆشەویستم هەڵبژاد کەئەویش (شێخ صالح فوزان الفوزان)ە خوا بیپارێزێت لەبەر چەند هۆیەك لەوانە:

١-ئەم زانا بەڕێزە زۆر شارەزایە بە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەوجەماعە دەستێکی باڵای هەیە لەو بوارەداو کۆمەڵێکی زۆر دانراوی هەیە کە جێگەی ڕەزامەندی زانایانی وەك هەردوو شێخەکەی ئیسلام (ئیبن بازو ئیبن عثیمین)ە.

٢- ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە ئەم زانایە لەم سەردەمەی ئێستادا دەژی بەواتایەکی تر شارەزای ڕێچکەو ڕێبازە گومڕاکارەکانەو ئەم بابەتەش زۆر لێکدانەوەو بۆچون هەڵدەگرێت کەپێویستی بەکەڵە پیاوێکی وایە کەوەڵامی پڕبەپێستی خۆی بداتەوە.

٣-بابەتەکانی بیروباوەر لەگەڵ بابەتە فیقهیەکاندا وابەستەی یەکدین شێخ فەوزانیش لەگەورەترین شارەزایانی شەریعەتە لەم سەردەمەی ئێستادا بۆیە پێمخۆشبوو ڕاڤەی ئەو کەڵەپیاوە بەسەر ئەو نامیلکە بەپێزەدا هەڵبژێرم خوای گەورە لێمانی وەربگرێت.

لە کۆتای ئەم پێشەکیەدا داواکارم کە خوای پەروەردگار ئەم کارەم لێوەربگرێت و نیەتم پاك بکاتەوە بەوەی کەهەر کارێك دەکەم تەنها لەبەر ڕەزامەندی خۆی بێت ئامین، وەداواکارم کەلەتاوانەکانم ببورێتو بەڕەحمی خۆی ڕەحمم پێ بکات، وەموسڵمانان ڕێنویی بکات بۆ ڕێگای ڕاست و بیروباوەڕی ڕاستیان لەلاشیرین بکات بیانکاتە شوێنکەوتەی.

کۆتا داواکاریم لە فێرخوازانی زانستە کەزۆر بایەخ بدەن بەبواری بیروباوەڕو پەرتوکەبەسودەکان بەشێوەی وانە بخوێنن لای مامۆستای شارەزا لەو بوارەدا، وە هەرگیز خۆتان بەدوور مەگرن لە پەرتوکەکانی پێشەواو مامۆستامان (شێخ موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب)بەتایبەتی ئەم پەرتوکەی بەردەستان چونکە زانستێکی زۆری تێدایە

وەهەموو پەرتوکەکانی تریشی هەر لە (القواعد الأربع)وە تا پەرتوکە ئاڵتونیەکەی (کتاب التوحید)کە زۆرێك لەزانایانی لە خواترس ڕاڤەیان کردووە خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

داواکارم کەخوای پەروەردگار دروودو سەلامی بێ کۆتا بڕێژی بەسەر پێغەمبەرمان محمدﷺوەهەموو شوێنکەوتوانی و خزمە نزیکەکانی تا ڕۆژی دوای ولەدایکوباوکی منو هەموو موسڵمانێکی بیروباوەڕپاك خۆش بێت .

وصلّى على حبيبنا محمد و على آله وسلم

وآخِرُ دَعْوَانا أنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

براتان

((ئاكۆ جليل كريم))

سلێمانی




١-خوێنەری بەڕێز ئاگاداربە کەزۆر ئەمانەت پارێزیمان کردووە لە کاتی وەرگێڕانـدا واتە پەرتوکە عەرەبیەکە چۆنە ئاوا وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

٢-بەلاّم لەهەر شوێنێکدا پێویستی بەزیادە شیکردنەوەیەك هەبووبێت ئەوا لـەنێوان دوو کەوانەدا شیمانکردووەتەوە واتا ئەوە بۆچونی وەرگێڕە ئەگەر ڕاست بوو ئـەوە لـە خــوای گەورەوەیــە، وەئەگــەر هەڵــە بــوو ئــەوا لــە نــەفس و شــەیتانەوەیەو داوای لێخۆشبوونم لە خوا بۆ بکەن.

٣-لەکاتی وەرگێڕاندا هەوڵمداوە کام ووشە زۆر سادەو ئاسان و زۆر بە کـار هـاتووە ئەوە بەکاربێنم ئەگەرووشەیەکی قورسی تیادابوو ئەوا داوای لێبوردن دەکـەم مـن هـەر ئەوەندەم لێزانیوە.

٤-بۆڕاڤەی ئایەتەکان پشتم بەیـەك تەفـسیر نەبەسـتووە، بـەلاّم سـودێکی زۆرم لـە تەفــسیری (ڕامــان)وەرگرتــووە خــوای گــەورە لــە خاوەنەکــەی خۆشــبێت چــونکە تەفسیرێکە زۆر نزیکە لەتەفسیری ئەهلی سوننەو جەماعەوە بۆ قورئانی پیرۆز.

٥-وەهەوڵمانــداوە تێکــەلاّوی ڕونــەدات لــەنێوان وانەکانــدا، واتــە هــەر وانــەو بەشێوەیەکی جیا لەوانەکەی پێش خۆیی و دوای خـۆی هێناومانـە تاهۆکارێك بێـت بـۆ ئاسان خوێندنەوەی و لێتێگەیشتنی.

## پێشەكی ڕاڤەكار

**(بەناوی خوای خاوەن كەرەم و ڕەحمەتی بێ ئەندازە)**

سوپاس بۆ خودای جیهانیان، سڵاو و درود لەسەر پێغەمبەرمان موحەمەدﷺ، كۆتایی پێغەمبەران وە لەسەر خێزانەكانی و كەسوكار و هاوەڵانی و شوێنكەوتوانی هاوەڵان بە چاكە تا ڕۆژی قیامەت .

لە پاشدا: بە دڵنیاییەوە خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱدْخُلُوا۟ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾ ﴾[1].

واتە: ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە، ئەبێت هەر هەموتان ئامادەی چوونە ناو فەرمانی خوابن، وە شوێن هەنگاوەكانی شەیتان مەكەون، چونكە شەیتان دوژمنێكی ئاشكرای ئێوەیە.

وە ئەم ڕاڤەیە بۆ نامەی ((هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام)) ی زانای نوێكەرەوە (محمدی كوڕی عبدالوهاب) ڕەحمەتی خوای لێ بێت. كە بەچەند وانەیەك لە مزگەوتدا وتومنەتەوە، هەندێ لە برایان وایان بەباش زانی بینوسنەوە لە كاسیەتەوە بیخەنە سەر پەڕە و چاپی بكەن لە پەرتوكێكدا و داوای مۆڵەتیان لێكردم بۆ ئەو كارە و منیش مۆڵەتم دا.

بەهیوای ئەوەی كە سودێكی تیادا بێت.

---

[1] البقرة: ٢٠٨

زانای بەڕێز و برام كە هەستاوە بەم كارە (محمد بن فهد الحصين) خوا پاداشتی بداتەوە و سودی پێ بگەیەنێ، وە مۆڵەتم دایێ بە لە چاپدانی و بڵاوكردنەوەی.

وە سڵاوو درود لە پێغەمبەر موحەمەد ﷺ و ئال و هاوەڵانی بێت.

نوسینی: صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان لە ١٤٢٤/١١/٥ كۆچی.

سوپاس بۆ خواو لە پاشاندا: مۆڵەتم دایە مامۆستا (محمد بن فهد الحصين) بە لە چاپدانی پەرتوكەكەم (( وانەكان لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام))ی زاناو پێشەوا (محمد بن عبدالوهاب).

مۆڵەتدانێكی بەردەوام بە دووبارەكردنەوەی لە چاپدان بە نەمانی، پشتیوان بەخوا.

سڵاو و درود لەسەر پێغەمبەرمانﷺو ئال و هاوەڵانی.

نوسینی

صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان

لە ١٤٢٥/٤/١١ كۆچی




**(بەناوی خوای خاوەن كەرەم و ڕەحمەتی بێ ئەندازە)**

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی كە لە دوای پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لە هەموو سەردەمێكدا هەندێكی هێشتووەتەوە لە زانایان كە بانگەوازی ئەوانە ئەكەن كە گومڕا بوون بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، وە ئارامیش ئەگرن لەسەر ئازاردانی ئەوان بۆیان، وەبە پەرتوكەكەی خوای گەورە كە قورئانە مرۆڤە دڵ مردووەكان زیندوو ئەكەنەوە، وە بە ڕوناكی ئاینەكەی خوای گەورە مرۆڤە كوێرەكان چاو ڕۆشن ئەكەنەوە. وە چەند لە كوژراوانی دەستی شەیتانیان زیندوو كردۆتەوە، وە چەند گومڕاو سەر لێشێواویان ڕێ پیشانداوە.

ئای چەندە جوانە شوێنەواریان لەسەر خەڵكی، وە ئای چەندە ناشرینە شوێنەواری خەڵكی بۆ سەر ئەوان.

وە دووری ئەخەنەوە لە قورئانەكەی خوا گۆڕانكاری زیادەڕەوەكان، وە ئەو شتانەی كە پوچەڵ كارەكان ئەیدەنە پاڵ دین و بە هەڵە ماناكردنی نەزان و نەفامەكان. ئەوانەی كە ئاڵای داهێنراویان بەست و هەڵیانكرد، وە ئەوانەی بیر و هۆشی فیتنە ئامێزیان ڕەها بەردا، ئەوانە جیاوازن و كۆك نین لە قورئاندا ((هەركەسە و بۆچونی خۆی هەیە و یەكڕانین لەسەر ڕاڤەكردنیان بۆ قورئان)) سەرپێچی كارن بەرامبەر قورئان و گوێڕایەڵی ناكەن، وە یەكدەنگن لەسەر دوورە پەرێزییان بۆ قورئان و پشت گوێخستنی، ئەوانە لەسەر خوای گەورەو وە بەناوی خواوە قسەئەكەن و وە بەناوی قورئانەوە درۆ هەڵئەبەستن بەبێ ئەوەی بزانن و زانستیان هەبێت هەر لە خۆیانەوە ئەدوێن.

هەر شتێك کە دەرونیان پێ ی خۆش بێ و عەقڵیان پێ ی ڕازی بێت دایئەهێنن لە دیندا و واش گومان ئەبەن و باوەڕیشیان وایە کە ئەوەی ئەوان ئەیکەن و لەسەرین ئەوە سەرفرازیە و ڕێگەشە بۆ ڕزگاربوون، هەتا وایان لێهاتووە پیشەیان بووەتە خەڵەتاندنی خەڵکی بەزۆری ئەو گومانانەی بۆیان دروست ئەکەن هەروەکو پارچەیەك بێت لە شەو، پەنا دەگرین لە شەڕ و خراپەی گومڕایان بە خوای گەورە.

وە درود لە پێغەمبەرمان موحەمەد ﷺ وە لەسەر ئال و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی ئەوانیش بە چاکە تا ڕۆژی قیامەت.

لە پاشانیشدا: لە گرنگترین دانراوەکانی شەیخی ئیسلام و نوێکەرەوەی (محمد بن عبدالوهاب) ڕەحمەتی خوای لێ بێت. لە بواری بیروباوەڕدا پەرتوکی (( دە هەڵوەشێنەرەوەکەی ئیسلام)) ە کە لە کاتێکدا دایناوە کە بینیویەتی لە سەردەمی خۆیدا ((لەو کردار و گوفتارە خراپ و پوچانەی خەڵکی بەکاریان هێناوە و ڕەفتاریان کردوە پێ ی )) کە مرۆڤ شەرمەزاری بۆ ئەڕێژێ و دڵ بۆی ئەگریەت و پێ ی ناخۆشە، وە بانگەوازی خەڵکی کردووە بۆ یەکتاپەرستی خوای گەورە و بە تاك دانانی لە پەرەستندا وە وازهێنان لە پەرەستنی جگە لەو وە ئاگادارو هۆشداری داونەتێ لە کەوتنە ناو هاوبەش بڕیاردانەوە، وە خۆی ڕەحمەتی خوای لێ بێت هەستا بە تێکۆشان لە پێناوی خوادا بۆ دەرهێنانی خەڵکی لە تاریکایەکانی هاوبەش پەیداکردن و داهێنان لە دیندا بۆ ڕۆشنایی یەکتاپەرستی و شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری نازدار ﷺ، وە لەئەنجامدانی کارەکانیدا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساوە و مەبەستی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بووە، جا بۆ ئاگادارکردنەوەی موسڵمانان و ترساندنیان لە تێکەوتنی و ئەنجامدانی ئەم هەڵوەشێنەرەوانەی دانا خوای پەروەردگار پاداشتی بداتەوە لە جیاتی ئومەتی موحەمەد (ﷺ) لەو چاکەی لەگەڵیاندا کردوویەتی بە دانانی ئەم نامە بەسودە بە باشترین پاداشت.

جا بە دڵنیاییەوە زانایان و فێرخوازانی زانستی شەرعی گرنگیەکی زۆریان داوە بەم هەڵوەشێنەرەوانە و لەبەریان کردوە و هەستاون بە ڕاڤەکردنی و وە لەسەر نووسینی و خوێندنی لەناو مزگەوتەکاندا لەسەر ڕێڕەو و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نەك لەسەر ڕێڕەوو بیروبۆچونی ئەوانەی خەڵك بە کافر ئەزانن لەبەر هەواو و ئارەزووی خۆیان یان ئەوانەی خەریکی حیزبایەتی و پارچە پارچە گەریەتین کە هەستاون بە ڕاڤەکردنی ئەم هەڵوەشێنەرەوانە بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان و رەواج دان بە بیروبۆچونەکەیان. جا خەڵکانێکی زۆر لە هەردوو چینی خەڵکی بەگشتی و ئەوانەی بانگەشەی زانینی زانست ئەکەن بە تایبەتی پێ یان هەڵخەڵەتاون و گومڕابوون. وە لەپاشانیشدا تاقیکراینەوە و دووچاری شەڕەکانی کۆمەڵانی داهێنەران و پارچەگەریەتی و دووڕویەتی ئەوانەی کە تانە لە بانگەوازەکەی پێشەوا (( محمد بن عبدالوهاب)) دەدات و پەرتوکەکانی تاوانبار ئەکات وە هەروەها پەرتوکەکانی بانگەوازی سەلەفییەت تاوانبار ئەکەن بەوەی کە سەرچاوەی توندڕەوی و تیرۆر و تۆقاندنن.

چاولێکەری و لاسایکردنەوە و لەسەر ڕێباز ڕۆیشتنی ئەوانەی کە ئەڵێن لەم سەردەمەدا لە شیعە ڕافیزیەکان و بێ باوەڕەکان و بیدعە چییەکان کە خەڵکی لە بانگەوازی و خۆی ئاگادار ئەکەنەوە و لێ ی دوور ئەخەنەوە، وە بە سیفەتی جۆراوجۆر تۆمەتباری ئەکەن و ناوی ئەو بانگەوازە پاکە ئەنێن بە ((وەهابییەت)) وە جگە لەمەش لە ناو و ناتۆری لای بیدعە چییەکان.

وە ئەحمەدی کوڕی سینانی قەطان ڕاستی فەرمووە کاتێ فەرمویەتی: ((لە دونیادا بیدعەچییەك نیە ئیلا ئەو بیدعە چییە ڕق و کینی لە فەرمودەناسانە))[1] ((چونکە فەرمووده ناسان گومانە پوچەکانیان بەتاڵ ئەکەنەوە و مەزهەبەکانیان

---

١ صابونی لە بیروباوەڕی اهل الحديث لاپەڕە ٢٠٠

هەڵئەوەشێننەوە وەکو شێخ ئەلبانی و شێخ ڕەبیع و شێخ موقبیل کە هەموو بیدعەچییەك لەبەردەمیاندا ئەلەرزێت وچۆك دائەدات بۆیە ئەیان بینی ڕقییان لێیانە و پەرتووکەکانیان ناخوێننەوە و خەڵکیان لێ دوور ئەخەنەوە تا زیاتر ڕەواج بدەن بە ڕێبازە پوچەڵەکەی خۆیان خوای گەورە بمانگێڕێ بە شوێنکەوتەی سوننەت و ئەهلەکەی دوورمان بخاتەوە لە بیدعە و ئەهلەکەی تا لە ڕیزی کۆمەڵی ڕزگاربواندا بین ئامین...... وەرگێڕ)).

وە ئەبو حاتەمی ڕازی فەرمویەتی ((نیشانەی بیدعەچییەکان باسکردن و قسەوتنە بە فەرموودەناسان وە نیشانەی کافر و بێ باوەڕەکان ناولێنانی فەرمودەناسان و شوێنکەوتوانی سوننەتە بە دەسکەنە کار و ڕنەرەوە. وە نیشانەی قەدەریەکان ناولێنانی شوێنکەوتوانی سوننەتە بە زۆر لێکراو وە نیشانەی جەهمیەکان ناولێنانی ئەهلی سوننەتە بە چوێنەرەکان شوبهێنەرەکان، وە نیشانەی شیعە ڕافزیەکان ناولێنانیانە بۆ شوێنکەوتوانی سوننەت کە کەسانی ڕواو و هەڵواسراو دامەزراوە.

ووتم هەموو ئەمانە دەمارگیرییە و ئەهلی سوننەت و شوێنکەوتوانی تەنها یەك ناویان هەیە و بەس ئەویش ((هاوەڵانی فەرمودەن = فەرموودەناسان= شوێنکەوتوانی سوننەت))[1] .

وە بە دڵنیاییەوە خوای پەروەردگار منەتی خۆی ڕشتووە بەسەر مامۆستای شارەزاو شەرعزان صالح بن فوزان الفوزان خوا بیپارێزێ بە ڕاڤەکردنی ئەم هەڵوەشێنەرەوانە لە مزگەوتی ئەمیر موتعب کوڕی عبدالعزیز ال سعود ڕاڤەیەکی تەواو چارەسەر تا سودی گشتگیر و تەواو مەبەست و نیازی هەبێت.

وە سور بوم لەسەر دەرهێنانی ئەم ڕاڤەیە بەو شێوەیەی کە ئەیبینین بۆیە داوام لە شێخ کرد لە نوسینەوەی ئەم ڕاڤە بەسودە لە کاسێتەکانەوە بۆسەر پەڕە، ئەویش

---

[1]) هەمان سەرچاوە لاپەڕە (( ٣٠٤ – ٣٠٥))

مۆڵـەتی دام و دوای نووسـینەوەی جـارێکی تـر خـستمەوە بـەر دەسـتی بـەڕێزیان و پەسەندی کرد، لەگەڵ زیادکردنی ئەو پرسیارە گرنگە پەیوەندی دارانەی پەیوەستە بە هەریەك لە هەڵوەشێنەرەکان لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام تا سودەکەی گشتگیرترو مەبەستدارتر بێت، تەماشای کرد و بەهێزتری کرد و بۆی زیادکرد و لیّ ی لابرد بەو شێوەیەی کە بەباشی زانی.

پاشان مۆڵەتی دام بە دەستنووسی خۆی بە بڵاوکردنەوەی وە سوپاس و منەت هەر بۆ خوای پەروەردگارە.

وە لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە و بەرز و بڵند کە بەرەکەت و پیرۆزی خۆی بخاتە ئەم هەوڵەوە لێشم وەربگریّ وە بیکاتە جێگای ڕەزامەندی خۆی و ڕاست و دروست لەسەر سوننەتی پێغەمبەرمان موحەمەد ﷺ بێت، وە بیکاتە ڕۆشنکەرەوەی چاوەکان و چاوی خوێنەرانی پیّ ڕۆشن بکاتەوە تا بەهۆیەوە حەقی پیّ بناسنەوە و لە ناحەقی جیابکەنەوە، وە مامۆستامان پایەدار بکات و یارمەتی بداتو سەری بخات بۆ ئەوەی کە خۆی پیّ ی خۆشە وە لیّ ی ڕازییە خوای پەروەردگار، وە لە پێشەوای نوێکەرەوەی ئیسلام (محمد بن عبدالوهاب) خۆش بێت ڕەحمەتی خوای لیّ بێت وە لە بەهەشتی فراوان و بەرینی خۆیدا نیشتەجیّ ی بکات، وە ئێمەش و ئەویش لەگەڵ پێغەمبەران سەلامی خوایان لیّ بێت وە ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندا حەشر بکات، وە چەندیّ باشە هاوڕێیەتی ئەوانە.

وە سەلام و درودی خوای پەروەردگار لەسەر پێغەمبەر موحەمەد ﷺ گەورەی هەموو دروستکراوەکان وە لەسەر کەسوکاری و هاوەڵە بەڕێزەکانی سڵاوێکی زۆر بڕێژیّ بەسەریاندا.

نووسینی/ محمد بن فهد الحصين

٢٨ / ١٢/ ١٤٢٤ کۆچی




زانای پایەبەرز و بەڕێز ((محمد بن عبدالوهاب)) ڕەچەڵەکی- پێشەوا موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب کوڕی سولەیمانی کوڕی عەلی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ڕاشدی کوڕی بورەیدی کوڕی موحەمەدی کوڕی موشریفی کوڕی عەمری لە وەهبەت کوڕانی تەمیمە.

لە دایکبونی- پێشەوای نوێکەرەوەی ئیسلام لە شاری عویەینە لە ساڵی ١١١٥ کۆچی لە ماڵێکی دینداری خاوەن ڕێز و زانست لە دایك بووە. باوکی زانایەکی گەورە و بەشکۆ بووە و باپیریشی سولەیمان زانای ناوچەی نەجد بووە لەسەردەمی خۆیدا.

ژیانی و پێگەیشتنی- پێشەوا لە ماڵێکی خاوەن دین و ڕێز و زانست ژیاوە و پێگەیشتووە، وە قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە دە ساڵ، وە وانەکانی شەریعەتی خوێندووە تا بەشێکی باشی لە زانست بەدەستهێناوە، پێشەوا جێگەی سەرسوڕمانی باوکی بووە لەبەر بەهێزی لایەنی لەبەرکردنی، وە زۆر لە پەرتوکەکانی تەفسیر و فەرمودەی بە زۆری ئەخوێندەوە، وە زۆر بە هەوڵ و کۆشش بووە بە شەو و ڕۆژ لە گەڕان بەدوای زانستی شەرعیدا پێشەوای بەڕێز زۆرێك لە دەقە زانستیەکانی لە زانستە جۆراوجۆرە کان لەبەر ئەکرد، وە بۆ وەرگرتنی زانست کۆچی کردووە بۆ گەلێك شوێن لەوانە ((ئەحساو، مەککە، مەدینەی مونەوەرە)) وە لە لای زانایانی مەدینە خوێندویەتی لەوانە زانای پایەبەرز عبداللە ی کوڕی ئیبراهیمی شەمەری نەجدی مەدەنی، هەروەکو چۆن لە لای زانای بەناوبانگی زانستی میرات (عبداللە ی کوڕی ئیبراهیمی شەمەری نەجدی مەدەنی) خوێندویەتی کە خاوەنی پەرتوکی ((العَذب الفائض في شرح ألفية الفرائض)) وە بە زانای بەناوبانگ و فەرمودەناس ((موحەمەد

حەیات سندی)) گەیشتووە و ناسیویەتی و زانستی فەرمودەی لا خوێندووە و، زانستی ناسینی پیاوانی ئەو زانستە و مۆڵەتی لە پەرتوکە بنچینەکاندا داوەتیّ، پاشان ڕووە و عێراق ڕۆیشتووە و لای زانایانی شاری بەصرە خوێندویەتی، وە زانای پێشەوا موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب خوای پەروەردگار تێگەیشتنێکی قوڵ و زیرەکیەکی زۆری پیّ بەخشیبوو، وە قوڵ بوبوەوە لە خوێندنەوەو گەڕان و دانانی پەرتوکدا، وە پێشەوا لە کاتی خوێندنەوە و گەڕاندا هەرچییەکی بەرچاو بکەوتایە لای خۆی ئەینوسی نەیئەهێشت بەسەریدا تێپەڕێت و هیچ کات پەست نەئەبوو لە نووسین، وە گەلێك لە پەرتوکەکانی هەردوو زانای شارەزا بە ئیسلام ((ئیبن و تەیمییە و ئیبن القیم))ی دەسنوس نووسیوەتەوە. ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت، وە هەتا ئێستاش گەلێك لە دەسنووسە گران بەهاو بەنرخەکان کە بە پێنوسە پڕ برشتەکەی خۆی نووسیویەتی لە مۆزەخانەکاندا هەیە و پارێزراوە.

دانراوەکانی_ پێشەوا زۆرێك دانراوی بەسودی داناوە لەوانە:

١- كتاب التوحيد.

٢- كشف الشبهات.

٣- الأصول الثلاثة.

٤- نواقض الاسلام.

٥- مسائل الجاهلية.

٦- مختصر زاد المعاد.

٧- القواعد الاربع.

٨- مختصر الانصاف و الشرح الكبير.

٩- الكبائر، و جگە لەمانەش.

## تێبینی وەرگێڕ

خوێنـــەرانی ئـــازیز و بـــەڕێز ئاگـــاداربن كـــە زۆرێـــك لـــە پەرتوكـــەكانی پێـــشەوا وەرگێردراوەتـــە ســـەر زمـــانی كـــوردی و لەپەرتوككەكانـــدا دەســـت ئەكـــەون. خـــوای پەروەردگار زیاتر یارمەتیمان بدات بۆ وەرگێڕانی هەرچیەك كە نوسیویەتی لە پەرتوكە بە نرخەكانی.

مردنی– پێشەوامان ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە ساڵی ١٢٠٦ كۆچی لـە تەمـەنی ٩١ ســاڵی دا ئــەمرێت و ئەگەڕێتــەوە بــۆ لای پــەروەردگاری جــارێكی دی، تەمــەنی لــە بانگــەوازكردن بــۆ لای خــوای گــەورە و تێكۆشــان و زانــست و زانیاریــدا بەســەربرد ڕەحمــەتی خــوای لــێ بــێ و ڕازی بــێ لــێ ی و وە لــە فیردەوســدا لــەناو بەهەشــتدا نیشتەجێی بكات.[1]

١) تەماشای پەرتوكی ((علماء الدعوة)) ی عبدالرحمن بن عبداللطیف بن عبدالله بن عبداللطیف ال الشیخ و الامام محمد بن عبدالوهاب دعوتە و سیرتە، زانا و پێشەوا باوكی بانگەوازكاران عبدالعزیز بن باز ڕەحمەتی خوای لێ بێت بكەن.

## وانەی یەکەم

لە ڕونکردنەوەی پێشەکیەکی بەسوددا بە ویستی خوا لەپێش دەستکردن بە ڕاڤەی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام. سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری هەموو جیهان، وە سڵاو و درودی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەرمان موحەمەد ﷺ وە لەسەر بنەماڵە و کەس و کار و خزمە نزیکەکانی و هاوەڵانی بێت.

پاشان(النواقض) هەڵوەشێنەرەوەکان کۆی (ناقض) ە واتە هەڵوەشێنەر کە (اسم فاعل) ناوی بکەرە لە (نقض) ەوە هاتووە واتە هەڵوەشاندن، لە کاتێکدا کە شتێك هەڵئەوەشێ و شی ئەبێتەوە و ئەڕوخێت و خراپ ئەبێت، خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا﴾[1]

واتە: (سوێند و بەڵێن و پەیمانەکانتان هەڵمەوەشێننەوە لە دوای ئەوەی لێبڕاون بۆی و دڵنیابوون لێی).

وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتۡ غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا﴾[2]

واتە: ( ئێوە وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کە لەدوای ڕێسانی خوریەکەی و بەهێزبوونی ڕێسراوەکەی هەڵیئەوەشاندەوە و خاوی ئەکردەوە).

---

[1] النحل: ٩١

[2] النحل: ٩٢

وە ((الاسلام)) بریتی یە لە خۆ بەدەستەوە دان و خۆ تەسلیم کردن بۆ خوای گەورە، بە تاك پەرستنی و ملکەچکردن بۆی و گوێڕایەڵی کردنی، وە دوورە پەرێزی لە هاوبەش بڕیاردان و ئەوانەی هاوبەش بڕیار ئەدەن ئەوە پێناسەی ئیسلامە.

وە ((أسلم )) ماناکەی خۆی بەدەستەوەدا کە بریتی یە لە خۆبەدەستەوەدانی تەواو بە خوای گەورە و بەرزو بە تاك پەرستنی و نیازپاکی لە پەرستش کردن بۆی و ئەنجام نەدانی بۆ جگە لەو.

وە هەر کەسێك خۆی تەسلیمی خوا نەکات واتە خۆی نەدات بە دەستەوە ئەوە خۆ بە زل زانە، وە هەرکەسێکیش خۆی تەسلیمی خودا و جگە لە خوداش بکات ئەوە هاوبەش بڕیاردەرە((پەنا بە خوا)) وە هەر کەسێکیش بە تەواوی خۆی تەسلیمی خوا بکات ئەوە یەکخواپەرستە.

وە هەر لەبەرئەوەش فەرموی ((بریتیە لە خۆ بەدەستەوە دانی تەواوی بەخواو بە تاك پەرستنی)) وە یەکتاپەرستیش بریتی یە لە بەتاك دانانی خوای بەرز و بڵند لە پەرستش کردن بۆیدا، بەوەی کە پەرستراو تاك و تەنها بێت کە خوای باڵا دەستە نەك پەرستراو چەندین خودای جیاواز و جۆراوجۆر بێت. ئەو پەرستراوە تاکە (الله) یە، وەك خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١﴾[1]

واتە: (فەرمانیان پێنەکرابوو جگە لەوەی تاکە پەرستراوێك بپەرستن، هیچ خودایەك نیە شایەنی پەرستن بێت بە حەق جگە لەو، پاکوبێگەردی بۆ ئەو خودایە لەوەی کە هاوبەشی بۆ بڕیار ئەدەن).

---

[1] التوبة: ٣١

وه هـــەروەها ئەفـــەرموێت: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾[1]

واته: (هیچ فەرمانێکیان پێنەکرابوو جگە لەوە نەبێت کە پەرستش بۆ خوای گـەورە بکەن و بەڕاستی و نیازپـاکی دینـداری بـۆ ئـەو بکـەن، وە لـە هـەموو دیـن و ڕێـچکە و ڕێبازێکی دی لادەن بۆ تاکە ڕێگە و ڕێبازی ئیسلام، وە بە جوانترین شێوە هەسـتن بـە ئەنجامدانی نوێژەکانیان، وە زەکاتی ماڵ و موڵك و سـامانیان بـدەن، وە هـەر ئـەوەش ئاینی پاك و بێگەردو ڕاستەقینەی خوای گەورەیە) ئا ئەوە ئاینی پـیرۆزی ئیـسلامە وە هەر ئەویشە دینی ڕاستەقینە و پتەو جێگیر وەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾[2]

واته: ( هەرچـی فـەرمانو دەسـتەڵاتێك هەیـە تـەنها دەسـتەڵاتی خوایـە، فـەرمانی کردووە کە جگە لەو نەپەرستریت، ئەوە دینی پتەو و جێگیرە، بەڵام زۆرینـەی خـەڵکی نازانن و تێ ناگەن) ئەوە دینی پاکی ئیسلامە.

وە بەڵام ووتەی ((ملکەچی کردن و گوێڕایـەڵی کردنـی )) بـە واتـای ئـەوە دێـت کـە لەگەڵ یەکتاپەرستیدا ملکەچ ئەکرێت بۆ فەرمانەکانی خـوای بـەرز و بڵنـد، جـێ بـەجێ شی ئەکات، وە وازیش لەو شتانە ئەهێنێت کـە خـوا قەدەغـەی کـردووە و لێـشی دوور ئەکەوێتـەوە، وە گوێڕایـەڵی هەریەکـە لـە کردنـی فـەرمان پێکراوەکـان و وازهێنـان لـە

[1] البینة: ٥

[2] یوسف: ٤٠

قەدەغەکراوەکان ئەگرێتەوە، وە بیروباوەڕی یەکتاپەرستیەتی بەس نیە بە بێ کردنی کردار لەگەڵیدا.وە ((دووره پەرێزی لە هاوبەش بڕیاردان و ئەوانەشی هاوبەش بڕیار ئەدەن بۆ خوای گەورە)) وە بەس نیە بۆ مرۆڤ کە هیچی دی نەپەرستێ تەنها خوا نەبێت بەڵکو ئەبێت پشت هەڵکات و دووره پەرێز بێت لە هاوبەش بڕیاردان و ئەوانەشی هەڵئەسن پێی، وە بیروباوەڕی بە پوچیەتیان هەبێت و هاوبەش پەیداکەرانیش بە بێباوەڕ بزانێت، وە ڕقی لێیان بێت و دوژمنایەتیان بکات لەبەر خوای بەرز و بەڕێز، وە پێویستە لەسەرت دوژمنانی خوات ڕق لێ بێت و وە دۆستانی خواشت خۆش بوێت، وە خۆشت بوێت ئەوەی خوا خۆشیەوێ و خوای خۆشەوێ وە ڕقیشت لە هەر شتێ بێت خوا ڕقی لێیەتی و ئەشبێتە هۆی ڕق لێ بونی خوا، ئەوە مانای گوتەی ((دوره پەرێزیە لە هاوبەش بڕیاردان و ئەوانەشی هاوبەش بڕیار ئەدەن)) هەر وەکو چۆن ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت و ئەوانەشی لەگەڵی بوون پشتیان لە هاوبەش پەیداکەران کرد، هەروەکو خوا خۆی ئەفەرموێت: ﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ﴾ [1]

واتە (( بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە پێغەمبەران نمونەیەکی چاکتان بۆ باسکراوە کاتێك کە بە گەلەکەی خۆیانیان ووت ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەشی کە جگە لە خوای گەورە ئەیپەرستن))پشتیان هەڵکرد لە خۆیان و پەرستراوەکانیشیان.

---

[1] الممتحنة: ٤

پاشان ئەفەرموێت: ﴿كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ﴾[1] هەمان ئایەت.

واتە: (بێ باوەڕین بەرامبەر ئێوە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقبەرایەتی لە نێوانماندا بۆ هەمیشەیی بەرپا بوو تا باوەڕ بە خودای تاك و تەنها ئەهێنن).

هـــەروەها ئەفـــەرموێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾[2]

واتە: ( هیچ کۆمەڵێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەکەن، هەرچەندە ئەوانە باوکیان یان کوڕ و نەوەیان یان براو عەشیرەتیان بن، بە کورتی مرۆڤی باوەڕدار نابێ بە هیچ شێوەیەك دۆستایەتی بکا لەگەڵ دوژمنانی خوا و پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم ئەگینا لەوان ئەژمێردرێت).

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾[3]

واتە: ( ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە باو باپیرانتان و براکانتان مەکەن بە دۆست و پشتیوانی خۆتان ئەگەر ئەوان بێ باوەڕییان خۆشویست و دایان بەسەر ئیماندا، جا هەر کەسێك لە ئێوە ئەوانە بکەنە دۆست و پشتیوان ئا ئەوانە ستەمکارن).

---

[1] الممتحنة: ٤

[2] المجادلة: ٢٢

[3] التوبة: ٢٣

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾[1]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەگرن بە دۆست و پشتیان پێ بەستن)، ئا ئەوە ئەو یەکتاپەرستیەیە کە خوای بەرز و بڵند فەرمان ئەکات بە دۆستایەتی کردنی یەکتاپەرستان وە فەرمان ئەکات بە دژایەتی کردن و دوورە پەرێزی و پشت تێکردنی هاوبەش بڕیاردان و ئەوانەشی هەڵئەستن بە ئەنجامدانی لەبەرئەوەی یەکتاپەرستیەکە هەڵئەوەشێتەوە.

وە ئیسلامیش کۆمەڵێ هەڵوەشێنەرەوەی هەیە، بە دڵنیاییەوە مرۆڤ ئەچێتە ناو بازنەی ئیسلامەوە بەڵام کۆمەڵێ شت ئەکات کە دەری ئەکات لەو چوارچێوەی کە ئیسلام دیاری کردووە جا بزانێ یان نەزانی، جا بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ لەو هەڵوەشێنەرەوانە بزانێ.

وە ئەوە پێغەمبەر ئیبراهیمە سەلامی خوای لێ بێت ترساوە لەخۆی لەوەی کە تووشی هاوبەش بڕیاردان بێت، لەگەڵ ئەوەش ئەو بوو کە بتەکانی شکاند و لە پێناوی خوای گەورەدا سزا دراوە لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیا نەبوو لەخۆی و بێ خەم نەبوو لە باوەڕەکەی وەکو فەرمویەتی: ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ﴾[2].

واتە: (ئیبراهیم داوا لە خوا ئەکات و ئەپاڕێتەوە و ئەفەرموێت خودایە خۆم و کوڕو نەوەکانم دوور خەیت لەوەی کە بت بپەرستین، پەروەردگار ئەو بتانە زۆرێك لە خەڵکیان سەر لێشێواو کردووە).

---

[1] الممتحنة: ١

[2] إبراهيم: ٣٥ – ٣٦

لەکاتێکدا کەبینی ئەو هەموو هاوبەش دانانەو ئەو خەڵکە زۆرەی کەهەڵخەڵەتاوە بەهاوبەش دانان بۆخوا لەخۆی ترسا کەئەویش تووشی ببێت، وەمرۆڤیش وەکو زانراوە ئادەمیزادە، وە ئادەمیزادیشن کەوتونەتە ناو ئەو هاوبەش دانانەوە، وە ئادەمیزادیش خۆی بەبێ تاوان نازانێ وەلەئاینەکەشی دڵیانابێت بەڵکو لەسەریەتی بترسێ لەئاینەکەی کەتوشی هاوەڵ دانان بێت زۆر لەوەزیاتر کەلاشەی تووشی شتێك ببێت یان ماڵەکەی یان ئەو شتانەی هی ئەوە تیابچێت﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ ﴾[1].

وە ئەم بابەتە ((هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام)) زانایان لە کۆن و ئێستاشدا گرنگیەکی زۆریان پێداوە، وە ئەوەش جێگەی گرنگی پێدانی زانایان بووە بۆیە چەندین پەرتوکیان لەو بوارەدا داناوە بە شێوەیەکی تایبەت و سەربەخۆ، وە هەروەها بەشێکی تایبەتیان لە پەرتوکەکانی شەریعەتدا داناوە و ناویان ناوە((حوکمی ئەوانەی کە هەڵئەگەڕێنەوە لە ئیسلام)) وە لە ژێر ئەو بەشەشدا باسیان لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام کردووە. وە حوکمی کەسێك کە بکەوێتە یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکان چییەباسیان کردووە، وە هەروەها باسی جۆرەها هەڵوەشێنەریان کردووە کە هەر نایە بە خەیاڵی مرۆڤدا بەڵام زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت باسیان کردووە و ژماردویانە و ڕونیان کردۆتەوە و حوکمی کەسێکیش کە بکەوێتە یەکێك لەوانەوە. چونکە ئاین یەکەمین شتە لە پێنج پێویستیە بنچینەیەکە پێویستە پارێزگاریان لێ بکرێت، وە پارێزگاری لە ((دین)) ئەکرێت و پێویستیشە حوکمی خوای

---

[1] إبراهیم: ٣٥ – ٣٦

پـەروەردگار لەسـەر ئـەو كەسـانە جـێ بـەجێ بكرێـت لـە ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام هەڵئەگەڕێنەوە و لێی دەرئەچن، پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە ئەفەرموێت ((مَنْ بَدَّلَ دِينَـهُ فَاقْتُلُوهُ))[١] واتە: ((هەركەسێك دینەكەی گۆڕی بیكوژن))

<u>تێبینی وەرگێڕ</u> (( جـێ بـەجێ كردنـی ئـەو حوكمـە پێویسـتە لەلایـەن كاربەسـتانی موسڵمانانەوە جێ بەجێ بكرێت نەك هەر كەسێك بە بۆچونی خۆی كەسێكی بینـی كـە پێ ی وایە بێ باوەڕبووە بیكوژێت چونكە ئەگەر وابێـت ئاژاوەیـەكی زۆر ئەكەوێتـە نـاو خەڵكەوە و خوێنێكی زۆر ئەڕژێت بە ناحەق خوا بمان پارێزێت لە كەوتنە ناو ئاشوبەوە بە گومانی خراپی خۆمان و بمانگێڕێ لەو كەسانەی گوێڕایەڵێن ئامین))

وە ئەفەرموێت: ((لاَ يَحِلُّ دَمُ إمرِيء مسلمٍ إلاَّ بِإِحْدَى ثَلاثٍ: الـنَّفْسُ بِـالنَّفْسِ، وَالثَّيِّـبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ))[٢]

واتە (( ڕشتنی خوێنی موسڵمان حەڵاڵ نیە برێژرێ جگـە لـە سـێ شـتدا نـەبێت كـە ئـەنجامی ئـەدات ئـەوانیش كوشـتنی كەسـێك كـە كەسـێكی بـە ناحـەق كوشـتبێت، وە كەسێك كە ژنی هێنابێت یان شوی كردبێت و زینای كردبێت ئەوا لەو كاتەدا ئەكوژرێت، وە ئەوەی كە لە ئاینەكـەی هەڵگەڕێتـەوە و واز لـە كۆمـەڵی موسـوڵمانان بێنێـت )) وە ئەوەی ئێمە مەبەستمانە سێهەمیانە كـە لـە دینەكـەی هەڵگەڕێتـەوە و واز لـە كۆمـەڵی موسڵمانان بێنێت.

---

[١]) اخرجه البخاری ٣٠١٧، و النسائی ٤٠٥٩، و الترمذی ١٤٥٨، و احمد فی مسنده ١٨٧١ من حديث عبدالله بن عباس رضی الله عنهما.

[٢]) اخرجه البخاری ٦٨٧٨، و مسلم١٦٧٦، وابو داود ٤٣٥٢، و الترمذی ١٤٠٢، و النسائی ٤٠١٦، و إبن ماجه ٢٥٣٤ من حديث عبدالله بن مسعود رضی الله عنه.

دووەم لە پێویستیەکان کە ئاینی ئیسلام پارێزگاری لێ ئەکات نەفسە: وە هەر لەبەرئەوەشە خوای پەروەردگار تۆڵەی داناوە بۆ کەسێك کە نەفسێك بکوژێت بە ناحەق، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ﴾[1]

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە تۆڵە سەندنەوەتان لەسەر پێویست کراوە لە کوژراواندا).

تا ئەو جێگەیەی کە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٧٩ ﴾[2]

واتە: ( ئەی ئەوانەی ژیرو تێگەیشتوون لە تۆڵە سەندنەوەدا ژیان هەیە چونکە کەس ناتوانێ دەست درێژی بکاتە سەر کەسێکی ترو بیکوژێ ئەکوژرێتەوە لەبەرئەوە پارێزگاری لەمانەوەی ژیان ئەکرێت بە تۆڵە تا بەهۆیەوە خۆپارێزی بکەن و لە خوا بترسن).

وە خوای پەروەردگار فەرمانی بە پاراستنی نەفسی باوەڕدار کردووە، وە هەر لەبەر ئەوەشە یاسای تۆڵەسەندنەوەی داناوە تا پارێزی لە نەفسەکان بکرێت لەوەی دەست درێژیان بکرێتە سەر﴿ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ ﴾ لەبەرئەوەی تۆڵە سەندنەوە ئەگەر چی کوژرانی تاوانبارەکەی لێ ئەکەوێتەوە بەڵام ئەبێتە هۆی ژیان بۆ خەڵکی،

[1] البقرة: ١٧٨
[2] البقرة: ١٧٩

لەبەرئەوەی ڕێگری ئەكات لە كوشتن و خەڵكی دڵنیا ئەكات لە خوێنیان، جا ئەگەر زانی كابرای بكوژ یان ئەوەی ئەیەوێ بكوژێ ئەكوژرێتەوە ئەوا دەست لە كوشتن هەڵئەگرێت و خۆی و ئەوەشی ویستی بیكوژێ ئەپارێزرێ و ڕزگاری ئەكات وە هەر بەهۆی ئەوەشەوەیە كە خوێنڕێژی ڕوونادات و پارێزگاری لە ژیان ئەكرێت.

سێ یەم لە پێنج پێویستیەكە ((ژیرییە)):

خوای بەرز و بڵند مرۆڤی دروستكردووە و جیای كردۆتەوە لە دروستكراوەكانی دی لەبەرئەوەی ژیری پێ بەخشیوە تا بە هۆیەوە بتوانێت باش و خراپ و پاك و پیس و بێ باوەڕی و ئیمان و باوەڕ لە یەك جیا بكاتەوە هەروەكو ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾[1].

واتە: (بە دڵنیاییەوە ڕێزێكی زۆرمان لە نەوەكانی باوكە ئادەم گرتووە بەوەی ژیریمان پێبەخشیوەو هەڵمانگرتوون لە وشكانی و دەریا بەوەی توانیویانە هۆكارەكانی ژیان بۆ خۆیان دروست بكەن).

وە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٖ ۝٤﴾[2]

واتە: ( بێ هیچ گومانێك مرۆڤمان لەسەر جوانترین شێوە دروست كردووە و بەدیهێناوە).

خوای بەرز و باڵا مرۆڤی بەو ژیریە جیاكردۆتەوە جا ئەگەر مرۆڤێك تاوانێكی ئەنجام دا بەرامبەر ژیریەكەی بەوەی شتێكی سەرخۆشكەر و بێ هۆشی بداتێ و سەرخۆش و

---

١ الإسراء: ٧٠
٢ التين: ٤

بێ ئاگای بکات ئەوا خوای گەورە بە پێویستی داناوە کە سزای لەسەر جێ بەجێ بکرێت تا ژیریەکان بپارێزێت و یاری پێ نەکرێت.

چوارەم لەو پێنج پێویستیەی کە ئەبێت بپارێزرێت ((پاراستنی ماڵە)) لەبەرئەوەی خەڵکی ناگونجێ ماڵیان نەبێت چونکە بەهۆی ئەو ماڵەوە هەرچی بەرژەوەندیەکیان هەیە پێ ی ئەنجام ئەدەن، ماڵ هەروەکو ئەڵێن ڕەگی ژیانە، خوای پەروەردگاریش ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا ﴾[1]

واتە: ( ماڵ و سامانەکانتان مەدەنە کەسی نەزان و نەفام و دەست بڵاو ئەو هەتیوانەی کە نازانن چۆن خەرج ئەکەن تا گەورە ئەبن چونکە ئەو ماڵ و سامانە هۆکارە بۆ گەشەی ژیان و گوزەرانتان، بە کورتی واتە ماڵ و موڵك و سامانتان بە فیڕۆ مەدەن ).

جا هەر کەسێ دەست درێژی بکاتە سەر ماڵی خەڵکی بە دزین ئەوا ئەبێت دەستی ببڕدرێت تا خەڵکی دڵنیابن لەسەر ماڵ و سامانیان.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٣٨) ﴾[2]

واتە: (دەستی پیاو و ژنی دز ببڕن سزایەك بۆ ئەو کارە خراپەیان کە ئەنجامیانداوە، وە پەندێکیش بێت لەلایەن خوای گەورەوە، وە خوایش زۆر بە دەستەڵات و بە توانا و کارزان و کاربەجێ یە).

---

[1] النساء: ٥

[2] المائدة: ٣٨

جا ئەگەر دەستی یەکێك بڕدرا ئەوا ماڵی خەڵکی ئەپارێزرێت، وە هەر لەبەرئەوەشە ئەبینین ئەو وڵاتانەی سزای تاوانەکانی تیادا جێ بەجێ ئەکرێت وڵاتانێکی هێمن و ئارام و دڵنیان لە دینیان و گیانیان و ماڵیان و ناموسیان وە لە کاتێکدا ئەو وڵاتانەی کە ئەو سزایانەی تیادا جێ بەجێ ناکرێت پڕ لە ئاژاوە و پێکدادان و ترس و دڵە راوکێیە هەروەکو ئاشکراو زانراوە.

پێنجەم پێویستی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام پارێزگاری لێ ئەکات ((پاراستنی ڕەچەڵەك و ئابڕو ناموسە))

وە ئەوەش بە قەدەغەکردنی داوێن پیسی ئەبێ وە جێ بەجێ کردنی سزا بەسەر داوێن پیسدا بەوەی سەد داری لێ بدرێت ئەگەر شوی نەکردبێت یان ژنی نەهێنابێت وە بەردباران بکرێت بەبەرد هەتا ئەمرێت ئەگەر شوی کردبێ یان ژنی هێنا بێ، لەبەر پاراستنی ڕەچەڵەك لە تێکەڵاوبون بەوەی کەس نەزانێ باوك و دایکی کامەیە، جا ئەگەر سزای خوای پەروەردگار جێ بەجێ کرا بەسەر داوێن پیساندا لە نێرومێ ئەوا ڕەچەڵکی خەڵکی ئەپارێزرێت. بەڵام ئەگەر جێ بەجێ کردنی سزا کە پەکخرا بەسەریاندا ئەوا ڕەچەڵەك تێکەڵاو ئەبێت، تاوای لێ دێت کە کەس نازانێ نەوە و وەچەو باو باپیرانی کامەیە چونکە بەهۆی داوێن پیسیەوە ڕەچەڵەکەکان تێکەڵاوبوون، چونکە ئافرەتی داوێن پیس کۆمەڵێکی زۆر پیاوی هاوشێوەی خۆی داوێن پیسی لەگەڵدا ئەکەن جا نازانێ لە کامیان سکی پڕبووە، لەبەرئەوەشە ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی وون ئەبێت کە خوای پەروەردگار گێڕاویەتی بە جیاکەرەوەی نێوان خەڵکی تا هەموو کەسێك بزانێ کە ئەو کێیە واتە بزانێ کامە باوکیەتی و دایکیەتی و نەوەکانیان کامانەن.

وە لەسەر ئەو جیاکردنەوەیە یاسا شەرعیەکان بنیاد ئەنرێت وەکو زانینی کەسەکانی دەوروپشت کە بەیەك ناشێن بۆ ژن و ژنخوازی، وە میراتگرتن لە یەکتری وە جگە لەمانەش لەیاسا شەرعیەکان کە پەیوەندیان بە ڕەچەڵەکەوە هەیە و ناسینی خەڵکی لەنێو خۆیاندا بۆ یەکتری بەوەی ئەزانێ کە ئەوە باوکیەتی و ئەوە برایەتی و ئەوە مامیەتی و ئەوە خاڵیەتی، بەو ناسینەوەیە پەیوەندی نێوان خەڵکی ڕووئەدات وە ئەوەش پاراستنی ڕەچەڵەکە.

وە هەرچی پاراستنی ئابڕو ناموسیشە ئەوە بەوە دێتە جێ کە سزای خوا جێ بەجێ بکرێت بەسەر ئەوانەدا کە بوختانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ موسڵمانان، وە ئەو کەسەی بوختانی خەڵك ئەکات بە کاری بەدڕەوشتی و ئەڵێت ((فڵانەکەس داوێن پیسە، فڵانە کەس کاری گەلی لوطی ئەنجام داوە)) فەلاقە و دارکاری ئەکرێت لە دوای ئەوەی کە داوای لێ ئەکرێت پاش تۆمەتبارکردنی کەسێك بەو کارانە کە چوار شاهیدی هەبێ و بیانهێنێ و شاهیدی بۆ بدەن کە ئەم کەسەڕاست ئەکات وە ئەگەرنا ئەوا فەلاقە ئەکرێ لە هەقی ئەو تاوانەی بەرامبەر خەڵکی ئەنجامی داوە، وە دادپەروەریشی نامێنێ لەناو موسڵماناندا بەوەی کەس متمانەی پێ ناکات لەڕووی ناموسەوە وە ئەبێتە کەسێکی لە یاسا دەرچووش، خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾ ﴾[1]

واتە: ( ئەو کەسانەی کە ژنانی داوێن پاك یان پیاوانی داوێن پاك تۆمەتبار ئەکەن بە زیناو داوێن پیسی و پاشانیش چوار شایەت ناهێنن بۆ چەسپاندنی داواکەیان ئەبێت ئەوانە هەشتا شەلاقیان لێ بدەن تا جارێکی تر لە ناحەق و ناڕەوا ناموسی خەڵکی لە

---

[1] النور: ٤ – ٥

کەدار و بریندار نەکەن، وە هەتا هەتاشە نابێ شایەتیان بۆ شتی تر لێوەربگیرێ، ئا ئەوانە لە سنور دەرچوانن، مەگەر ئەوانەی دوای ئەو کارە دزێو و ناشرینە پەشیمان ئەبنەوە و کردەوەشیان چاك ئەکەنەوە و جارێکی تریش ناگەڕێنەوە بۆ ئەوە کارە، ئەوە بێ گومان خوا بۆ ئەو جۆرە کەسانە زۆر لێبوردەیەو میهرەبانە).

ئەمە ئەو پێنج پێویستیەیە کە خوای گەورە فەرمانی پارێزگاری کردنیان کردووە و سزای بۆ پێشێلکارانیان داناوە، وە یەکەمینیان پاراستنی ئاینە، پاراستنی ئاینیش بەوە ئەبێت کە دوور بکەوێتەوە لەو هەڵوەشێنەرەوانەی کە ئەم دینەی پێ هەڵ ئەوەشێتەوە و هەڵگەڕانەوەی پێ ڕوو ئەدات وە ئەو هەڵگەڕانەوەیەش ئەبێتە هۆی کوشتنی هەڵگەڕاوەکە.

وە پاشگەزبونەوە و هەڵگەڕانەوەش بریتیە لە گەڕانەوە، وە کەسی هەڵگەڕاوە ئەو کەسەیە کە لە دینەکەی ئەگەڕێتەوە و پاشگەز ئەبێتەوە یان بە گفتاری یان بە بیروباوەڕی یان بە کرداری یان بە گومان بردن.

<u>ئەمەیە بنچینەی جۆرەکانی پاشگەزبونەوە</u>: ( گفتار و بیروباوەڕ و کردار و گومان بردن). وە لەم جۆرانەوە کە بنچینەی هەڵگەڕانەوەن جۆرەهای تری لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی لێ ئەکەوێتەوە، وە هەندێ لە نەزان و قین لە دڵەکان قسەکردن لەبارەی هۆکارەکانی پاشگەزبونەوە لە ئیسلام بە باش نازانن و پەرچی ئەکەنەوە، وە هەر کەسێکیش قسە لەو بارەیەوە بکات ئەوا تۆمەتی تەکفیری ئەدەنە پاڵ و خەڵکیان لێ هۆشدار و ئاگادار ئەکەنەوە.

وە <u>پاشگەزبونەوە بە گوفتار و قسە</u> ئەوەیە کە کەسەکە قسەی بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردان دەربەبڕێت بەبێ ئەوەی هیچ زۆرێکی لێ کرابێت، ئیتر ئەو کەسە

بەڕاستی بێت یان بە گاڵتەوە بیڵێت یان هەر بۆ خۆشی و کۆڕگەرمکردن دەریبڕێ، جا ئەگەر قسەی کرد و قسەکەی بێ باوەڕی بوو ئەوا حوکمی هەڵگەڕاوەی بەسەردا ئەدرێت جگە لە کەسێك نەبێت کە زۆری لێکرا بێت بۆ وتنی ئەو قسە کوفر و بێ باوەڕیە هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ ﴾[1]

واتە: (بە دڵنیاییەوە لەدوای ئەوەی موسڵمان ببوون قسەی بێ باوەڕیان گوتووە گەڕانەوە سەر بێ باوەڕیەکەی خۆیان واتە بەو قسەیە پاشگەزبونەوە).

وە خوای پەروەردگار دەربارەی ئەوانەی وتیان نەمان بینیووە وێنەی هاوەڵەکانی محمد ﷺ درۆزنترین زمان و کەسانێك کە هەر تەنها مەبەستیان سکیان بێت و زۆریش ترسنۆك بن لە کاتی گەیشتن بە دوژمن مەبەستیان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی بوو ئەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾[2]

واتە: (ئەگەر لێیان بپرسیت سەبارەت بە گاڵتەکردن بەخوا وئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەڵێن بە ڕاستمان نەبووە و بەڵکو تەنها گاڵتە و گەپمان ئەکرد، پێیان بڵێ ئایە گاڵتەتان بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی کردبوو ﷺ، بڕ و بیانو مەهێننەوە چونکە پاش ئەوەی کە باوەڕتان هێنا بوو پاشگەزبوونەوە).

١ التوبة: ٧٤
٢ التوبة: ٦٥ – ٦٦

ئەوانە بێ باوەڕبوون لەدوای ئەوەی کە باوەڕیان هێنابوو بەهۆی ئەوەی کە وتیان ئەمان بینیوە وێنەی ئەوانە کە هەمیشە بە شوێن سکیاندا بگەڕێن و هەمیشە زمانیان بۆ درۆکردن بەکاربهێنن و زۆریش ترسنۆك بن لە کاتی گەیشتن بە دوژمن مەبەستیان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت بوو، لە کاتێکیشدا زانیان کە خوای گەورە لە ڕێگەی سروشەوە (وەحی) پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگادارکردۆتەوە لە قسەکەیان هاتن و پۆزشیان ئەهێنایەوە و ئەیان وت ئێمە تەنها مەبەستمان گاڵتە و گەپ بوو هیچی تر، قسەمان ئەکرد قسەی سواری تا ڕێگەکەی پێ ببڕین و تەواوی بکەین، وە پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی نەئەدایەوە بە لایاندا و زیاتری نە ئەفەرموو جگە لەو ئایەتەی کە ئەیخوێندەوە: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ [١] - [٢]

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێك قسەی بێ باوەڕی دەربڕێت بەبێ ئەوەی هیچ زۆرییەکی لێکرا بێت بێ باوەڕ ئەبێت باواش بزانێت کە ئەو لە قسەیەیدا مەبەستی گاڵتە و گەپ بووە هیچی دی، وە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر مورجیئەی ئەم سەردەمە ئەوانەی کە ئەڵێن مرۆڤ هەڵناگەڕێتەوە با قسەی بێ باوەڕیشی گووتبێ هەتا دڵی باوەڕی بەوە نەبێت کە زمانی ووتویەتی.

---

١ التوبة: ٦٥ – ٦٦.

٢ أخرجَهُ هذهِ القصة إبن أبي حاتم (١٠٠٤٦)، و إبن جرير في تفسيرِه (١/ ١٩٥ – ١٩٦) خرجَها من طرقٍ موصولةً و مرسلةٍ يقوي بَعضُها بعضاً. وحسنها الوادعي في الصحيح المسند من أسباب النزول (ص٧٧) وانضُرْ: تسعَ فوائد عَظيمةً و مُهِمَة من هذهِ القصة ذكرها شيخنا العلامة الفوزان في كتابهِ ((إعانة المستفيد شرح كتاب التوحيد)) (٢/ ١٩٠ – ١٩٢).

((واتە هەر کەسێك قسەی بێ باوەڕیش بکات جنێو بدات بە خوا و بە قورئان و بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بێ باوەڕ نابێت چونکە لە دڵدا ئەوانەی خۆش ئەوێت جا ئەم جۆرە قسانە لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر ئەکرێت و کۆلکە خوێندەواریش پۆزشیان بۆ ئەهێننەوە بەوەی کە ئەمانە موسڵمانن نە بەخوا موسڵمان نین و بێ باوەڕن تا نەگەڕێنەوە لەو تاوانەی کە ئەنجامیان داوە پەنا ئەگرین بەخوا..وەرگێڕ))

وە هەروەها ئەو کەسەشی هاوار ئەکاتە جگە لە خواو لێ ی ئەپاڕێتەوە و داوای فریادڕەسی لێئەکات وەك کەسێك بە مردویەك بڵێت ئەی فلانە مردوو فریادم کەوە، ئەی فلان ڕزگارم کە، هاوار ئەکاتە مردووەکان و لە گۆڕنراوەکان، یان هاوار ئەکات شەیتانەکان و جنۆکەکان، یان هاوار ئەکاتە نادیاران و داوای فریاکەوتنیان لێ ئەکات، ئەگەر هاواری کردە جگە لە خوا و داوای یارمەتی لێ کرد هاواری کردە مردووان و نادیاران ئەوا بەوە بێ باوەڕ ئەبێت، جا هەر کەسێك قسەی بێ باوەڕی کرد ئەوە بێ باوەڕە مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێت ئەوە پێی بێ باوەڕ نابێت وەکو خوای پاك و بێ گەرد ئەفەرموێت: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾[1].

واتە: ( هەر کەسێك پاش بڕوا هێنانی بە خوا بێ باوەڕ بێتەوە مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێ دڵەکەشی دڵنیا بێت بە باوەڕەکەی، بەڵام کەسێك بە خۆشحاڵیەوە سنگی بۆ بێ باوەڕی بکاتەوە بێ هیچ ڕێگری و زۆر لێکردنێك ئەوە تووڕەیی خوایان لەسە

---

[1] النحل: ١٠٦ – ١٠٧

ئـەبێتو سـزایەکی زۆر گەورەشـیان لـە ڕۆژی دوایـدا بـۆ هەیـە، چـونکە ئـەوان ژیـان و گوزەرانی ئەم دونیایـەیان هەڵبـژارد بەسـەر پاشـەڕۆژ و ڕۆژی دواییـدا، وە هەڵبـژاردنی دونیا بەسەر پاشەڕۆژدا کافر بوونە، وە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە کەسانی بێ باوەڕو شارەزا و زۆر لێ نەکراو ڕێنموی ناکات بۆ سەر ڕێگای ڕاست).

وە هـەروەها ئەفـەرموێت: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ﴾ [١]

واتە: (نابێ باوەڕداران جگە لە باوەڕداران کەس بگـرن بـە دۆسـت و یارمـەتی دەرو پشتو پەنای خۆیان و هەر کەسێکیش وا بکـات واتـە بـێ بـاوەڕان بکـات بـە دۆسـت و پشتیوان ئەوا هیچ بەشێکی پەیوەندی ئیمان و باوەڕی بە خـواوە نییـە، مەگـەر لێیـان بترسـن و بتانـەوێ لەشـەڕیان خۆتـان بپـارێزن، هـەروەکو چـۆن پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ هۆزی خوزاعەدا پەیمانی بەست لەگەڵ ئەوەشدا هاوبەش بڕیار دەر بوون).

ئەوەیە زۆر لێکـردن و زۆر لێکـراو، جـا ئەگـەر مـرۆڤ قسەی بـێ بـاوەڕی دەربـڕی و ناچارکرا بەوەی ئەو قسانە بکات یان ئەکوژرێت و سزا ئەدرێت ئەوە هیچی لەسەر نییـە إنشاءالله کە بیڵێ تا ڕزگـاری ئـەبێت لـەو زۆر لێکردنـە لەگـەڵ دڵنیـابوونی دڵەکـەی بـە باوەڕەکەی، وە لەو کاتەدا تەنها بە زمان ئەیڵێت و بەس، بەڵام دڵ هیچ کـەس نـاتوانێ بزانـێ چـۆن ڕەفتـار و هەڵـسوکەوت ئـەکات جگـە لـە خـوای پـاك و بـێ گـەرد وەکـو ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ [٢]

---

[١] آل عمران: ٢٨

[٢] النحل: ١٠٦

جگە لە کەسێ زۆری لێ بکرێ و دڵەکەی دڵنیا بێت بە باوەڕەکەی. ئەم ئایەتە لەسەر هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ عەماری کوڕی یاسر ڕەزای خوایان لێ بێت دابەزی هاوبەش پەیداکەران سزایان ئەدا و زۆریان لێ کرد بۆ ئەوەی کە جنێو و قسەی ناشرین بڵێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەویش ڕەزای خوای لێ بێت قسەیەکی کرد جنێودانی دەگەیاند بۆ پێغەمبەر ﷺ بەو قسانەی ویستی خۆی دەرباز بکات لە دەستی بێ باوەڕەکان، بەڵام هەرگیز لە دڵیدا قین و ڕق نەبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ وە هەروەها ڕقیشی لە دڵدا نەبوو بەرامبەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەڵکو زۆر دڵی پتەو بوو بە بیروباوەڕەکەی، وە لەکاتێکدا کە ئەو قسەیەشی گوت لە پاشاندا زۆر پەشیمان بویەوەو بە پەشیمانیەوە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە ئەوەی لێ ی بەسەر هاتبوو بۆی باسکرد، ئەویش ﷺ پێ ی فەرموو ((دڵت چۆن ئەبینیت؟)) عەماریش فەرمووی((دڵم زۆر دڵنیا ئەبینم بە باوەڕەکەم کە بەهێزە)) فەرمووی (( ئەگەر هاوبەش بڕیاردەران گەڕانەوە ئازارت بدەنەوە تۆش قسەکە بڵێرەوە چونکە زەرەری نیە لەگەڵ دڵنیابوون لە باوەڕەکەت))[1]

وە پاشگەزبوونەوە و بێ باوەڕی لە بیروباوەڕدا: بریتی یە لەوەی مرۆڤ باوەڕی بە شتێك هەبێت کە ئیسلامی پێ هەڵبوەشێتەوە، هەروەکو چۆن باوەڕی وا بێت کە نوێژ پێویست و فەرز نیە و بایەخ و سەنگی نیە بەڵکو تەنها وەکو خۆ دەربازکردنێك ئەیکات وێنەی ئەوەی دوو ڕووەکانی لەسەر بوون، ئەهات کارەکانی لە ڕوکەشدا ئەکرد بەڵام لە

---

١ أخرجه إبن جرير فی تفسیره (٢١٦/١٤) و إبن أبی حاتم فی الدر المنثور (١٧٠/٥-١٧١)، و خرجه الحافظ إبن حجر فی فتح الباری (٣٢٧/١٢) عند البیهقی و إبن المنذر، و الفاکهی، و عبد بن حمید من طرق مرسلة ثم قال ((و هذه المراسیل تقوی بعضها بعضا)

دڵ... ەڕی پێیان نەبوو، هەر تەنها بۆ ئەوە ئەیکردن تا خۆی دەرخات کە پێ ی بڵێن ئەمیش موسڵمانە وە بە زمان شایەتومانی ئەهێناو دڵی بێ باوەڕ بوو پێی واتە باوەڕی پێ نەبوو، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ۝١ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً﴾[1].

واتە: ( کاتێ دوو ڕووەکان هاتن بۆ لات ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەڵێن شایەتی ئەدەین کە بە ڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت، لە کاتێکدا خوا خۆی ئەزانێ کە تۆ پێغەمبەری خوایت ﷺ وە خوای گەورەش شاهێدی ئەدات کە ئەو دوو ڕووانە درۆ ئەکەن کاتێک کە ئەڵێن تۆ پێغەمبەری خوایت، جا ئەوان سوێندەکەیان کردە قەڵغان بۆ خۆپاراستنی خۆیان لە ئابڕو چون و پارێزگاری کردن لە ماڵ و سامانیان).

واتە باوەڕە درۆینەکەیان ئەکردە پەردە و خۆیانیان پێ ئەشاردەوە کە ئەوان بێ باوەڕن ﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[2] ڕێگریان ئەکرد لە ڕێگەی خوای گەورە وە ئەبونە لەمپەر لەبەردەم بانگەوازدا، وە هەروەها خوای بەرز و بالا ئەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾[3]

واتە: (ئەوەی کە ئەیڵێن بە زمانیان لە دڵیاندا نیە واتە بە زمان ئەڵێن باوەڕمان هێناوە بەڵام لە دڵ و دەرونیاندا هەر بێ باوەڕن).

[1] المنافقون: ١ – ٢

[2] المجادلة: ١٦

[3] الفتح: ١١

جا ئەگەر بە دڵی باوەڕی بە بێ باوەڕی هەبێت بێ باوەڕ ئەبێت جا ئەگەر نەیشیکات و نەیشیڵێ، با لە ڕووکەشدا کردەوەی باشیش بکات وەکو نوێژکردن و تێکۆشان لە پێناوی خوادا و خێرکردن و بەخشین یان قسەی باش بکات وەکو ئەوەی بڵێ ((أشْهَدُ أنْ لاَ إلَهَ إلاَّ اللهُ، وَ أشهدُ أنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله )) ﷺ بەڵام بە دڵەکەی بە درۆی ئەخاتەوە وە ئەوە بێ باوەڕە و ئەوەش ئاینی (المنافقين) دوو ڕووەکانە ئەوانەی ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[1] لە بنی بنەوەی ئاگری دۆزەخدان و وە هەرگیز نابینی پشتیوانیان هەبێت و بتوانێ دەربازیان بکات لە ئاگری دۆزەخ.

لەگەڵ ئەوەشدا نوێژ ئەکەن و ڕۆژو ئەگرن و جیهادیش ئەکەن لەبەرئەوەی بە دڵەکانیان بێ باوەڕ بوون، بوون بە بێ باوەڕ و چوونە ﴿فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[2]

واتە: (لە بنی بنەوەی ئاگری دۆزەخدان و چوونە ناویەوە ).

لەبەرئەوەی کە ئەوان باوەڕیان بەوە نییە کە لە زمانیانەوە دەرئەچێت لە شایەتومان و یان ئەوەی ئەندامەکانی لەشیان ئەیکات لە نوێژ و حەج و زەکاتدان لە کردەوە دروست و ڕێگەدراوەکان.

[1] النساء: ١٤٥

[2] النساء: ١٤٥

وە هەڵگەڕانەوە و بێ باوەڕبوون لە کرداردا: وەکو ئەوەی کە ئەچێت ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا سەر ئەبڕێت، جا ئەگەر ئاژەڵی بۆ جگە لە خوا سەربڕی، ئەوا لە دینی ئیسلام دەرئەچێت و بێ باوەڕ ئەبێت و هەڵ ئەگەڕێتەوە لەبەرئەوەی خۆی بە بەندەی جگە لە خوا ئەزانێ چونکە سەربڕین پەرستشە، ئەگەر سەری بڕێت بۆ شتێك بە گەورەی دائەنێت وەکو بتێك یان گۆڕێك یان جگە لە پەرستراوەکانی هاوبەش پەیداکەرەکان با قسەش نەکات ((واتە با نەشڵێت ئەمەم بۆ تۆ سەربڕیوە وەکو چون بۆ لای گۆڕەکەی و لەوێدا سەریبڕێت.وەرگێڕ))

جا ئەگەر سەربڕی و کڕنوشی برد بۆ گۆڕەکە ئەوەبووە هاوبەش بڕیاردەر با نوێژیش بکات و ڕۆژوش بگرێت و قورئانیش بخوێنێ، چونکە ئەو کەسە دینەکەی هەڵوەشاندەوە بەو کردارە هاوبەش پەیداکەرە خوا پەنامان بدات.

وە بەڵام پاشگەزبونەوە و بێ باوەڕبوون بە گومان بردن: گومان بریتی یە لە دوو دڵی، ئەگەر گومانی هەبوو لە دڵیدا کە ئایە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی ڕاستە یان نا، وە ئایا زیندوبونەوە هەیە یان نا، وە ئایە بەهەشت و دۆزەخ هەیە یان نا، ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕ ئەبێت بە گومانەکەی جا با نوێژیش بکات و ڕۆژویش بگرێت و هەرچی کردەوە یەکیش بکات، ئەگەر بەتەواوی باوەڕی دانەمەزرابێ و گومان و دوو دڵی هەبێت بە ڕاستیەتی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەرانی پێش ئەویش سەلامی خوایان لێ بێت و بڵێت ئەگونجێ ئەوە ڕاست بێت و ئەوەش ڕاست نەبێت، ئەوە بەو قسەیەی هەڵئەگەڕێتەوە لە ئاینی ئیسلام با شایەتومانیش بهێنێ و بڵێ أشهد أن لاالـة إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله ﷺ بێ باوەڕبوون بە واتاکەی، بەڵام ئەبێت ئاگاداربیت ئەوەی لەسەر ئێمە بە بینینی ڕووکەشە و ئەوەشی لەناو دڵدایە لە

دڵنیایی‌و دوودڵی و باوەڕ و بێ باوەڕی ئەوانە هیچ کەس نازانێ جگە لە خوای پاك و بێ گەرد و بەرز و باڵا.

## ئەمانە بنچینەکانی پاشگەزبوونەوەن

١- گوفتاری بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردان بێ هیچ زۆر لێکردنێك.

٢- یان بیروباوەڕی بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردان.

٣- یان کرداری بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردان.

٤- یان گومان لە ئاییندا و ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی.

وە ئەمانەش کۆمەڵێ فەرمان و مەبەستن پێویستە لەسەر موسڵمانان بە گشتی و فێرخوازانی زانستی شەرعی بە تایبەتی کە گرنگی پێ بدەن بەهۆی زۆربونی خراپە و ئاژاوەوە لەم ڕۆژگارەدا، وە لەبەر زۆری گومان دروست کردن لەلایەن بانگەوازکارانی گومڕاو خراپەوە، لەسەر موسڵمانە کە گرنگی بدات بەم کارە و بۆ ئەوەی نەچێتە دەری ئاینەکەی بە ئەنجامدانی شتێك لێیان.

وە خەڵکی دەربارەی ئەم هەڵوەشێنەرەوانە بوونەتە سێ بەشەوە دوو لایەن و دەستەو لایەنێکی نێوەندیش:

## لایەن و دەستەی یەکەم

ئەوانەی کە ڕۆچون لە بە کافردانانـدا وە حوکوم دان لەسەر خەڵکی بە بێ باوەڕبوون، وە خەڵکی بە بێ باوەڕ دا ئەنێن بە بێ هیچ شارەزای و تێگەیشتن و زانیارییەك، وە ئەوەش بەرنامەی ڕێبازی دەرچووانە ((خەوارج)) ئەوانەی کە دەرچون

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وە لەسەردەمی جێنشینە هیدایەت دراوەکاندا وە لەسەردەمە دوایەکانیشدا موسڵمانان بە بێ باوەڕ دائەنێن و ڕۆئەچن لە بێ باوەڕداناندا، جا هەر کەسێك پێچەوانەی ئەوان بێت بە بێ باوەڕی دائەنێن و خوێنی حەڵاڵ ئەکەن، وە دەرچووەکان (خەواریجەکان) سێ ڕێباز و بیروباوەڕیان هەیە:

١- ڕێبازی یەکەم: خەڵکی بە بێ باوەڕ دانان بە ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان کە ناگەنە پلەی هاوبەش بڕیاردان ((وەکو زینا و دزی.. وەرگێڕ)).

٢- ڕێبازی دووەم: دەرچوون لەسەر کاربەدەستانی موسڵمانان و لەتکردنی کۆبونەوە و ڕیزی موسڵمانان و شکاندنی گوێڕایەڵی ((واتە هەرچی کاربەدەستان بیڵێن ئەوان بێ گوێی ئەکەن..وەرگێڕ))

٣- ڕێبازی سێیەم: حەڵاڵکردنی خوێنی موسڵمانان: ((هەروەکو لە عێراق و جەزائیر و پاکستان و صۆماڵ دەیبینین..وەرگێڕ)) وە ئەوەش هۆکارەکەی بەهۆی ئەوەوە بووە کە خەواریجەکان ئەو دەقانەیان وەرگرتووە کە لە ڕووکەشدا بەڵگەیە لەسەر بێ باوەڕی یان بەڵگەیە لەسەر هاوبەش بڕیاردان، وەریان گرتووە تەنها بە ڕوکەشەکەیدا ئیتر نەهاتوون ئەو دەقانە لەگەڵ دەقانێکی تردا کۆبکەنەوە کە ڕاڤەیان ئەکەن و ڕونیان ئەکەنەوە، چونکە بێ باوەڕی دابەش ئەبێت بۆ دوو بەش:

١- بێ باوەڕی گەورە.

٢- بێ باوەڕی بچوك.

وە هەروەها هاوبەش بڕیاردانیش دابەش ئەبێت بۆ دوو بەش:

١- هاوبەش بڕیاردانی گەورە.

٢- هاوبەش بڕیاردانی بچووك.

هاوبەش بڕیاردانی گەورە بیّ باوەڕی گەورە: لە ئیسلام دەیان کاتە دەرەوە و وە ئیسلامیش هەڵئەوەشێنێتەوە.

وە هاوبەش بڕیاردانی بچووك و بیّ باوەڕی بچووك: لە ئاینی ئیسلام نایکاتە دەرەوە بەڵام هەریەك لە ئیسلام و باوەڕ کەم ئەکەنەوە.

ئەوان واتە خەواریجەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان ئەمەو ئەوەدا، وە لای ئەوان بیّ باوەڕی بچووك و هاوبەش بڕیاردانی بچووك نییە، بەڵکو لای ئەوان بیّ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردان یەك شتە و ئەویش دەرچوونە لە ئاین، وە ئەوان بە ڕووکەشی دەقەکان وەرئەگرن و دەقەکانی تر واز لیّ ئەهێنن کە ئەوانە فراوانتر ئەکات و ئەیانکاتە دوو بەشەوە. لەبەرنەبونی شارەزای و تێگەیشتن لە ئاین لایان، وە نەبونی زانست و کەم تواناییان لەڕووی زانستیەوە، تاوایان لێهات خەڵکی بە بیّ باوەڕ دائەنێن زۆریش ڕۆئەچن لە بیّ باوەڕکردندا، بەبیّ شارەزای و تێگەیشتن، وە دەقەکانی قورئانو سونەت لە شوێنی خۆیاندا بەکارناهێنن و لەخۆیانەوە حوکم ئەدەن، تەنها لەبەرئەوەیە کە ئەوان تێگەیشتنیان نیە لە شەرعدا، ئەوان تەنها خوێنەرن ووتەکان ئەخوێننەوە و لە واتاکەی هیچ تیّ ناگەن پاشان بەو تێگەیشتنە کەم و کورتیەی خۆیانەوە لەسەر خەڵکی جیّ بەجێی ئەکەن و حوکم ئەدەن بەسەریاندا.

ئا ئەوانە کۆمەڵی دەرچوانن و ئێستاش بەداخەوە نەوەیان هەیە لێیان جێماوە، لەوانەی خەڵکی بە بیّ باوەڕ دائەنێن و ڕۆئەچن لە بەکافردانانەندا و خوێن ڕێژی بە حەڵاڵ ئەزانن بە ناحەق و بە بەڵگەی ئەوەی ئەو خەڵکە بیّ باوەڕە بە بۆچونی ئەوان. ئێستاش شوێن کەوتەیان هەیە لە گەنجانمان و لە نەزانەکانمان و لەوانەش کە خۆیان بە خوێنەوار و زانا دا ئەنێن.

## لایەن و دەستەی دووەم

مورجیئەن ئەوانەی ئەڵێن باوەڕ لە دڵدایە و کردار بەشێك نیە لێی، وە هەندێکیان ئەڵێن گوفتار ناچێتە ناوی و بەشێك نیە لێ ی ((واتە لە باوەڕ)) بەڵکو تەنها باوەڕهێنان بە دڵ و بەس. وە هەرچی کرداریشە ئەوە ناچێتە ناوی و بەشێك نیە لێ ی، جا هەرچی ئەوێت بیکات بە ویستی خۆی بێ باوەڕ نابێت، وە ئەڵێن لەگەڵ بوونی باوەڕدا تاوان ئەنجامدان زیانی لێ نادات، وە لەگەڵ بێ باوەڕیشدا گوێڕایەڵی هیچ سودێکی نییە، ئەوە ڕێبازیانە، وە ئەمانە ئەو دەقانەیان وەرگرتووە کە تەنها بەڵێندانی تیادایە، خوای گەورە بەڵێن بە لێخۆشبوون ئەدات لێبوردنی تیایە، وە نەهاتوون لە نێوان ئەمەدا و ئەو دەقانەدا باسی هەڕەشە ئەکات کە هۆشداری دانی تیایە دەربارەی بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردان و تاوانەکان و سەرپێچی کردنەکان کۆبکەنەوە، هاتوون تەنها پشتیان بەستووە بەو دەقانەی کە باسی بەڵێن دان ئەکات و بەس بە هیوابوون پیشەیان بووە، وە ئەو خەواریجانە هاتوون تەنها دەقەکانی هەڕەشەیان وەرگرتووە و وازیان لە دەقەکانی بەڵێن و لێبوردەیی و بەهیوابوون هێناوە، لایەنی ترسیان وەرگرتووە و ترس و بیم لایان زیاتر بووە، جا بەهۆی ئەوەوە لایەنی بە کافردانان بەسەریاندا زاڵ بوە خەڵکیان بە کافر داناوە و خوێنیانیان حەڵاڵ کردووە وماڵیشیان بە تاڵان بردوون بەو ڕێبازە خراپەی گرتوویانەتەبەر.

## لایەن و دەستەی سێ یەم

کۆمەڵی شوێنکەوتوانی سوننەتن کە ئەمان لە نێوان هەردوو ڕێبازەکەدا ناوەندن، ڕێبازی مورجیئە و ڕێبازی خەواریج، کۆبەندی لە نێوان دەقەکاندا ئەکەن و ئەڵێن بێ باوەڕی لە قورئان و سوننەتدا دابەش ئەبێت بۆ دوو بەش بێ باوەڕی گەورە و بێ

باوەڕی بچووك و هاوبەش بڕیاردانی گەورە و بچوك، وە ئەو تاوانانەی کە ناگەنە پلەی هاوبەش بڕیاردان خاوەنەکەی بێ باوەڕ ناکات، هاوبەش بڕیاردانی گەورە و بێ باوەڕی گەورە لە کۆمەڵی موسڵمانان دەریان ئەکات، بەڵام هاوبەش بڕیاردانی بچوك و بێ باوەڕی بچوك لە کۆمەڵی موسڵمانان دەریان ناکات پێچەوانەی خەواریج بەڵام باوەڕ کەم ئەکەنەوە بە پێچەوانەی مورجیئەوە کە ئەڵێن هیچ شتێ زەرەری لێ نادات، ئەهلی سوننەت لە نێوان هەردوو دەستەکەی دژ بەیەکن، وە سوپاس بۆ خوا کۆمەڵی شوێنکەوتەی سوننەت ناوەندن، توانیویانە کۆبەندی بکەن لە نێوان هەر یەکە لە دەقەکانی هەڕەشە و بەڵێنداندا وە هەروەها لە نێوان ترس و هیوادا، تەنها بە هیوا بونیان وەرنەگرتووە هەروەکو چۆن مورجیئەکان وەریانگرتووە، وە هەروەها تەنها ترسیان وەرنەگرتووە هەروەکو چۆن خەواریجە دەرچووەکان وەریانگرتووە.

جا هەر کەسێك بەندایەتی خودای کرد لەسەر ترس بە تەنها ئەوە دەرچووە واتە خروجی کردووە، وە هەر کەسێکیش بەندایەتی خودای تەنها لەسەر ئەوە کرد بە ئومێد و هیوایە ئەوە مورجیئەیە، وە هەر کەسێکیش بەندایەتی تەنها لەسەر خۆشەویستی کرد ئەوە صۆفییە، وە هەرکەسێك بەندایەتی خوای کرد لەسەر ترس و بە هیوابوون و خۆشەویستی و بە ئومێدبوون و تۆقین لە سزای خوای گەورە ئەوە یەکتاپەرستێکی سونییە، وە ئەوە درێژە پێدانی ئەم بابەتە گەورەیە کە هەڵوەشێنەرەوەکانە.

جا زانینی ئەم هەڵوەشێنەرەوانە گرنگیەکی زۆر گەورەی هەیە هەتا مرۆڤی موسڵمان لەسەر چاو ڕۆشنی دینداری بکات، تا لەگەڵ مورجیئە نەبێت، تا لەگەڵ خەواریج نەبێت بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵی شوێنکەوتوانی سوننەتدا بێت، ئەوانەی کە

كۆبەندیان لەنێوان دەقەكاندا كردووە كردار بە فەرمایشتی خوای پەروەردگار كە ئەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾[١]

واتە: (هەر ئەو خودایە ئەم قورئانەی دابەزاندە سەرت، هەندێكی چەند ئایەتێكی تەئویل هەڵناگرن و مانا و مەبەستەكانیان ڕۆشن و دامەزراوو بناغەن بۆ ئایەتەكانی تری وە ئەوی تریشی لێكچوون واتە بێژە و ووشەكانی مانای جۆراوجۆر هەڵ ئەگرن و بۆ هەموو كەسێكیش ڕۆشن نین چونكە چەند واتا و مانایەكی جیا لەویتر ئەبەخشن بەڵام زانا خوێندەوارەكان لەبەر ڕۆشنایی ئایەتە موحكەمەكاندا مانای ئەمانیش ئەزانن‌و چارەسەریان ئەكەن، ئینجا ئەوانەی لە دینیاندا لادان هەیە هەمیشە ئامادەن بۆ ئاژاوە نانەوە، هەر لە دوای وێكچوەكاندا ئەگەڕێن و پەیڕەویان ئەكەن بە ئارەزووی خۆیان ڕاڤەی ئەكەن، بەمەبەستی گێرەشێوێنی و لادانی خەڵكی لەسەر ڕێگای ڕاست و دروست كردنی گومان بۆیان، وەیان هەر چۆنێك دڵیان حەز بكا مانایان بكەن و ڕاڤە و لێكدانەوەی هەڵەیان بۆ هەڵبەستن، لە كاتێكدا ڕاڤە و لێكدانەوەی مانا ڕاستەكەیان خوا نەبێ كەسی تر نایزانێ).

جا ئەوانەی لە دڵیاندا لادان هەیە بریتین لە خەواریج و مورجیئەكان، جا دەرچووەكان و وێكچووەكانیان وەرگرتووە و مورجیئەكانیش بەهەمان شێوە وێكچووەكانیان وەرگرتووە و نەیان گێڕاوەتەوە بۆ لای ئایەتە موحكەمەكان تا لێ ی

---

[١] آل عمران: ٧

تێبگەن، چونکە قورئان هەندێکی هەندێکی تری ڕاڤە ئەکەن، وە هەندێکی هەندێکی دی ڕوون ئەکەنەوە، بەلاّم کۆمەڵی شوێنکەوتەی سوننەتی ڕۆچو لە زانستدا هەردووکیانیان وەرگرتووە بەیەکەوە، وێکچویان گێڕاوەتەوە بۆ لای موحکەم و موتەشابیهەکانیان ڕاڤە کردووە بە موحکەمەکان بۆیە ڕێنموکراون بۆ لای حەق و ڕاست، لە هەمان ئایەتدا ئەفەرموێت: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾[1]

واتە: (ئەوانەی کە ڕۆچوون لە زانستدا و زۆر زانان ئەڵێن باوەڕمان بە هەموو شتێك هەیە کە لەلای پەروەردگارمانەوە بێت مەبەستیان ئایەتە وێکچووەکانە(متشابه) ).

کە موحکەم و موتەشابهە، وە کەلامی خوا ((قورئان)) دژیەك نین، وە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەمان شێوە دژ یەك نین، کۆبەندیان کردووە لە نێوان ئەمە و ئەوەدا، ڕاڤەی ئەمەیان (موتەشابیە) کردووە بەوە (موحەکەم) و هەریەکەیان پەیوەند کردووە بەیەکەوە، ئەمە ڕێگەی ڕۆچووانە لە زانستی شەرعیدا، بەلاّم کۆمەڵی گومڕایان تەنها یەك لایەن ئەگرن کە ئەویش وێکچووەکانە((متشابه)).

جا وێکچووەکان لە ئایەتی هەڕەشەدا دەرچووەکان وەریانگرتووە و وێکچووەکانیش لە ئایەتی بەڵێندا مورجیئەکان وەریانگرتووە، بۆیە لە ڕێگە ڕاستەکە لایانداوە و گومڕابوون، جا ترس لەسەر موسڵمانان لە دوو ڕووەوە پەیدا ئەبێت ئەوانیش:

<u>لایەنی یەکەم</u>: بێ ئاگایی دەربارەی ئەم هەڵوەشێنەرەوانە و خۆشارەزاو فێرنەکردنو زانینیان. وە جیانەکردنەوەی حەق و ناحەق لە یەکتر.

---

[1] آل عمران: ٧

لایەنی دووەم: بەناوی خواوە قسەکردن بە بێ بوونی زانیـاری، جـا زۆرێك لەوانـەی بانگەشەی زانـست ئەکـەن لـەم ڕۆژگـارەدا، بوێرانـە و چاونەترسانە دەسـتیان داوەتـە باسـکردنی چـەندین بابـەتی گـەورە و ترسـناك لـە بابەتـەکانی بیروبـاوەڕ، تاوایـان لـێ هاتووە قسەیان دەربارە ئەکەن و فەتوای پێ ئەدەن و حوکم بەسـەر خەڵکیـدا ئـەدەن بە نەزانی و گومڕایی، پەنا بە خوای گەورە.

جا ئەوەی پێویستە لەسەر موسڵمان کـە ڕێگـەی کۆمـەڵی ڕاسـت بگرێـت و ئـەوەش نایەتە دی تا خۆ شارەزا نەکات و هەوڵی تێگەیشتنی ئـاینی خـوای گـەورە نـەدات، بـە تەنها بەس نییە لەبەرکردنی دەقەکان، لەبەرئەوەی هەندێك لەوانـە هـەردوو صـەحیحی بوخاری و موسلیمیان لەبەرە لەگەڵ سوننەکانیشدا بەڵام لـە واتاکانیـان تـێ ناگـات وە ناشزانێت ڕاڤەیان بکات بەڵکو بە بۆچـونی خـۆی ڕاڤـەیان ئـەکات، یـان ڕاڤـەکانیان لـە کۆمەڵـە گومڕاکانـەوە وەرئـەگرێت و وەری ئـەگرێت لـە خـەواریج و مورجیئـە ئـەوەش ترسـناکی و مەترسـیداریەکەیەتی، زانـست بەتـەنها بـە لەبـەرکردن نایەتـەدی، بـەڵکو زانست بە لەبـەرکردن و لـێ تێگەیـشتن و زانینـی واتـا و مەبەسـتەکانیان دێتـە دی، وە لەبەرکردنیش بەدەست نایەت مەگەر بە فێربوون و وەرگرتنـی زانـست لـە زانایانـەوە و خوێندنەوەی لەگەڵیاندا. ئەوەیە زانست و تێگەیشتنی ڕاست و دروست، بۆیە پێویـستە لەسەرمان کـە گرنگـی بـدەین بـەم کـارە گرنگیـدانێکی قـوڵ و چڕ و پـڕ، لەبەرئـەوەی ئێمـەش نەکەوینـە ئـەو گومڕایەتیـەی کـە کۆمەڵـە گومڕاکـان تێیکـەوتوون و پیـشەی سـەرەکیان لـەم کاتـەدا بووەتـە خوێنڕێـژی و کوشـتن و شـەڕە قـسە و گـومڕاکردن و تۆمەتی بیدعە چیەتی دانە پاڵ و لەسنور دەرچوون بەبێ ئەوەی لەسەر چاوڕشنی ئەم کارە بکەن و زانیاری تێگەیشتنیان هەبێت، لاحول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم، ئەمـە لایەنێکی زۆر گەورەیە و پێویستە لەسەرمان گرنگی پـێ بـدەین و هۆشـداری لـەبارەوە

بدەین، وە نەچین تەنها خۆمان کورت هەڵێنین لەسەر خوێندنەوەی پەروتوکەکان یان لەبەرکردنی دەقەکان بەبێ تێگەیشتنی مانا و مەبەستەکانیان چاو ڕۆشن بوون لە یاساکانی بە تێر و تەسەلی لەسەر دەستی زانایان، وە دەرچووەکان((خەواریج)) گومڕا نەبوون، تەنها بەم ڕێگەیە نەبێت کە ئەهاتن هەموو شتێکیان لەبەرئەکرد بەبێ ئەوەی لێ ی تێ بگەن، هەر لەبەرئەوەشەپێشەوا((ابن القیم)) لەبارەیانەوە ئەفەرموێت:

ولهم نصوص قَصَروا فی فهمها فــأتوا من التقصیر في العرفـــان

واتە: خەواریجەکان دەقەکانیان لابوو بەڵام کەم بیربوون لە تێگەیشتنیاندا بۆیە هەمیشە لە کورتیان هێناوە لە شارەزایی ئەو دەقانەدا.

دەقەکانیان لایەو لەبەرکردنیشیان هەیە، قورئان ئەخوێننەوە بەشە و بەڕۆژ، شەو هەمووی شەو نوێژ ئەکەن و ڕۆژیش بە ڕۆژو ئەبن، بەڵام تێگەیشتنیان بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەك نیە. هەر لەبەرئەوە کەوتونە ناو ئەو هەموو خراپەکاریەوە، تێگەیشتن لە ئاین کارێکی زۆر گەورەیە، وە تێگەیشتنیش بریتییە لە شارەزابوونی دەقەکانی قورئان و سوننەت گومانی تیادا نیە کە ئەبێت دەرمانەکان بناسیت لە پێش هەموو شتێکدا پاش ئەوە دەردەکە بناسی کە لەنەخۆشەکەدا هەیە پاشان ئەو دەرمانەی بدەیتێ کە بۆی ئەگونجێت، جا ئەگەر دەرمانەکە بە دەردەکەی خوارد ئەوە سودی ئەبێت بإذن الله، وە ئەگەر دەرمانەکە بۆ دەردەکە نەبوو ئەوا زیان بەخشە، زانا لە شوێنی پزیشکە لەگەڵ نەخۆشدا کە ئەبێت هەردووکیان بزانێت و دەرمانەکان بزانێت و شوێنەکانی دەرمانکردنیش بزانێت و تابتوانێت بۆ هەموو نەخۆشێك ئەو دەرمانەی بداتێ کە بۆی ئەگونجێت، ئەمە چواندنێکی ڕاست و دروستە ئەگەر جوان لێی وردبیتەوە، بەڵام ئەوە پێویستی بە چاوڕۆشنی و تێگەیشتن هەیە، ئێستا براکانم

وا ئەبینن كە ئەوان زانا و شارەزاترن لە زانایان، لەبەرئەوە كەوتونەتە ئەو هەموو خراپییەوە لاحول ولا قوە إلا بالله، ئەمە ڕێگەی خەواریجەكانە، هاوەڵانیان بە بێ باوەڕ دانا ڕەزای خوا لە هاوەڵان بێت، وە وایان بینی كە هاوەڵانی بەڕێز لەسەر ڕێگەی ڕاست نین و لە هیچ تێ ناگەن و غیرەتیان نییە لە پێناوی خوادا. ((إبن القيِّم)) ئەفەرموێت ڕەحمەتی خوای لێ بێت:

و الجَهلُ داء قاتل و شفاؤه　　　أمران فی التركيب متفقان

واتە: نەزانین دەردێكی كوشندەیە چارەسەرەكەی

دوو پێكهاتەی لەگەڵ یەكدا ڕێككەوتوون

نص من القرآن أو من سنة　　　وطبيب ذاك العالم الربانی

واتە: دەقێكە لە قورئان یان دەقێكە لە سوننە

پزیشكی ئەوەش زانایەكی لە خوا ترسە.

ئەو مەترسیەی لەم ڕۆژەدایە زۆر گەورەتر و ترسناكە، ئەڵێین سوپاس بۆ خوا گەنجان ڕوو لە ئاینەكەی خوا ئەكەن، وە ڕابونیشیان هەیە وەكو ئەڵێن [1] بەڵام ئەگەر ئەم ڕابوونە و ڕووكردنە ئاینە ڕێنوێنی نەكرێت ئەبێتە گومڕایی و سەر لێ شێواوی، وە گومانی تیادا نیە كە ئەبێت ڕێنمایی بكرێن و ڕاست بكرێنەوە ڕۆشنبیر بكرێن بە ئاین و دینی خوا هەتا ئەو ڕابونە لەسەر چاو ڕۆشنی و زانین و تێگەیشتن بێت، ئەگەر نا ئەوا

---

[1] انظر تعليق شيخنا على مصطلح الصحوة الاسلامية فی كتاب الاجاب المهمة فی المشاكل الملمة ١/١٩٤.

ئـەو ڕابونـە ئەبێتـە هـۆی زیـان گەیانـدن بـە موسـڵمانان ئەگـەر ئاگـادار نەکرێنـەوە و گەنجەکانیان و براکانیان ڕێنمایی نەکەن بۆ شارەزایی و تێگەیشتن لە دینی خوا.

وە سوپاس بۆ خوا وە سڵاو و درودی خوای گەورە لەسەر پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ و کەس و کار و هاوەڵە بەڕێزەکانی بێت.



## پرسیارەکان

پرسیار: ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و هەڵوەشێنەرەکانی باوەڕدا ((الایمان))؟

وەڵام: جیاوازی نیە لە نێوانیاندا هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی ڕاست هەمان هەڵوەشێنەرەوەکانی باوەڕیشە، بەڵام ئەگونجێت مرۆڤ موسڵمان بێت بە زمانی لەهەمان کاتیشدا دوو ڕوو بێت هەروەکو چۆن خوای بەرز و باڵا ئەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ﴾[1]

واتە: (بە دڵنیاییەوە ووشەی بێ باوەڕیان وت وە بێ باوەڕیش بوون لەدوای ئەوەی کە موسڵمان ببوون)

وە دەربارەی باوەڕدارانیش فەرمویەتی ﴿لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾[2]

واتە: ( پۆزش مەهێننەوە بێ باوەڕبوون لە دوای ئەوەی باوەڕتان هێنا بوو).

پرسیار: ئایا بەهانە و پۆزش بۆ کەسێك ئەهێنرێتەوە ئەم هەڵوەشێنەرەوانە نەزانێت؟

وەڵام: نەزانین جیاوازی هەیە، ئەگەر کابرای نەزان نەیئەتوانی فێربێت ئەوا بەهانەی بۆ ئەهێنرێتەوە تا کەسێك ئەیبینێت فێری بکات وەك ئەوەی کە لە ناوچەیەکدا بژی دابڕاوبێت لە وڵاتی موسڵمانان، لەو ناوچەیە تەنها بێ باوەڕان ئەژین ئەوە پۆزشی بۆ ئەهێنرێتەوە بە نەزانین ((واتە نازانێ بۆیە ئەو کارەی کردووە و ئەیکات ..وەرگێڕ))

[1] التوبة: ٧٤

[2] التوبة: ٦٦

بەڵام كەسێك لە وڵاتانی موسڵماناندا ئەژی وموسڵمان لـە دەوروبەریـدان و گـوێی لـە قورئان و فەرمودە و قسەی زانایانـە ئـەوە بـەهیچ شـێوەیەك پۆزشـی بـۆ ناهێنرێتـەوە بەوەی نەزانە چونكە بەڵگەی پێ گەشتووە بەڵام ئەم كەسە خۆی گرنگی پێ نـەداوە و بایەخی نەبووە لای بەڵكو هەندێ جاریش ئەڵێت((ئەوە ئاینی وەهابیەكانە))

یـان ئـاینی خـەڵكانی نەجـدە یـان ئـاینی فـلان و فلانـە هـەروەكو چـۆن دەربـارەی یەكتاپەرستی ئەڵێن ئەوە ئاینی موحەمەدی كـوڕی عبدالوهابـە لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەوە ئاینی پێغەمبەرە ﷺ وە موحەمەدی كوڕی عبدالوهاب شتێكی نوێ ی نەهێناوە بەڵكو تەنها بانگەوازی بۆ ئاینەكەی پێغەمبەر ﷺ كردووە، ئاینەكەیان داوەتە پاڵ ئەو وتیان ((ئەوە ئاینی وەهابیەكانە)) ((ئـەوە ئـاینی كوڕەكـەی عبدالوهابـە)) یـان ئـەڵێن ئـەوە ((ئاینی خەواریجەكانە)) یەكتاپەرستان ناو ئەنێن خەواریجەكان، ئایە ئەمانە پۆزشـیان بۆ ئەهێنرێتەوە بە نەزان و هیچیان لەسەر نیە؟ نەخێر بەڵكو ئەوانە خۆیـان بـە گـەورە ئەزانن و بەهانەی نەزانینیان بۆ ناهێنرێتەوە.

پرسیار: كەسێك هەڵوەشێنەرێك لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلامی ئەنجام دا پاشان گەڕاوەتەوە و تەوبەی كرد لە دوای ئەنجامدانی ئایا ئەتوانێ تەوبـە بكـات و بگەڕێتـەوە واتە لێی وەرئەگیرێ؟

وەڵام: بەڵێ ئەگەر گەڕایەوە خوا لێی وەرئەگرێ گەڕانەوەكەی، خـوای پـەروەردگار تەوبە لەهەموو گوناهبارێك وەرئەگرێت، لە هەڵگەڕاوەكان و جگە لەوانیش، خوای پاكو بـێ گـەرد ئەفـەرموێت: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾[1] واتە: (وە بێ گومان من بەرامبەر بەو كەسەی تەوبەكار و پەشیمان و بـڕوادار و ڕەفتـار چاك بێت، پاشان ڕێگای ڕاستی گرتبێ زۆر لێبوردە و بەخشەرم).

---

[1] طه: ٨٢

وە هـەروەها ئەفـەرموێت: ﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾[1]

واتە: ( ئەی محمد ﷺ لە منەوە بڵێ: ئەی بەنـدەکانی مـن، ئـەی ئەوانـەی سـتەم و زیادەڕۆییان لەخۆیان کردووە لە ڕەحمەت و بەزەیی میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن بـە ڕاستی خوا لە هەموو گوناحێ خۆش ئەبێت).

وە هـەروەها ئەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ ﴾[2]

واتە: (ئەو کەسـانەی کـە دوای باوەڕهێنـان بێباوەڕبوونـەوە و هـەرواش مانـەوە لـە بێباوەڕیدا هەتامردن، مەبەست جولەکەکانە دوای باوەڕ هێنانیان بە موسا پـشتیان لـە عیسا ﷺ هەڵکرد و کاتێ موحەمەدیش ﷺ هات پشتیان لەویش وەرگێڕا هـەتا ئـاوابن هەرگیز تەوبەیان لێ وەرناگیرێ).

بـە واتـای هەرکەسـێ هەڵگەڕایـەوە و تەوبـەی نـەکرد هـەتا مـرد ئـەوە بـێ بـاوەڕی زیـادکردووە بـەوەی کـە بـەردەوام بـوو لەسـەر بـێ بـاوەڕی، بـەڵام ئەگـەر پەشـیمان بوایەتەوە و بگەڕایەتەوە خوای گەورەش تەوبەکـەی لـێ وەرئـەگرت، وە وتـەی خـوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ ﴾[3]

واتە: (جا هەر کەسێکتان لە ئاینی خۆی پاشگەزبیتەوە و وەبەبێ بـاوەڕیش بمرێـت ئەوا کاروکردەوەیان لە هەردوو دونیا بەفیڕۆ ئەڕوات).

---

[1] الزمر: ٥٣

[2] آل عمران: ٩٠

[3] البقرة: ٢١٧

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر بوایە بە موسڵمانی بمردایە و بگەڕایەتەوە ئەوە خوای پەروەردگار تەوبەکەی لێ وەرئەگرێت، لەبەرئەوەی کە خوای گەورە تەوبە لە هەڵگەڕاوە و جگە لەویش وەرئەگرێ ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ لای خوای بەرزو بالاَ.

پرسیار: ئایا گومان ئەچێتە ناو بیروباوەڕەوە؟

وەلاَم: جیاوازی هەیە لە نێوان گومان و بیروباوەڕدا، چونکە بیروباوەڕ دوو دڵی تیادا نیە بەلاَم گومان دوو دڵی تیادایە .

پرسیار: زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت زیاتر لەم دە هەڵوەشێنەرەوەیان هێناوە، بۆچی زانای شارەزا بە ئیسلام موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب ئەم دەیەی تایبەتی کردووە لە هەڵوەشێنەرەوەکان؟

وەلاَم: زانای پایەبەرز گرنگترینیانی باس کردووە و نەیوتووە لەم دە هەڵوەشێنەرەوانە هی تر نیە بەڵکو فەرمویەتی ئەمانە گرنگترینیانە لەناویاندا وە ئەگەرنا هەڵوەشێنەرەوەکان گەلێك زۆرن.

پرسیار: ئایا جیاوازی لە نێوان بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردانادا هەیە؟

وەلاَم: بەڵێ، بێ باوەڕی گشتگیرترە لە هاوبەش بڕیاردان، لەبەرئەوەی مرۆڤی بێ باوەڕ ئەگونجێ کەسێك بێت مل بۆ حەق نەدات و ملکەچی خوای پەروەردگار نەبێ، باوەڕی بە پەروەردگار نییە وێنەی فیرعەون و ئەوانەی سیفەتەکانی خوا پەك ئەخەن و باوەڕیان پێ ی نیە و ئەوانەش ئەڵێن خوا نییە پەنا بەخوا، بەلاَم مرۆڤی هاوبەش بڕیاردەر باوەڕی بە پەروەردگار هەیە بەلاَم لەگەڵیدا هاوبەشی بۆ پەیدا ئەکات، جا لەنێوان بێ باوەڕی و هاوبەش بڕیاردانادا گشتیەتی و تایبەتی هەیە.

پرسیار: گرنگی زانینی ڕێگریەکانی بەکافردانان چیە ؟ وە باشترین پەرتووك کە باس لەو بابەتە بکات کامەیە بە بۆچوونی تۆ ؟

وەڵام: لەسەر مرۆڤ پێویستە کە هۆکارەکانی بێباوەڕ بوون بزانێت، جا ئەگەر زانی کامانەن ئەوە دەبێتە ڕێگر لەبە کافر دانانی جگە لەوانە، وەباشترین پەرتووکیش لەو بوارەدا ئەم نامەیە کە زانای بەڕێز نووسیویەتی و ئێمە خەریکی ڕاڤە کردنین، لەبەر ئەوەی نامەکەی (محمدی کوری عبدالوهاب) نامەیەکی کورت و کۆکراوەیە، وە هەروەها لە هەموو پەرتووکێکدا کە باسی شەریعەت بکات لای هەموو مەزهەبەکان چەندین بابەت تەرخانکراوەو تایبەتە بە هەڵوەشێنەرەوەکان و ڕوونکردنەوەیان .

پرسیار: حوکمی گێڕانەوەی بێباوەڕی چیە لەلایەن کەسێکەوە کە تەنها مەبەستی دەربڕینی خۆشیەو هیچی تر ؟ واتە قسەی کوفری بگێڕێتەوە.

وەڵام: دروست نیە باسکردنی بێ باوەڕی با بۆ خۆشیش بێت، بەڵام تەنها گێڕانەوەو گواستنەوەی بێت کەسی گوێزەرەوەو گێڕەرەوەی بێ باوەڕی بێباوەڕ نیە وە کەسێ قسەی بێباوەڕی بگێڕێتەوە بێباوەڕ ناکرێت، وە ئەگەر گوێزایەوە بە مەبەستی خۆشی و پێکەنین (واتە کۆڕ و کۆبوونەوەی پێ خۆشبکات و بیانهێنێتە پێکەنین.. وەرگێڕ) ئەوە کارێکی زۆر ترسناکە لە پێشەوە باسمانکرد کە خوای گەورە ئەو کەسانەی بە بێباوەڕ دانا کە قسەیان لەڕووی پێکەنین و گاڵتەوگەپەوە دەکرد بەرامبەر بە ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێ .

پرسیار: ئایا ئەگەر کەسێك هەڵوەشێنەرێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی ئەنجامدا بێباوەڕ دەکرێت لەلایەن هەرکەسێکەوە کە بینی و پێی زانی یان دەبێت بێباوەڕ نەکرێت تەنها لەلایەن زانایانەوە نەبێت ؟

وەڵام: هەرکەسێك هەڵوەشێنەرێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی ئەنجامدا پێویستە بەدواداچوونی بۆ بکرێت پێ دەچێت نەزان بێت و پۆزشی نەزانینی بۆ بهێنرێتەوە، وەلەوەش دەچێت زۆرلێکراوبێت بۆ ئەنجامدانی وەکو (عەممار) ڕەزای خوای لێ بێ، وەلەوانەشە بەهانەیەك (عذر)ێکی هەبێ، جا ئەگەر ڕوون بوویەوە کە

هیچ بەهانەیەکی نەبوو نەزانیش نەبوو ئەوا حوکمی ئەوەی بەسەرا ئەدرێت کەلە خۆیەوە دەرچووە .

پرسیار: ڕادەی ئەو زۆرلێکردنە چەندە کەوا دەکات لەو کەسەی تێی دەکەوێت هەڵگەڕاوە نەبێت، وەیا زۆرلێکردن چەند جۆرێکی هەیە ؟

وەڵام: زۆرلێکردن جیاوازی هەیە بەجیاوازی ئەو بارودۆخانەی تێی دەکەوێت، دەگونجێ لە شتێکدا زۆرلێکردن هەبێت و لەشتێکی تردا زۆرلێکردن نەبێت، جا زۆرلێکردن دەگۆڕێت بە گۆڕانی شوێنەکانی، بەڵام ئەو زۆرلێکردنەی پۆزشی بۆ دەهێنرێتەوە ئەوەیە کە دەربازبوون لێی مەحاڵە وەناشتوانرێت دەربازبێت لێی وەکو کوشتن یان لێدان یان هەڕەشەکردن تەنها بە دەربڕینی ئەوە نەبێت کە داوای لێ دەکرێت، وەکو دەربڕینی بۆ وشەی بێباوەڕی بۆ وێنە، ئەمە کاتێک دەبێت کەبەهیچ جۆرێك نەتوانێت خۆی ڕزگاربکات لە زەبروزەنگی ستەمکار تەنها بەوە نەبێت کە دەری ببڕێت بەمەرجێ کە دڵەکەی ئارام و دڵنیا بێت بە باوەڕەکەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ﴾ [1]

واتە: ( تەنها کەسێك نەبێت کە زۆری لێ کرابێتو دڵەکەی دڵنیا بێت بە باوەڕ ).

پرسیار: زانایان دەفەرموون کەسی دیاری کراو بێباوەڕ ناکرێت ئەگەر کەوتە ناو بێ باوەڕیەوە مەگەر کاتێك نەبێت مەرجەکانی تیادا هاتبێتە جێو ڕێگرەکانیش لابرابێتو بەڵگەشی لەسەر چەسپابێت ( واتە پێی وترابێتو پێی گەیشتبێت .. وەرگێڕ ) ئایا ئەوە ڕاستە؟

وەڵام: بەڵێ ئەوە ڕاستە، بەڵام گەیاندنی بەڵگە بەگەیشتنی قورئانی پیرۆز پێی دێتە جێ لەسەر ئەو شێوەیەی تێبگات ئەگەر بیەوێ تێبگات، ((واتە کەسێ ئایەتەکانی بۆ بخوێنێتەوەو تێی بگەیەنێ .. وەرگێڕ)).

---

[1] النحل: ١٠٦

پرسیار: لەم سەردەمەدا دەبیستین بانگەشەی عەلمانیەکان دەربارەی جیا کردنەوەی دەوڵەتوئاین، ئایا ئەوانە بەو ئیشەیان پێی هەڵدەگەڕێنەوە لە ئاینی ئیسلام ؟

وەڵام: گومانی تیادا نیە کە خەڵکانی ناو ڕێبازە هاوچەرخە بێ دینەکان هەڵگەڕاونەتەوە وێنەی عەلمانیەکان و نوێگەریەکان و نەتەوەییەکان و شیوعییەکان لەبەرئەوەی پێچەوانەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامن .

پرسیار: ئەگەر کەسێك بەکەسێکی تری ووت: تۆ زانیاریت دەربارەی شتە نهێنیەکان هەیە لەڕووی گاڵتەوە ئایا ئەو وتەیەی بەهەڵگەڕانەوە دەژمێردرێت ؟ وەئایا حوکمیش دەدرێت بەسەریدا بەهەڵگەڕاوە ؟

وەڵام: ئەگەر مەبەستی گاڵتە کردن بێت یان ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە پێی بڵێ تۆ کەسێکی زیرەکی بەو دەربڕینە هەڵەیە ئەوە زیانی لێ ناداتو هەڵگەڕانەوەش نیە، لەبەر ئەوەی باوەڕی وا نیە کە زانستی نادیارەکان دەزانێ، بەڵام ئەگەر وابزانێ و باوەڕی وابێ کە شتە نادیارەکان دەزانێ ئەوە پێی هەڵدەگەڕێتەوە لە ئاینی ئیسلام .

پرسیار: کەسێك جنێویدا بە ئاینی خوا یان کارێکی کرد کە پێی بێباوەڕ دەبێت لەکاتی تووڕەبوونێکی زۆردا ئایا بە بێباوەڕ دادەنرێت ؟

وەڵام: ئەگەر مرۆڤ لەکاتی تووڕەبووندا گەیشتە ڕادەیەك کە دەریکات لە هەستکردن ئەوە لێی ناگیرێ چونکە وەکو شێتی لێهاتووە، بەڵام ئەگەر تووڕەبوونەکەی نەدەگەیشتە ڕادەی نەمانی هەستکردن ئەوە لێی وەردەگیرێ، جا ئەگەر ژنەکەی تەڵاق بدات یان قسەی بێباوەڕی بێ بە زاریدا یان هاوبەش بڕیاردان بڵێ ئەوا لەم کاتەدا ئەو حوکمەی بەسەردا دەدرێت کە خۆی وتوویەتی ئەگەر بزانێ و عەقڵی پێ بشکێ چی دەڵێت.

پرسیار: ئەگەر كەسێ وشەی بێباوەڕی دەربڕیو دەستبەجێ تەوبەی كردو گەڕایەوە ئایا دەبێت خۆی بشوات ؟

وەڵام: خۆشۆردنی لەسەر نیە، ئەگەر گەڕایەوە بۆ لای خواو داوای لێخۆشبوونی كرد و تەوبەیەكی ڕاست و دروستی كرد پێویست بە خۆشۆردن ناكات، بەڵام بێباوەڕی بنەڕەتی كەهەر بێباوەڕبووە ئەگەر گەڕایەوە بۆ لای خوا هەندێ لە زانایان وادەبینن كە خۆی بشوات، بەڵام زۆرینەی زانایان دەڵێن ئەگەر بێباوەڕی بنەڕەتی موسڵمان بوو فەرمانی پێ ناكرێت بە خۆشۆردن، لەبەرئەوەی خەڵكانێكی زۆر لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ موسڵمان بوون و فەرمانیشی پێ نەكردوون بە خۆشۆردن، وە هەندێكی تریان دەڵێن هەڵگەڕانەوە دەستنوێژ دەشكێنێت، ئەوەشیان لەسەر ئەوەوە وتووە كە كردارەكانی هەڵگەڕاوە پووچ دەبێتەوە با تەوبەش بكاتو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ((دەستنوێژیش یەكێكە لەوانە .. وەرگێڕ)) .

جا ئەگەر تەوبەی كرد لەسەرەتاوە دەست پێ دەكاتەوە ئەوە گوتەی هەندێك لە زانایانە .

وە وتەی دووەمیان: كردەوە چاكەكانی لەدوای تەوبە لە هەڵگەڕانەوە دەگەڕێتەوە بۆیو پووچ نابێتەوە، دەستنوێژەكەی دەمێنێو حەجو كردەوە چاكەكانی دەگەڕێتەوە بۆی، وە ئەوەش ڕاستەو درووستە لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی

﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ ﴾[١]

پێشتر مانامان كرد .

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر نەمرێت بە بێباوەڕیو تەوبە بكات كردەوەكانی ڕابردووی هەڵناوەشێتەوە (( مەبەست كردەوەی باشو چاكەكانیەتی .. وەرگێڕ)).

---

١ البقرة: ٢١٧




(بەناوی خوای خاوەن کەرەم و ڕەحمەتی بێ ئەندازە)

شەیخی ئیسلام (محمدی کوڕی عبدوالوهاب) ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرموویەتی (بزانە کە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام دە هەڵوەشێنەرن )

یەکەمیان: هاوبەش پەیداکردن لە پەرستنی خوای گەورەدا .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾[1]

واتە: ( بێگومان هەرگیز خوا لە دانانی هاوبەش بۆی نابووڕێ، وەلە خوار هاوبەش دانانەوە لەهەر گوناهێك دەبوڕێ بۆ هەرکەسێك کە خۆی بیەوێ ).

وە دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾ ﴾[2]

واتە: (چاك بزانن کەهەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر قەدەغە دەکات و جێوشوێنی ئاگرە و ستەمکارانیش هیچ جۆرە یارمەتی دەرێکیان بۆ نیەو ڕزگار نابن ).

وەلەوانەش سەربڕین بۆ جگە لە خوا وەك کەسێك سەربڕین ئەنجام بدات بۆ پەری یان گۆڕ، وە بەناوبانگترین هاوبەش دانانە بۆ خوای گەورە.

---

[1] النساء: ٤٨

[2] المائدة: ٧٢

## (ڕاڤە)

سوپاس بۆ خوای هەموو جیهانەکان، وە سڵاوی خواو درووود لەسەر پێغەمبەرمان ﷺ وەلەسەر خزمە نزیکەکانی و هەموو هاوەڵانی بێت .

لەپاشدا: بێگومان پێویستە لەسەر موسڵمان کەلە ئاینەکەی بترسێت زۆرتر لەوەی کەبترسێت شتێك بەسەر خۆیی و ماڵەکەیدا بێت، لەچی بترسێ لە دینەکەی کە تووشی بێت؟ دەترسێت لەوەی ئاینەکەی تووشی ئاژاوەو گومان بۆ دروستکردن ببێت، هەروەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (إنَّها ستكونُ فتنٌ كقطع الليلِ المظلم يصبحُ الرّجلُ مؤمناً ويُمسي كافراً، ويمسي مؤمناً ويصبحُ كافراً، يبيعُ دينهُ بعرضٍ منَ الدنيا)[1]

واتە ( لە کۆتا زەماندا بەڵاو ئاشووبی وا ڕوودەدات وەکو پارچە شەوی تاریك بەیانی (پیاو، ژنیش) هەڵدەسێت موسڵمانە ئێوارەی لێ دێت بێباوەڕە، یان ئێوارە موسڵمانە و بەیانی لێدێت بێباوەڕ دەبێت ئاینەکەی بەبەشێکی کەم لە دونیا دەفرۆشێت ) . موسڵمان هەتا لە ژیاندا بێت و بژی دووچاری بەڵاو ئاشووب و گێچەڵ دەبێت وە دووچاری هەڵگەڕانەوە دەبێت لە ئاینی ئیسلام وە لەبەرئەوەش پێشەوای یەکتا پەرستان ئیبراهیمی خەلیلی خوا ﷺ هاوار دەکاتە پەروەردگاری و دەفەرموێت:

﴿وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾[2]

واتە: (خوایە من و نەوەکانم بەدوور بگریت لەوەی بت پەرستبین، پەروەردگارا ئەوانە خەڵکانێکی زۆریان سەرلێشێواوو گومڕا کردووە ).

---

[1] اخرجه مسلم برقم (١٨٦)، وترمذی(٢١٩٥)من حديث أبي هريرة رضي الله عنه .

[2] إبراهيم: ٣٥ – ٣٦

ئەوە ئیبراهیمەكەبە دەستی خۆی بتەكانی شكاندو لەو ڕێگەیەشدا سزادرا و خرایە ناو ئاگرەوە لەگەڵ ئەوەشدا لەخۆی دەترسێت كە هەڵگەڕێتەوە لە یەكتاپەرستی و بت بپەرستێ، چونكە ئەوانەی ئەو بتانەیان پەرست جۆرێ بوون لە مرۆڤ و ژیری‌و زانینیان هەبوو پەییان بە هەموو شتێك دەبرد لەگەڵ ئەوەشدا ژیریان و شارەزاییان نەبووە بەرگرتنیان لەوەی كە بت بپەرستن، جا ئیبراهیم ﷺ كاتێ بینی ئەو خەڵكە زۆرەی كەوتوونەتە ناو بت پەرستی‌و دووچاری ئەو دەردە بوون ترسا لە خۆی كە ئەویش دووچار ببێ بەو نەخۆشیە ترسناكە هەربۆیە پاڕایەوە لە پەروەردگاری كە جێگیرو دامەزراوی بكات لەسەر ئاینی یەكتاپەرستی و دڵەكەی گومڕا نەبێت وەكو چۆن ئەوان لایانداو گومڕابوون، چونكە ئەویش وەكو ئەوان مرۆڤەو مرۆڤیش دوور نیە لە دووچار بوون بە بەڵاو ئاشووب، وە لەبەرئەوەش پێغەمبەرمان محمد ﷺ تەواوترینی خەڵك بووە لەڕووی باوەڕو یەكتاپەرستیەوە لەخۆی دەترساو دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (( یا مقلب القلوب ثبت قلبی علی دینك)) فتقول له عائشة أم المؤمنين تخاف علی نفسك ؟ فيقول الرسول ﷺ ((يا عائشة وما يؤمنني وقلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن))[1]

واتە (ئەی هەڵگێڕەرەوەی دڵەكان دڵم جێگیر بكە لەسەر ئاینەكەت) دایكمان عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت پێی دەفەرموو: لەخۆت دەترسیت؟ پێغەمبەریش ﷺدەیفەرموو: ( ئەی عائشە ئەی كێ دڵنیام دەكات لەكاتێكدا دڵی بەندەكان لەنێوان

١- أخرجه احمد ٢٤٦٠٤، والأجرى في الشريعة ٧٣٣، والنسائي في الكبرى ٧٦٩٠، وإبن ابي عاصم في السنة رقم ٢٤٠، وصحيحه الالبانى رحمه الله، وقد وردت احاديث عن جمع من الصحابة في دعاء النبي ﷺ وفي كون القلوب بين اصبعين من اصبع الرحمن . أنظر جملة من احاديثهم في الشريعة للأجري والسنة للأبن ابي عاصم ١٧٣/١ وكذا في التوحيد للا بن خزيمة ١٨٧/١ باب اثبات اصابع لله عزوجل.

دووپەنجە لەپەنحەکانی ڕەحماندایە). لەبەرئەوەشە هەردوو دۆستەکە ئیبراهیم و محمد سەلامی خوا لەهەردووکیان بێت ترسان لەئاینەکەیان و پەنایان بۆ خوا برد بەوەی ڕێنموویان بکات لەوەی کە ئەو خەڵکە زۆرە تێی کەوتوون .

وە هەموو کەسێکیش جگە لەوان لەبەرترە بەوەی کە بترسێ، موسڵمان دەترسێ لە ئاین و لەخۆیشی لە خراپەی بانگەوازکارە خراپەکان لە ئاژاوەو بەڵاو گومانەکانیان، بەڵای ئارەزوو بەڵای گومان، لەهەموو ئەمانە ئەبێ بترسێ، ئەگەر ترساش ئەوە هۆکارەکانی پاراستنی گرتۆتە بەرو خۆشی بەدوور دەگرێت لە هۆکارەکانی تیاچوون، بەڵام دەترسێت و هۆکاری سەلامەتی ناگرێتە بەرو خۆیشی بەدوور ناگرێت لە هۆکارەکانی تیاچوون ئەوە لەو کاتەدا بەس ترس بەس نیە بەڵکو دەبێ لەگەڵ ترسەکەشدا کردار بکات تاکو بیپارێزێ لەم بەڵاو ئاشووبانە، وە ئەوەش کارێکی پڕ مەترسیە وەناشبێت کە ئەم هەڵوەشێنەرەوانە بزانێت و هەروەها گومانەکان بۆچوونە تێکدەرەکان تەنها بە زانستی بەسوود نەبێت، لەبەر ئەوەی نەزان دەکەوێتە ناو ئەمانەوەو ناشزانێت بەڵکو چاو لە خەڵکی دەکات و هەرکەسێ گومانی باشی پێیان برد وێنەی کارەکەی ئەوان دەکات، بەڵام زانای لەخوا ترس زانستەکەی بێگومان سوودی پێ دەگەیەنێ بەفەرمانی خوا، خۆیشی بەدوور دەگرێت لەم کارانە، وە هەرکەسێکیش زیاترو زۆرتر خوا بناسێ زیاتر لێی دەترسێ، جا مرۆڤ دەبێت زانستی بەسوود فێربێت بەتایبەتی زانستی بیروباوەڕ، جا بەو زانستەی بیروباوەڕی ڕاست و دروست دەناسێت تا دەستی پێوە بگرێت، وە هەروەها هەڵوەشێنەرەوەکانی بیروباوەڕو خراپی و پووچیەکانی دەناسێت تا خۆی پێیان دوورخاتەوە، هەروەکو

چۆن حوزەیفەی کوری یەمان دەفەرموێت: ((کان الناس یسألون رسول الله ﷺ عن الخیر وکنت اسأله عن الشر مخافة ان یدرکني ))[١]

واتە ( خەڵکی پرسیاری خێرو چاکەیان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد بەڵام من پرسیاری شەڕم لێ دەکرد لەترسی ئەوەی نەك تووشم بێت و تێی کەوم ) ئێمە لە ئێستادا لەبارێکی شلەژاوو ئاژاوەو بەڵایەکی گەورەداین، وە هەروەها گومانی گومڕاکەر، بانگەوازکارانی خراپ و زۆر شتی تریش لەلاتان شاراوە نیە، بۆیە پێویستە مرۆڤ گرنگی بدات بە ئاینەکەی لەخۆی بترسێ کە تووشی ئەو شتانە بێت .

بینراوە کە دەڵێن بۆچی ئێوە خۆتان فێری یەکتاپەرستی دەکەن و هۆشیاری دەدەن لەبارەی هاوبەش بڕیاردانەوە ؟ لەکاتێکدا ئێوە منداڵی بیروباوەڕو خاوەنی پاکیەتین، وەلە وڵاتی یەکتاپەرستیدان، پێویست ناکات کە یەکتاپەرستی بخوێنن و جۆرەکانی هاوبەش بڕیاردان بزانن و بیناسن، وە پێویستیش ناکات پرۆگرامەکانی خوێندن سەرقاڵ بکەن بەخوێندنی پەرتووکەکانی بیروباوەڕو منداڵان فێری ئەم شتانە بکەن، ئێوە هیچ کاتێك پێویستان بەوە نیە کە گومانەکان بزانن چییەو بزانن ڕێبازە گۆڕاوو خراپەکان کامانەن و گومڕایەتیەکانیان چین، پێویستیان بەوە نیە !!

ئەوە لەخۆباییبوون و نەزانین و گومڕایەتیە، پێویستە لەسەر مرۆڤ کە ئەم بابەتانە بزانێت لەپێناوی ئەوەی خۆی بپارێزێ لە خراپەو بەڵاو ئاژاوەیان، ناتوانی خۆت لە شتێ بپارێزی کە نایزانی ونایناسی و، هەروەها ناشتوانی کە دەست بگریت بە هەق و ڕاستیەوە کە نازانی کامەیە .لەوکاتەدا حەق بە ناحەق دەبینێت و ناحەقیش بە حەق و

---

١- اخرجه البخاری ٣٦٠٦، ومسلم ١٨٤٧ عن حذیفة بن یمان رضي الله عنه.

نایزانێن کە وانیە، ئەوەش کارێکی زۆر گرنگە کە بتوانی جیایان بکەیتەوە .وە دەڵێن: ئێوە خەڵکی بە بێباوەڕ دادەنێن ! بۆچی ئەم شتانە دەردەخەن و دەیکەن ؟

لەوەڵامیاندا دەڵێین: ئێمە هیچ کەسێك بە بێباوەڕ دانانێین جگە لە کەسانێك کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بە بێباوەڕیان دانابن، بەڵام ئێمە لەخۆمان دەترسین کە تێی بکەوین بۆیە باسیان دەکەین و خۆشمان بە پاك و بێ لەکە نازانین، بۆیە هۆکارەکانی ڕزگاربوون دەگرینەبەرو بەکاریان دەهێنین، وە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەین و ئاگاداریان دەکەینەوە، وە ئێمە بەهەمان شێوە فێری ئەم مەبەستانە ئەبین لە پێناوی ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوونبکەینەوە فەرمانی ئاینەکەیان، وە بانگەوازی خەڵکیش دەکەین بۆ لای خوای گەورە لەسەر چاوپۆشنی هەتا خۆمان بپارێزین و خواش بمانپارێزێ لەهەر کەسێ لەبەندەکانی کە خۆی بیەوێ لە ڕاستیشدا ئەم کارە زۆر زۆر مەترسیدارە.

وە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامیش وەکو ڕابورد بریتیە لە خراپیەکانی و ساختەو پووچیەکانی، جا هەرکەسێك موسڵمان ببێت و شاهێدی بدات کە هیچ خودایەك نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە خودای گەورەو(محمد) یش ﷺپێغەمبەری خوایە ئیسلامەکەی و یەکتاپەرستیەکەی هەڵدەوەشێتەوە بە هەڵوەشێنەرێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام جا بزانێ یان نەزانێ پێشی دەبێتە هەڵگەڕاوەو لە ڕیزی بێباوەڕاندایە .وە هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام گەلێ زۆرە هەندێك لە زانایان گەیاندویانەتە (٤٠٠) چوارسەد دانە، بەڵام گرنگترینیانو ترسناکترینیان ئەم دە (١٠) دانەیە کە زانای پایەبەرز محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕەحمەتی خوای لێ بێ باسی کردوون، ئامۆژگاریەك بۆ موسڵمانان و ترس لەوەی تێی بکەون، وە بە تەنهاش

لەبەرئـەوە نووسـیویەتی کـە ئامۆژگاریـەك بێـت بۆیـانو بـەزەیی هاتنـەوە پیایانـداو ترسیەتی لەوەی تێی بکەون . نـەك لەبەرئـەوەی کـە موسـڵمانان بـە بێبـاوەڕ بزانێـت وەکو دوژمنەکانی دەڵێن بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی ئامۆژگاری موسـڵمانانی پـێ بکـات و بیریـان بهێنێتـەوەو فێریـان بکـات لـەپێناوی ئـەوەی کـە خۆیـانی لێ بپـارێزن و دوور بکەونەوە لێی .

**هەڵوەشـێنەری یەکـەم**: تونـدترینو مەترسـیدارترین هەڵوەشـێنەرە لـە هەڵوەشـێنەرەوەکان کـە ئـەویش بریتیـە لـە هاوبـەش دانـان بـۆ خـوا لـە پـەرستنیدا، بەرزوبڵندی هەربۆ ئەوە .

وە پەرستش لـە پەرستنەوەو لـە خـۆ بەکـەم زانـی و ملکەچـی و خۆشەویستی و نزیکبوونەوە لە خوا بەوەی بۆی داناوین وەرگیراوە، ئەمە مانای پەرستشە .

وەهەندێ لە زانایان بـەوە پێناسـەی دەکـەن کـە ( ئەوپـەڕی خۆشەویستیە لەگـەڵ ئەوپەڕی خۆ بەکەم زانینە بۆ خوای گەورە )[1] ئەمە پێناسەکەیەتی بەکورتی .

بەڵام پێناسەکەی بە فراوانی ئەوەیـە کـە شـەیخی ئیـسلام (إبـن تیمیـە) رەحمـەتی خوای لێ بێ کردوویەتی کـە ئـەویش (( نـاوێکی کۆکراوەیـە بـۆ هـەموو ئـەو کردەوانـەو گوفتارە شاراوەو نهێنیانەی کە خوای گەورە پێی خۆشن لێیان ڕازیە ))[2]

ئەمە پەرستشە بـەمانا فراوانەکـەی نـاوێکی کۆکراوەیـە بـۆ هـەموو ئـەو کردەوانـەو گوفتارە نهێنی و ئاشکرایانەی کە خوای گـەورە پێـی خۆشـن و لێـان ڕازیـە، ئاشـکرابا

[1]- انظر : مجموع الفتوی ( ١٠ / ١٥٣ )
[2]- مجموع الفتوی ( ١٠ / ١٤٩ )

لەسەر زمان و ئەندامەکانی لاشە، وە شاراوەشە لە دڵداو بریتیە لە خوا نزیکبوونەوە بەوەی بۆی بە شەرع داناوین .

وە جۆرەکانی زۆرن کە وەرگیراون لە قورئان و سوننەتەوە .

وە گوتەی ئێمەش کە دەڵێین (( بریتیە لە خۆ بەکەم زانین و ملکەچی وخۆشەویستی)) خۆبەکەم زانین و ملکەچی زۆرەملێی لێ دەردەچێت، هەموو خەڵکی بەندەی خوان باوەڕدارو بێباوەڕیان بە واتای ئەوەی کە هەموویان ملکەچن بۆ ئەو قەدەرانەی کە خوای گەورە بۆی داناون، ئەوان بەندەی خوان چۆن بیەوێ وایان لێ دەکات و ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکات، هیچ کەسێك بەدەر نیە لە بڕیارو قەدەری خوای گەورە وەکو دەفەرموێت: ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ ﴾[1]

واتە: ( بەڕاستی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە سەرجەم بە بەندێتیو خولامەتی دێنە لای پەروەردگاری بەخشەرو ملکەچ دەبن).

ئەمە بەندایەتی کردنی گشتیەو بە ویستی هیچ کەس و شتێك نیە بەڵکو بە زۆرەملێیەتیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾[2]

---

١ مریم: ٩٣
٢ آل عمران: ٨٣

واتـە: ( کـە هەرچـی لـە ئاسمانـەکانو زەویدایـە بیانـەوێ و نەیانـەوێ موسـڵمان و ملکەچی فەرمانی ئەون و هـیچ کەسـێك نـاتوانێ لـەژێر دەسـەڵاتی خـوا خـۆی لابـدات، وەهەموانیش تەنها هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە).

وە گوفتیشمان کە گوتمـان ((وە بریتیـە لـە نزیکبوونـەوە لێـی بـەوەی بـە شـەرع و ڕەوای داناوە )) ئەوەی لێی دەردەچێت کەبـە شـەرع و ڕەوای دانـەناوە لـەو شـتانەی تازەن و داهێنراون لە دیندا و خـەڵکی دەڵـێن ئێمـە پەرسـتـشی خـوا دەکـەین پێیـان و خواش داینەناون . وە گومانی تیا نیە کە نزیکبوونەوە لـە خـوای گـەورە بـەوە دەبێـت کەبە شەرعی داناوە بۆ بەندەکانی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیـەوە ﷺ، بـەڵام ئەگـەر یەکێك بێت و پەرستشێك دابهێنێت لەخۆیەوە یان لەلایـەن مامۆسـتاکەیەوە یـان فلاّنـە کەس، فیسارە کەس جگە لـە پێغەمبـەر ﷺ ئـەوە پەرسـتـشێکی داهێنـراوەو پـووچ و پەرچ کراوەیە و دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((من عمـل عمـلاً لـیس علیـە امرنـا فهـو ردٌّ ))[1] واتـە ( هەرکەسـێك هـەر کارێـك بکـات و فەرمانی ئێمـەی لەسـەر نـەبێت ئـەوا دەدرێتـەوە بەسـەر خاوەنەکەیـدا ) وە هـەروەها دەفەرموێت: (( من أحدثَ في أمرِنا هذا ما ليس منهُ فهوَ ردٌّ ))[2]

واتە ( هەرکەسێك شتێك لـەم ئاینـەدا دابهـێنێ و لـەویش نـەبێت دەگێڕدرێتـەوە بـۆ خاوەنەکەی و پەرچ دەکرێتەوە )

---

[1] اخرجه مسلم برقم ١٧١٨ / ١٨ / عن عائشة رضی الله عنها

[2] اخرجه البخاری ٢٦٩٧ . ومسلم ١٧١٨ عن عائشة رضی الله عنها .

هەروەها دەفەرموێت: (( وَإياكم ومُحدثاتِ الأُمور فإنَّ كُلّ محدثةٍ بدعة وكلّ بدعةٍ ضلالة وكلَّ ضلالةٍ في النار ))[1]

واتە ( ئاممان وریای شتە تازەكان بن كە دەخرێنە سەر ئاین، چونكە هەموو شتێكی تازە لە ئایندا داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێكیش گومڕاییە، وە هەموو گومڕاییەكیش لەناو ئاگردایە ))

ئا ئەوەیە پێناسەی پەرستش .

وە بەڵام هاوبەش بڕیاردان بریتیە لە ئەنجامدانی هەر شتێك لەجۆرەكانی پەرستن بۆ جگە لە خوای بەرزو بەڕێز .

وتمان: پەرستن چەندین جۆری هەیە كەلە قورئان و سوننەتەوە وەردەگیرێت، ئەگەر كەسێك هەر شتێك لەم جۆرانەی پەرستش بۆ جگە لە خوا ئەنجام بدات ئەوە هاوبەش دانەرەو هاوبەش دانانی گەورەو لە ریزو كۆمەڵی موسڵمانان دەرچووە، جا هەركەسێك بۆ جگە لە خوا ئاژەڵ سەرببڕێ و شتێكی لەسەر خۆی دانا كە جێ بەجێی بكات بۆ جگە لە خواو یان كڕنووش بۆ جگە لە خوا ببات و یان هاوار بۆ جگە لە خوا بەرێت لەوانەی مردوون و دیارنین و شاراوەن، یان پەنا ببات بۆ مردوان و جگە لەمانەش بێگومان هاوبەشی داناوە بۆ خوای بەرزو بەڕێز، لەبەرئەوەی پەرستشەكان بەهەموو جۆرەكانیەوە دەبێت تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجام بدرێت و بەو ئامانجەش

[1] اخرجهُ ابوداود ٤٦٠٧، والترمذي ٢٦٧٦، وابن ماجة ٤٢، وقال الترمذي : ( هذا حديث حسن صحيح ).

دروستی کردوون خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[١]

واتە: (مرۆڤ و جنۆکەم بەدی نەهێناوە تەنها بۆ پەرستش و بەندایەتیکردنی خۆم نەبێت ).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴾[٢]

واتە: ( ئەی خەڵکینە ! تەنها خوا بپەرستن و هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی نە مرۆڤ، نە دار، نە بەرد، نە بت).

١ الذاريات: ٥٦
٢ النساء: ٣٦

## بەندایەتیکردن و پەرستن دانامەزرێ تەنها بە دوو مەرج نەبێت

مەرجی یەکەم: دڵسۆزیو نیازپاکیەکی تەواو بۆ خوای بەرزو بەرێز، تا زۆر بێ خەوش و بێگەرد بێت لە هاوبەش دانان، جا ئەگەر هاوبەش دانانی تیا بوو ئەوا وەرناگیرێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾[1]

واتە: ( سوێند ئەخۆم کە بێ گومان سروش (وەحی ) کراوە بۆ تۆو بۆ ئەو پەیامبەرانەی پێش لە تۆ بوون کە ئەگەر گریمان بە هاوبەش قایل ببیت بۆ خوا ئەوا بێگومان هەموو کردەوەکانت پووچەڵ دەبێ‌و لە زیانمەندانیش دەبیت).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾[2]

واتە: ( لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئەو پەیامبەرانە سەلامی خوایان لێ بێت هاوبەشیان بۆ خوا دانابا هەموو کارەکانیان سەرجەم پووچەڵ ئەبوویەوە، باشە دەبێ حاڵی خەڵکانی تر چۆن بێت ئەگەر هاوبەش و شەریك بۆ خوا دابنێن ؟).

مەرجی دووەم: دەبێت بە گوێرەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت واتە رێك وەکو ئەو وابێت، ناشبێت شتی نوێ و تازە بهێنرێتە ناویەوە لەبەر رۆشنایی فەرموودەی خۆی کە دەفەرموێت (( هەرکەسێك هەر کارێك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا وەرناگیرێ )) واتە دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، جا هەرکەسێك هەر شتێك لە

---

[1] الزمر: ٦٥
[2] الأنعام: ٨٨

جۆرەکانی پەرستن بۆ جگە لە خوا ئەنجام بدات ئەوا هاوبەشی داناوە جا هەرچیەك بێت ئەوەی بۆی ئەنجامدراوە ئیتر بتێك بێت، بەردێك بێت، دارێك بێت، پەرییەك بێت، یان مرۆڤی زیندوو بێت یا مردوو بێت، بەهەرحاڵ هەرکەسێ جۆرێ لەجۆرەکانی پەرستش بۆ جگە لە خوا ئەنجام بدات ئەوا هاوبەشی بڕیارداوە، هاوبەش دانانیش گەورەترین تاوانە، لەبەرئەوەیە لە پێش هەموو قەدەغە کراوەکانەوە دانراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ﴾[1]

واتە: ( بەو بێباوەڕانە بڵێ وەرن با ئەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کە پەروەردگارتان یاساغی کردووە لەسەرتان کە بە هیچ شێوەیەك نابێ شتێك بکەنە هاوبەشی خوا ).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾[2]

واتە: (هەرگیز نەکەی ئەی مرۆڤ هاوتاو هاوبەش بۆ خوا دابنێیت چون ئەو تاکو تەنیاو بێ هاوتاو بێ هاوبەشە، دەنا ئەوکاتە بە سەرزەنشت کراوی و بێ یارو یاوەر دادەنیشیت).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتُلْقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَدْحُورًا ﴿٣٩﴾ ﴾[3] واتە: (هەرگیز پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا دامەنێ ئەوسا بە لۆمەکراویو دەرکراوی لە ڕەحمەتی خوا بێ یارو یاوەر تووڕ بدرێیتە ناو دۆزەخەوە بێ ئەوەی هیچ کەسێك هەبێت لێت بپرسێتەوە).

---

[1] الأنعام: ١٥١

[2] الإسراء: ٢٢

[3] الإسراء: ٣٩

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ ﴾ [١]

واتە: (جا کەوابوو تۆ لەگەڵ خوادا هاوار مەکەرە کەسێکی ترو مەیپەرستە دەنا لەڕیزی سزادراوان دەبیت).

دروست نیە بۆ هیچ کەسێك کەلە پەرستندا هاوشێوە بەکاربێنێ لەگەڵ خوادا، لەبەرئەوەی پەرستن تەنها مافی خوای بەرزو بەڕێزە، کەسی تر شایەنی ئەو پەرستنەی نیە جگە لەخوای گەورە.

کەسی وا هەیە کە هاوبەش دانان بەوە ڕاڤە دەکات کە تەنها پەرستنی بتەو بەس، وە هەرچی پەرستنی دۆستانی خواو پیاوچاکان و گۆڕەکان بە پەرستن دانانێ بەڵکو ئەوە تەنها بەکارهێنانیانە بۆ پاڕانەوەو داواکردن لە خوا وێنەی ئەوانە جا هاوبەش دانان لای ئەو کەسانە تەنها بت پەرستیەو بەس .

ئێمەش دەڵێین پەرستنی بتەکان جۆرێکە لە جۆرەکانی هاوبەش دانان بۆ خوا، وە هاوبەش دانان بانگکردن و هاوارکردنی جگە لە خوایە ئیتر بت بێت یان شتی تر، هاوبەش پەیداکەرانیش جۆراو جۆرن و کۆمەڵێکی زۆر پەرستراویان هەیە، هەیانە تەنها بتەکان دەپەرستێت و پەرستشی بۆ دەکات، هەشیانە کە خۆرو مانگ دەپەرستێ، هەشیانە شەیتانەکان دەپەرستێ، هەشیانە بەردەکانو دارەکان دەپەرستێت، هەشیانە پەریەکان دەپەرستێت، وە هەشیانە کە مەسیحو عوزێر سەلامی خوایان لێ بێت دەپەرستێت، وە هەشیانە کە دۆستانی خواو پیاوچاکان دەپەرستێت، جا ئەوان

---

[١] الشعراء: ٢١٣

جۆراو جۆرو جیاوازن لە پەرستنەکانیاندا تەنها بە پەرستنی بتەکان وازیان نەهێناوە بەڵکو بتەکان جۆرێکە لە جۆرەکانی پەرستراوەکانیان .

وە هەندێکیشیان دەڵێن هاوبەش دانان ئەوەیە کە باوەڕت وا بێت کە کەسێك هەبێت لەگەڵ خوادا دروست بکات و ڕۆزی بدات و کاروبارەکان هەڵسوڕێنێ . جا ئەگەر باوەڕت وا بوو کە کەسێ نیە لەگەڵ خوادا ڕۆزی بدات و دروست بکات و سوودو زیان بگەیەنێ ئەوا کەسێکی یەکتا پەرستی، ئێمەش دەڵێین ئا ئەم وتەیە تەنانەت هاوبەش دانەرەکانی پێشینیش شتی وایان نەوتوە و ئەوەش یەکتا پەرستیە لە پەروەردگاریەتیدا و ئەوانیش لەوانەدا هاوبەش بۆ خوا دانانێن، هیچ کاتێك باوەڕیان وا نەبووە کە بتەکانیان دەتوانن دروستکاربن و ڕۆزیدەربن و ژیەنەرو مرێنەر بن و کاروبارەکان هەڵدەسوورێنن بەڵکو تەنها بتەکانیان کردووە بە ناوەندێك لەنێوان خۆیانو خوادا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ [1]

واتە: ( شتانێك دەپەرستن جگە لە خوا کە نە سوودیان پێ دەگەیەنن و نە دەشتوانن زیانیان لێ دوورخەنەوە، وە دەشڵێن کە ئەوانە تکاکارمانن لای خوا).

نەیان وت ئەوانە دەتوانن دروست بکەن و ڕۆزی بدەن بەڵکو وتیان تکامان بۆ دەکەن لای خوا، دەبنە ناوەند لەنێوان ئێمە و خوادا، ئەم وتەیەش قسەیەکی پووچە، ئەوەش قەتیس و گەمارۆ دراوە لە هاوبەش داناندا لە یەکتاپەرستی پەروەردگاریەتیدا، بەڵکو هاوبەش دانانی خراپ و چەپەڵ لە یەکتا پەرستنی خوای تاك و تەنیادا بریتیە لە

---

[1] یونس: ١٨

ئەنجامدانی شتێك لە جۆرەكانی پەرستن بۆ جگە لە خوا، وە ئەوەش ئەو هاوبەش دانانەیە كە خوای گەورە بەندەكانی لێ ئاگادار كردووەتەوە، پێغەمبەرانیشی لەو پێناوەدا ناردووە سەلامی خوایان لێ بێت بۆ دژایەتی كردنیو جیهادیشی بە ڕەوا داناوە بۆ لادانی و نەهێشتنی، بەڵام هاوبەش دانان لە پەروەردگاریەتیدا دەتوانرێت بووترێت لەناو مرۆڤایەتیدا بوونی نیە ( چونكە هەموو كەس بوونی خوا دەسەلمێنێ تەنانەت ئەوانەش كە هیچ ڕۆشنبیریەكیان نیە لەناو دارستانەكانی ئەمەزۆن و هێڵی یەكسانیدان، كۆمۆنیست و شیوعیەكانیش ئەوەش كەبە دەم دەیڵێن بە كردەوە بە درۆی دەخەنەوە وەكو ستالینی گەورەیان كەلەناو دەریادا گیری خواردو لە شەپۆلەكانی ترسا هاواری بۆ خوا برد تا ڕزگاری بكات كە ئەمە بەڵگەیە لەسەر باوەڕبوونی بە خوا با بە كردەوەش دژایەتی بوونی بكات .. وەرگێڕ ) .

كە باوەڕی وابێت كە بتەكان توانای دروستكردن و هەڵسوڕاندن و ڕۆزیدانیان هەبێت، بەڵكو دەڵێن ئەوانە نێوەندمانن و تكامان بۆ دەكەن لای خوا، ئەو ڕاڤەیەش بۆ مانای هاوبەش دانان ڕاڤەو شیكردنەوەیەكی زۆر پووچە .

وە لە نێو خەڵكیشدا كەسانێك هەن كە هاوبەش دانان بەوە ماناو ڕاڤە دەكەن كە هاوبەش دانان تەنها ( هاوبەش دانانی دەسەڵاتداریەتیە ) جگە لەوە لەبیر دەكەن و دەڵێن: یەكتاپەرستی بریتیە لەوەی تەنها خوا بە حاكم و دەسەڵاتدار دابنێی وە هاوبەش دانانیش ئەوەیە كە دەسەڵاتدارانێك بە هاوبەش دانەر دابنرێت كە شەرعی خوا جێ بەجێ ناكەن .

ئێمەش دەڵێین ئەوە جۆرێكە لە جۆرەكانی هاوبەش دانان لەبەرئەوەی كاری یاسا دانان بەس ئیشی خوای بەرزو بەڕێزە، وە فەرمان كردنیش بەوەی خوا دایبەزاندووە

پەرستشە، بەڵام هاوبەش بۆ دانان تەنها لەم جۆرەدا كۆبووەتەوە؟، بەڵكو هاوبەش دانان گشتگیرترە لە هاواركردن و پاڕانەوەو سەربڕین و لەسەرخۆپێویستكردن و داوای فریاكەوتن دەگرێتەوە، بەڵام ئەم هەموو جۆرە كۆبكرێتەوە لە جۆرێكداو بووترێت ئەوە هاوتادانانە ئەوە هەڵەو گومڕا كردنە، جا دروست نیە كە ئەم بیركردنەوە بچێتە ناو بیرو هۆشی فێرخوازی زانست تەنها خەڵكانێك وا بیر دەكەنەوە كە لە پشت ئەوەوە مەبەستی خۆیانیان هەیە، جا ئەگەر كەسێك فەرمان بكات بە شەریعەت و بەسەر خەڵكدا و لەناو دەوڵەتدا جێ بەجێی بكات بەڵام لەهەمان كاتدا هاوار بكاتە جگە لە خوا ئەوا هاوبەش دانەرە، پوختە ئەوەیە كە پێویستە بزانین كامەیە مانای هاوبەش دانان لەبەرئەوەی ئەمان ڕاڤەی دەكەن بە ماناو ڕاڤەیەك كە وا نیە، ئەگەر بێیت و لە قورئان ورد بیتەوە دەبینیت كە تەنها مانا و واتای هاوبەش دانان بریتیە لە پەرستنی جگە لە خوا، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾[1]

واتە: ( ئەوانە جگە لە خوا دەپەرستن لە كاتێكدا نە سوودیان پێ دەگەیەنن و نە زیانیشیان لێ دوور دەخەنەوە، دەڵێن ئەوانە تكامان بۆ دەكەن لای خوا).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾[2]

---

[1] یونس: ١٨

[2] سبأ: ٢٢

واتە: ( ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ ئەوانەی وا پێتان وابوو کە خوان و ئەتان پەرستن جگە لە خوا دە ئێستا داوایان لێ بکەن با خێرو خۆشیتان بۆ فەراهەم بێنن و بەڵاو نەهامەتیتان لێ دوور بخەنەوە، خۆ ئاشکراشە بە ئەندازەی پروشێك دەسەڵاتیان نیە نە لە ئاسمانەکان و نەلە زەویدا تا هاوکاریتان بکەن).

ئەوە هاوبەش دانانە لە پاڕانەوەدا، وە هەروەها سەربڕینیش بۆ جگە لە خوا وەکو دەفەرموێت: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ ﴾[1]

واتە: (جا نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت، وەلە سوپاسی ئەو هەموو چاکەدا هەر بۆ ئەو قوربانی سەر بڕە، واتە وەکو قورەیش مەبە کە ئاژەڵیان هەم بۆ خوا و هەم بۆ بتەکانیان سەردەبڕی، نەخێر دەشێ تۆ تەنها قوربانی بۆ خوا بکەیت).وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾[2]. واتە: ( بڵێ بە ڕاستی نوێژو حەج و قوربانی و ژیان و مردنم هەموو هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە کە هیچ هاوەڵێکی بۆ نیە وە هەربەوەش فەرمانم پێ دراوە دەبێ هەر بۆ خوا بژیم و بمرم دیارە یەکەم کەسیشم لە ڕیزی موسڵمانانی ئەم ئوممەتەدا).

سەربڕین و نوێژکردن بۆ جگە لە خوا هاوبەش دانانە و هاوبەش بڕیاردانیش زۆر جۆری هەیە .ئەوەی کە ڕێکیان دەخات ئەوەیە کە هەرکەسێك شتێك لە جۆرەکانی پەرستن بۆ جگە لە خوا ئەنجام بدات ئەوە هاوبەش دانەرە.

---

[1] الكوثر: ٢

[2] الأنعام: ١٦٢ – ١٦٣

## هاوبەش دانانیش دوو جۆرە

جۆری یەکەم: هاوبەش دانانی گەورە:

جۆری دووەم: هاوبەش دانانی بچووک .

هاوەڵ دانانی گەورە: بریتیە لە ئەنجامدانی هەر شتێك لە جۆرەکانی پەرستن بۆ جگە لە خوا وەکو ڕابورد .

ئەم جۆرەیان خاوەنەکەی دەکاتە دەرەوە لە ڕیزی موسڵمانان وە قەدەغەشی دەکات کە بچێتە بەهەشتەوە و بەهەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا دەیهێڵێتەوە و هەموو کردەوەکانی پووچەڵ دەکاتەوەو خوێن وماڵی بە حەڵاڵ دادەنێ، ئەم جۆرەیان خراپە لە چەندین ڕووەوە: یەکەمیان: وا لە خاوەنەکەی دەکات کە بێباوەڕ و هاوبەش دانەر بێت بۆ خوا .

دووەمیان: هاوبەش دانەر خوای گەورە بەهەشتی لەسەر قەدەغە کردووە و شوێنیشی ئاگرەو ستەمکارانیش یارو یاوەریان نیە تا بێت بە هانایانەوە . وە قەدەغە کردنیش بە واتای (( ڕێگرە لە چوونە ناو بەهەشتەوە ڕێگریەکی تەواو هەتا هەتایی )) . لەبەرئەوەش فەرموویەتی: ﴿وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾ [1] شوێنی ئاگرە، لە کاتێکدا کە بەهەشتی لەسەر قەدەغە کرا ئاگری دۆزەخ بوو بە شوێنی هەتا هەتایی و ناشتوانێ لێشی دەرچێت و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە پەنا دەگرین بە خوا لێی.

---

[1] المائدة: ٧٢

سێیەمیان: خوای گەورە لێخۆشبوونی لەسەر هاوبەش دانەر قەدەغە کردووە، وەکو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾[1]

واتە: (بێگومان خوا لە دانانی هاوبەش بۆی نابورێ و لەخوار ئەوە لەهەر کەسێك دەبووری خۆی ویستی لێی بێت).

جا ئەگەر هاوبەش پەیداکەر مرد لەسەر هاوەڵدانان ئەوا بەشی لە لێخۆشبوونی خوای پەروەردگاردا نیە تا نەگەڕێتەوە لەو کارەی، لێخۆشبوونیش لە دوای گەڕانەوە دێت بۆ کەسێ خوا ویستی لەسەر بێت بەتایبەتی بۆ ئەو تاوانانەی کە ناگەنە پلەی هاوبەش دانان بۆ خوا ﴿ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾[2] لە جگە لە هاوبەش دانان بۆ خوا خۆش دەبێت گەر ویستی لێ بێت، وەکو داوێن پیسی و دزی و ئارەق خواردنەوەو جگە لەوانەش لە قەدەغە کراوەکان و گوناهە گەورەکان کە ناگەنە پلەی هاوبەش دانان لەژێر ویستی خوادایە ئەگەر بیەوێ لە خاوەنەکانیان خۆش دەبێت وە ئەگەر ویستیشی لێ نەبێ ئەوا بەگوێرەی تاوانەکانیان سزایان دەدات لە ئاگری دۆزەخدا و پاشان دەریان دەهێنێ دەیانخاتە ناو بەهەشتەوە لەبەر بوونی باوەڕو یەکتاپەرستیەکەیان، ئەوانە پێیان دەگوترێت ((سەرپێچی کارانی ناو یەکتاپەرستان))، بەڵام ئەگەرلێیان خۆش نەبێت ئەوا بە هەتا هەتایی لەناو ئاگردا نامێننەوە وەکو چۆن بێباوەڕان‌و بت پەرستان و هاوبەش دانەران دەمێننەوە تیایدا .

---

[1] النساء: ٤٨

[2] النساء: ٤٨

**<u>چوارەمیان</u>**: هاوبەش دانان دەبێتە هۆی پووچەڵ کردنەوەی هەموو کردەوەکان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾[1]

واتە: (بێگومان وەحی کراوە بۆ تۆو بۆ ئەو پێغەمبەرانەی لەپێش تۆوە بوون کە ئەگەر گریمان بە هاوبەش ڕازی ببیت بۆ خوا ئەوا بێگومان هەموو کردەوەکانت پووچەڵ دەبیٚو لە زیانمەندانیش دەبیت، بەڵکو دەبێت تەنها خودا بپەرستی و لەگەڵ سوپاس گوزارانیشدابیت).

لەبەرئەوەشە کە دەڵێن هاوبەش دانان کردەوەکان پووچ دەکاتەوەو هەڵیدەوەشێنێتەوە هەروەکو چۆن کاتێك مرۆڤ پیسایی دەکات یان بای لیٚ دەبێتەوە و کاری سەرجێیش لەگەڵ حەلاڵی خۆیدا ئەنجام دەدات پاکیەتی نامێنیٚ و دەستنوێژی دەشکێت .

جا مرۆڤ ئەگەر دەستنوێژی گرتو ئەوانەی لە پێشەوە باسم کرد لێی ڕوو بدات ئەوا دەستنوێژەکەی دەشکێت، بە هەمان شێوەش ئەگەر مرۆڤێك شایەتمانی هێناو وتی ((أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَ أشهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله)) و پاشان هاوبەشی دانا بۆ خوا هاوبەش دانانی گەورە ئەوا شایەتمانو یەکتاپەرستیەکەی هەڵدەوەشێتەوەو کردەوەکانیشی پووچەڵ دەبنەوە، لەبەرئەوە هاوەڵدانان کردەوەکان پووچەڵ دەکاتەوە هەروەکو چۆن ئەوانەی کە ڕابورد بەسەر مرۆڤدا دێت پاکیەتی هەڵدەوەشێتەوە، وە خوای گەورە لە دوای ئەوەی باسی هەندیٚ لە پێغەمبەران

---

[1] الزمر: ٦٥ – ٦٦

سەلامی خوایان لێ بێ دەکات لە سوورەتی ئەنعامدا دەفەرموێت: ﴿وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ﴾[1]

واتە: (لە پێش ئیبراهیمیشدا نوحمان ڕێنمایی کردو بوویە پێغەمبەر، وە لە ناو نەوەکانی ئیبراهیمیشدا داوودو سولەیمان سەلامی خوا لە هەموویان). تا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾﴾[2] واتە: (لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بوایە ئەو پێغەمبەرانە هاوبەشیان بۆ خوا دانابا هەموو کارو کردەوەکانیان سەرجەمی پووچەڵ دەبوویەوە، ئەی دەبێ حاڵی خەڵکانی تر چۆن بێت ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێن ؟).

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوانە پەیامبەر بوون بەڵام ئەگەر بوایە هاوبەشیان بۆ خوا دانابایە ئەوا هەموو کردەوەکانیان پووچەڵ دەبوویەوە، هەروەکو چۆن خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ ئەگەر وا دابنێین تۆش هاوبەشت بۆ خوا دانایە ئەواهەموو کارەکانت پووچەڵ دەبوویەوە )) .

هیچ کردەوەیەك کە مرۆڤ کردوویەتی سوودی نیە لەگەڵ هاوبەش داناندا بۆ خوا یان لە پێشدا کردبێتی‌و تەوبەی نەکردبێ لێی لەبەرئەوەی هاوبەش دانان کردەوەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەگەر لەسەر ئەوەش مرد ئەو لەوانە دەبێت کەلە ناو ئاگردان بۆ

---

[1] الأنعام: ٨٤

[2] الأنعام: ٨٨

هەتا هەتایی تیایدا دەمێنێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( مَنْ ماتَ وَهوَ يَدعو مِنْ دونِ الله نِداً دَخَلَ النار، وَقُلتُ أنا[1] وَمَن ماتَ وهوَ لايَدعو لله نِداً دَخَلَ الجنَّة ))[2]

واتە (( هەرکەسێك بمرێت و لەگەڵ خوادا هاوار بکاتە کەسێکی تر دەچێتە ئاگرەوە، وە منیش دەڵێم هەرکەسێك بمرێت و لەگەڵ خوادا هاوار نەکاتە کەسێکی تر دەچێتە بەهەشتەوە ))

پێنجەمیان: هاوبەش دانان خوێن و ماڵی هاوبەش دانەر حەڵاڵ دەکات و پێویستی دەکات کەجیهادی دژ بکرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( أُمرتُ أن أُقاتلَ النَاسَ حتى يَقولُوا – لاإله إلا الله – فإذا قالوها عَصَموا مِنِّي دِماءهُم وأموالَهُم إلاّ بِحقِها وحِسابهُم على الله ))[3]

واتە (( فەرمانم پێ کراوە کە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا دەڵێن هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله جا ئەگەر وتیان ئەوا خوێن و ماڵیان لای من پارێزراو دەبێت، مەگەر کارێك بکەن ئیسلام حەقی خۆی لێیان بوێت وەکو ئەوەی پیاوێ بکوژێت بە ناهەق ئەوا خوێنی حەڵاڵ دەبێت، یان دزی بکات، وە لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە )) .خوێن و ماڵ پارێزراو نابێت مەگەر بە یەکتا

---

١- اي الراوي عبدالله بن مسعود رضي الله عنه وقد جاء قوله هذا مرفوعاً عن النبي ﷺ من حديث جابر، رواه مسلم ( ٩٣ )

٢- أخرجه البخاري ٤٤٩٧، ومسلم ( ٩٢ ) عن عبالله بن مسعود.

٣- أخرجه مسلم (٢١) من حديث ابي هريرة رضي الله عنه وقد اخرج نحوه بذكر الصلاة والزكات ، البخاري (٢٥) ومسلم (٢٢) من حديث ابن عمر رضي الله عنهما.

پەرستی، بەڵام هاوبەش دانان خوێن و ماڵی ئەو کەسە حەلاڵ دەکات کە ئەنجامی دەدات بەشەر کردن لەگەڵیاندا.

ئا ئەوە هاوبەش دانان و ئەوەش ئەو سزایانەی کە بە هۆی ئەنجامدانیەوە لەسەری دەکەوێ لە دونیاو دواڕۆژدا، وە گەلێك جۆری هەیە گەورەترینیان پاڕانەوەیە جگە لە خوا، وە هاوارکردنو داوای فریاکەوتن جگە لە خوا لەوەی کە جگە لە خوا توانای کردنیو ئەنجامدانی نیە، وە سەربڕین بۆ جگە لە خوا، وە کڕنووش بۆ جگە لە خوا وە لەسەرخۆ پێویستکردن بۆ جگە لە خوا، وە چەمینەوە بۆ جگە لە خواو جگە لەمانەش، جا هەرکەسێك شتێك لە جۆرەکانی پەرستن بۆ جگە لە خوا ئەنجام بدات ئەوە هاوبەشی گەورەی داناوە بۆ خوا .

<u>جۆری دووەم</u>: هاوبەش دانانی بچووك: بریتیە لەوەی کەلە قورئانو سوننەتدا هەیە کە ئەوە هاوەڵدانانی بچووکەو بەڵگەکان لەسەر ئەوەن کە ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات لە ڕیزی موسڵمانان دەرناچێت . ( بەڵام دەبێت ئاگاداربین کە هاوبەش دانانی بچووك لە زینا کردنو پیاو کوشتنو دزی کردن گەورەترە .. وەرگێڕ ) .

<u>دەشبێت بە دوو جۆرەوە:</u>

جۆری یەکەم: هاوبەش دانانی بچووك لە دەربڕیندا:

وەکو سوێند خواردن بە جگە لە خوا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( مَن حَلَفَ بغَيرِ الله فقد كَفَرَ أو أشركَ ))[١] واتە (( هەرکەسێ سوێند بە جگە لە خوا بخوات ئەوا بێباوەڕ بووەو هاوەڵی داناوە بۆ خوا)) وێنەی ئەوەی بڵێت (خوا نەبوایەو تۆ) (ئەوەی خوا ویستی لێ بێو تۆش بتەوێت) ئەمە هاوبەش دانانە لە دەربڕیندا .

---

١- أخرجه أحمد (٤٩٠٤) والترمذي (١٥٣٥)، وابو داود (٣٢٥١) فقال الترمذي ( هذا حديث حسن)، والحاكم ( ١/١٨) و (٤/٢٩٧) وصَحَحَهُ من حديث عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما).

جۆری دووەم: هاوبەش دانانی شاراوە کە لە دڵدایە . ئەمەشیان چەندین جۆرە:

لە دیارترینیان ڕووپامایيە کە بریتيە لە دەرخستنی ئەوەی خۆی دەیەوێت لە کردەوەکان، ئەمەش دەبێتە دوو جۆرەوە:

١-ڕووپامایی دووڕووەکان ئەوانەی کە لە بنەوەی ئاگری دۆزەخدان ئەوانەی کە کردەوەکانیان وا پیشانی خەڵکی دەدەن کە باوەڕدارن بەڵام لە دڵەوە بێباوەڕن، ئەمەیان پەنا بە خوا ڕووپامایی بێباوەڕیە، لەبەرئەوەی خاوەنەکانیان باوەڕیان بە خوای بەرزو بەڕێز نیە، بەڵکو تەنها لەبەرئەوە کردەوەی چاك دەکەن تا بەرژەوەندی دونیایان دەست بکەوێت .

٢-ئەو ڕووپامایيەی کە موسڵمان ئەنجامی دەدات . پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو کاتێك چوو بۆ لایان و ئەوان باسی دەجالیان دەکرد لە نێوان خۆیاندا (( ألا أُخبِرُكُم بما هوَ أخوَفُ عليكُم عندي منَ المسيح الدجال ؟ )) قالوا بلى يا رسول الله ﷺ قال: ((الرِّياء، يقومُ أحدهم فَيُصلي ويزينُ صلاتهُ لما يرى من نَظَرِ رجُلٍ إليه))[١]

واتە (( ئایا هەواڵتان نەدەمێ بەوەی کە لای من لە مەسیحی دەجال ترسناکترە کە تووشتان ببێ ؟ فەرموویان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ڕووپامایيە، کە یەکیان هەڵدەسێ نوێژ دەکات ئەوەندە نوێژەکەی بە جوانی دەکاتو دەیڕازێنێتەوە تا پیاوێك سەیری بکاتو سەری سووڕ بمێنێ لەو نوێژە کە کردوویەتی)) شتی ئاوا لە موسڵمان و ئیمانداریش دەوەشێتەوە کە بیکات، ئەگەر بینی شتێك لەو ڕووپامایيە لە خۆیدا هەیە هەوڵ بدات بەرگری بکات و بگەڕێتەوە بۆ دڵسۆزیەکەی بۆ خوای بەرزو بەڕێز ئەوا زیانی پێ ناگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بەردەوام بێت لەسەری و

---

١- أخرجه أحمد (١١٢٥٢)، وابن ماجة (٤٢٠٤)، والحاكم (٣٢٩/٤)، وصححه الحاكم وحسنه الالباني .

لەگەڵیدا بێت لە سەرەتای کارەکەیا یان لەناو کارەکەیدا تووشی ببیٚ‌و بەردەوامیش بێت لەسەری ئەوا لەو حاڵەتەدا کردەوەکەی هەڵدەوەشێنێتەوەو پووچەڵی دەکاتەوە بە پێی بەهێزترین بۆچوونی زانایان، وە هەروەها لەبەر ناوبانگ دەرکردنیش کردەوە بکات هەر خراپە ئەوەش بەوە دەبێت کە زیکرو قورئان بخوێنێتەوە لەبەرئەوەی کە خەڵکی گوێیان لیٚ بیٚ و بە شانو باڵیدا هەڵبدەن، لەو کارەشیدا دەکەوێتە خوێندنەوەی هەموو شتیٚ ڕەوا بێت یان ڕێگە پیٚ نەدراو بێت بەس لەبەرئەوەی کاتیٚ خەڵکی گوێیان لیٚ دەبێت بە باشە باسی بکەن و پیایدا هەڵبدەن،

یان هەر لە دڵیدا دروست بێت کە خەڵکی باسی بکەن بە باشە ئەوە هاوبەش دانانی بچووکە .

وە هەروەها لە هاوبەشیٚ دانانی شاراوەیە کە مرۆڤ لە کردنی کارەکانیدا مەبەستی دونیا بێت، کردەوەی باش دەکات مەبەستی بەرژەوەندی دونیایە کە دەستی بکەوێت هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ﴾[1]

واتە: (هەرکەسێك تەنها ژیانی ئەم دونیایەو جوانیەکانی بویٚ و پاشەڕۆژ پشتگویٚ بخات، ئەوا ئێمە هەر لەم دونیایەدا بە تێرو تەسەلی پاداشتی گشت هەوڵ و کردەوە چاکەکانیان وەکو سەردانی خزمان و... هتد، دەدەینەوە بە تەندروستیی‌و ئاسوودەیی‌و ڕۆزی‌و ناوو ناوبانگی دونیا هیچیشیان لیٚ کەم ناکرێتەوە، ئەوانە لە دواڕۆژدا جگە لە ئاگر هیچ بەش و بەهرەیەکیان نیە).

جا هەرکەسێك بەندایەتیەك بکات و مەبەستی دەستکەوتنی بەرژەوەندی دونیایی بێت، وەك ئەوەی خۆی فێری زانستی شەرعی دەکات بۆ دەستکەوتنی دونیا، بەڵام

[1] هود: ١٥ – ١٦

ئەگەر كەسێك خۆی فێری زانستی دونیایی بكات تا بە هۆیەوە خۆی لەسەر بژیەنێ وەكو فێربوونی پیشەو كارێك وەكو ژمێریاری‌و پیشەسازی‌و خوێندن و هتد هیچ تاوانبار نابێت چونكە ئەوانە هۆكاری بژێوی ڕێگە پێدراون و بە پەرستش ناژمێردرێ، بەڵام ئەگەر كەسێك نوێژ بكات یان جیهاد بكات یان فێری زانستی شەرعی بێت و حەج بكات لەبەر دەستكەوتنی بەرژەوەندیەكی دونیایی ئەوا نابێت چون هەریەك لەوانە پەرستنەو بۆ جگە لە خوا نابێ ئەنجام بدرێت لەژێر ئەو ئایەتەی سەرەوەدا جێی دەبێتەوە كە باسمانكرد ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ١٥ ﴾[١] هەڕەشەیەكی زۆری لەسەرەو جۆرێكیشە لە جۆرەكانی هاوەڵدانان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( تعیسَ عبدالخمیصة، تعیس عبدالخمیلة، تعیس عبدالدینار والدرهم إن أُعطي رضي وإن لم يُعط لم يرضى ))[٢]

واتە (( تیا بچن بەندەی دینارو درهەم پۆشاك‌و جوانیەكانی دونیا ئەگەر پێی بدرێت ڕازی دەبێت بەڵام ئەگەر پێی نەدرێت ڕازی نابێت . ئەوەش جۆرێكە لە هاوبەش دانان بۆ خوا، جا پێویستە مرۆڤ كارەكانی بە دڵسۆزی ئەنجامبدات بۆ خوا ئەگەر شتێكیشی بۆ هات لە دونیاو خۆشیەكانی ئەوە ڕۆزیەكە لە لایەن خواوە بۆی هاتوە، بەڵام ئەگەر بێت كردەوەی دوارۆژ ئەنجامبدات بۆ ئەوەی دونیای دەست بكەوێت ئەوەیە كە لۆمە كراوەو لە هاوبەش دانانیشەو هەڕەشەی توندی لەسەرە، بۆیە لەسەر موسڵمان پێویستە كردەوەكانی تەنها لەبەر خوا ئەنجام بداتو مەبەستی هەر ئەو بێت .

---

[١] هود: ١٥

٢- أخرجه البخاري ((٢٨٨٦)) من حديث ابي هريرة رضي الله عنه

**گەلێك جیاوازی هەیە لە نێوان هاوبەش دانانی گەورەو بچووكدا كە بریتین لە**

١-هاوبەش دانانی گەورە خاوەنەكەی لە ڕیزی موسڵمانان دەكاتە دەرەوە، بەڵام هاوبەش دانانی بچووك خاوەنەكەی لە ڕیزی موسڵمانان ناكاتە دەرەوە بەڵكو تاوانێكی گەورەیەو لە گوناهە گەورەكانە، وە هۆكاریشە بۆ ئەوەی هاوبەش دانانی گەورە ئەنجام بدات.

٢-هاوەڵدانانی گەورە هەموو كردەوەكان هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە هاوبەش دانانی بچووك ئەگەر ڕووپامایی بێت یان بۆ ناوبانگ دەركردن بێت تەنها ئەو كردەوەیەی پێ هەڵدەوەشێتەوە كە تێی كەوتووە و كردەوەكانی تر پووچەڵ ناكاتەوە كە بۆ ڕووپامایی نەبووە و تیای نیە .

٣-هاوبەش بڕیاردانی گەورە خوێن و ماڵ حەڵاڵ دەكات بە پێچەوانەی بچووكەكەوە كە نە خوێن و نە ماڵی مرۆڤ حەڵاڵ ناكات چونكە لە بازنەی ئیسلام دەری ناكات و هەر موسڵمانە .

زانایانیش جیاوازیان هەیە لەوەدا كە ئایا هاوەڵدانانی بچووكیش وەكو هەموو تاوانەكانی تر دەكەوێتە بەر لێخۆشبوون جگە لە هاوبەش دانانی گەورە یان ئەویش ناكەوێتە بەر لێخۆشبوون، لەبەرئەوەی خوای گەورە بەشێوەیەكی گشتی باسی كردووەو فەرموویەتی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ ﴾[1]

واتە: (خوای گەورە لەوە خۆشنابێت كە هاوبەشی بۆ پەیدا بكرێت).

ئەمەش هەردوو جۆرەكە دەگرێتەوە، گەورەو بچووك لە هاوبەش دانان . بەڵام جیاوازیان هەیە چونكە هاوبەش دانانی گەورە خاوەنەكەی بە هەتا هەتایی لە ئاگری

[1] النساء: ٤٨

دۆزەخدا دەهێڵێتەوە بە پێچەوانەی هاوبەش دانانی بچووکەوە کە خاوەنەکەی بە هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا ناهێڵێتەوە، بەڵکو دەبێت سزا بدرێت و لێخۆشبوونیش نایگرێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بۆ هەتا هەتایی لە دۆزەخدا نامێنێتەوە .

ئەمانەش چەند جیاوازیەك بوون کەلە نێوان هاوبەش دانانی گەورەو بچووکدا بوون وە هەر هەمووشیان مەترسیدارن هیچ پەناو هێزێ نیە جگە لەپەناو هێزی خوا نەبێت).

ناشوترێت ئەمە هاوبەش دانانی بچووکەو مرۆڤ ئاسانکاری تیا بکات لەبەرئەوەشە عبدالله ی کوری مەسعود ﷺ دەفەرموێت (( لإن أحلفَ بالله كاذباً أحبُّ إليّ أنْ أحلَفَ بغَيرهِ صادِقاً ))[1]

واتە (( ئەگەر بێت سوێند بە درۆ بخۆم بە خوا پێم خۆشترە لەوەی سوێند بە جگە لە خوا بخۆم و ڕاست بکەم )) لەبەرئەوەی خراپی درۆکردن کەمترە لە خراپی هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە .

---

١- أخرجه عبدالرزاق في المصنف (١٥٩٢٩)، والطبراني في الكبير (٨٩٠٢)، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد (١٧٧/٤) : رجا له رجاك الصحيح .

**چەندین گومانیش هەیە کە گۆڕپەرست و دۆستانی خواو پیاوچاکان پەرستانی ئەمڕۆ دروستی دەکەن خەڵکی پێ چەواشە دەکەن، لەوانە**

( هاوبەش دانان بەس بە بت پەرستی دەگوترێت )، بەڵام ئەوەی جگە لە بت دەپەرستێ وەکو دۆستانی خواو پیاوچاکان ئەوە هاوبەش دانان نیە بۆ خوا بەڵکو ڕێگایەکە بۆ نزیکبوونەوە لە خوا، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾[1]

واتە (( بۆ نزیکبوونەوە لە خوا هەر هۆکارو شتێ بە باش دەزانن بیگرنە بەر ))
وەلامی ئەم گومانەش ئەوەیە کە ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ جەنگا لەگەڵیاندا هەیانبوو بتیان دەپەرست و هەشیانبوو داروبەردی دەپەرست وەهەشیانبوو فریشتەکانیان دەپەرست، وە هەشیانبوو دۆستانی خواو پیاو چاکانیان دەپەرست، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾[2]

واتە: (جگە لە خوا دەپەرستن لە کاتێکدا کە ئەو پەرستراوانە ناتوانن زیانیان لێ دووربخەنەوەو سوودیان پێ بگەیەنن وە دەشڵێن ئەوانە تکاکارمانن لای خوا).

هەروەها گاورەکانیش عیسایان پەرست سەلامی خوای لێ بێت، خۆ ئەوانە بتیان نەدەپەرست بەڵکو عیسایانﷺ دەپەرست تا ئێستایش هەر دەیپەرستن، ئایا دەوترێت ئەوانە هاوبەشیان دانەناوە بۆ خوا لەبەرئەوەی ئەوانە بت ناپەرستن ؟ کێ وا

[1] المائدة: ٣٥
[2] یونس: ١٨

دەڵێت ؟ هاوبەش دانان بریتیە لە پەرستنی جگە لە خوا ئیتر هەركەسێك بێت و هەر شتێك بێت .

هاوبەش دانەرانی یەكەمینەكان و پێشین هاوبەش دانانەكەیان بەس ئەوە نەبوو كە بتەكان بپەرستن بەڵكو ئەوان جیاوازبوون لە پەرستنەكانیاندا هەروەكو زانای پایە بەرز لە پەرتووكەكەیدا ((كشف الشبهات)) وە لە ((القواعد الاربع))دا باسی كردووە، وە ئەوەش كە پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵكانێكدا دەركەوت پەیدا بوو كەلە پەرستنەكانیاندا جیاوازبوون لەگەڵ ئەوەشدا دژایەتی هەموویانی كردوو جەنگا لەگەڵیاندا و جیاوازی لەنێوان هیچ كامێكیانا نەكرد، جیاوازی نەكرد لە نێوان كەسێكدا كە بتی دەپەرست لەگەڵ كەسێكدا كە (( گۆڕ یان دار یان بەرد یان دۆستێ لە دۆستانی خوای دەپەرست)) بەڵكو لەگەڵیاندا جەنگاو جیاوازی نەكرد لە نێوانیاندا، جیاوازی نیە لە نێوان كەسێك كە بت یان دار یان بەرد یان فریشتە یان پەری یان مرۆڤ بپەرستێ، ئەوەش زۆر ڕوون و ئاشكرایە .

وە لە گومانو دوودڵیەكانیان دەڵێن: (ئێمە پیاوچاكانو دۆستانی خوا ناپەرستین لەبەرئەوەی سوود دەگەیەنن یان زیان دەگەیەنن بەڵكو لەبەرئەوە دەیانپەرستین تا تكامان بۆ بكەن لای خوای گەورە)، لێیان نزیك دەبوونەوە بە گومانی خۆیان بە سەربڕین بۆیان و لەسەرخۆپێویستكردن و داوای فریاكەوتن لێیان تا ئەوانە تكایان بۆ بكەن لای خوا، بەڵام هاوبەش دانەرە كۆنەكان باوەڕیان وابوو كە ئەم شتانە سوودو زیان دەگەیەنن جگە لە خوای بەرزو بەڕێز، دەڵێن: ( ئێمە ئەو باوەڕەمان نیە و دەشزانین كە ئەوانە نە سوود دەگەیەنن نە زیان، بەڵام وەكو تكاكار وەرمانگرتوون و بەس) .

وەلأمی ئەم گومانەش ئەوەیە کە خوای گەورە لەبارەی هاوەڵدانەرە کۆنەکانەوە باسی کردووە ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ ﴾ [1]

واتە: (جگە لە خوا دەپەرستن لە کاتێکدا کە ئەو پەرستراوانە ناتوانن زیانیان لێ دوورخەنەوەو سوودیان پێ بگەیەنن وە دەشڵێن ئەوانە تکاکارمانن لای خوا).

جیاوازی نیە لە نێوان هاوبەش دانانی ئەوانەو هاوبەش دانانی کۆنەکاندا، هەرهەموویان مەبەستیان تکا کردنە بۆیان کە تکایان بۆ بکەن ئەم پەرستراوانە، تکاکردن حەق و ڕاستە بەڵام ئەوە ڕێگای بەدەست هێنانی نیە بەڵکو چەندین ڕێگەی ڕەوا هەیە کە خوای گەورە و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونیان کرووەتەوە، لە ڕێگە ڕەواکەی نیە کە تکاکار بکرێتە خواو ئاژەڵی بۆ سەرببڕدرێت و شتی بۆ لەسەرخۆ پێویستبکرێت و داوای فریاکەوتنی لێ بکرێت، ئەوەیە کرداری هاوەڵدانەرە کۆنەکان و جیاوازی نیە .

وەلە گومانەکانی تریان دەڵێن: ( هاوبەش دانەرە پێشینەکان ناڵێن هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە الله شایەنی پەرستن بێت بەڵام ئەوانەی کە هاوار دەکەنە دۆستانی خواو پیاوچاکان و دەیانپەرستن دەڵێن (هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگەلە الله و محمد ﷺ یش نێردراوی خوایە ) جا چۆن ئەوەی نایڵێتو ئەوەش دەیڵێ هەروەکو یەك وایەو بەیەکچاو سەیری دەکەن ؟) .

دەڵێین: پاکو بێگەردی بۆ خوا، ئەوانە وتیان ( لا إله إلا الله محمد رسول الله ) بەڵام هەڵیانوەشاندەوە، وە ((لا اله الا اللـه)) سوودی چیە ئەگەر لە هەڵوەشێنەرەوەکان نەیپارێزێ، ئەوانە دەریانبڕی بە زمانیان بەڵام بە کردەوەی هاوەڵدانان بۆ خوا

---

[1] یونس: ١٨

هەڵیانوەشاندەوە، مانای ((لااله الا الله)) چیە؟ ماناکەی ئەوەیە کە هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە الله، ئەوانە ئەم وشەیە دەڵێن بەڵام کردەوەی پێ ناکەن .

ئەمانە گۆڕەکان و دۆستانی خواو پیاوچاکان دەپەرستن‌و دەشڵێن ((لااله الا الله))، هاوبەش دانەرە پێشینەکان زۆر شارەزاتر بوون بە واتاو مانای ((لااله الا الله))، لەبەرئەوەی کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون ... ((قولوا: لااله الا الله )) قالوا: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ۝٥ ﴾[1] واتە: ((( بلێن لااله الاالله )) وتیان ( محمد دەیەوێ خواکان بکات بە یەك)). دەیانزانی مانای ((لااله الا الله))، وە هەرکەسێکیش بیڵێ دەبێت پەرستنی جگەلە خوا وازلێبێنێ، ئەو خەڵکە لە نەزانین و گێلیەتیان لەنێوان هەردوو هەڵوەشێنەرەوەکەدا کۆبەندیان کردووە، لەنێوان (لااله الاالله )و پەرستنی جگە لە خوا

(( واتە ئەو و ›یەش دەڵێن بەڵام پەرستن بۆ جگە لە خواش دەکەن ئەمە نەفامیەتی موسڵمانی نەزانی ئەم سەردەمەیە..وەرگێڕ )) .

ئەمانە هیچ کات بە ئەندازەی هاوبەش دانەرەکانی کۆن لە مانای ((لااله الا الله)) تێنەگەیشتوون، ئەوەیە ئەوپەڕی گێلیەتی و نەفامی ( ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم )، بەڵام ئارەزوو پەنا بە خوا مرۆڤ دەخاتە گومڕاییەوە .

وە لە گومانەکانی تریان دەڵێن: ( هاوبەش دانەرانی پێشین دارو بەردو بێگیانیان دەپەرست بەڵام ئێمە هاوار دەکەینە پیاوچاکان و دۆستانی خواو دەیانکەینە نێوانی خۆمان‌و خواو بە هۆیانەوە لێی نزیك دەبینەوە چونکە ئەوان ڕێزێکیان هەیە لای خوای

---

[1] ص: ٥

گەورە، خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓا۟ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ ﴾[1]

واتە: (ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە دەبێ لە نافەرمانی خوا خۆ بپارێزن‌و بەردەوام بە فەرمانی بن، بۆ نزیكبوونەوەشتان لە خوا هەرهۆكارو كردەوەیەك دەزانن نزیكتان دەكاتەوە لە و بیگرنەبەر تاڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنن).

ئێمەش وەكو هۆكارێك گرتوومانەتەبەر و ڕێگایەكن بۆ نزیكبوونەوە لە خوا

لەوەڵامیاندا دەڵێین: ڕێگای نزیكبوونەوە لە خوا لە قورئاندا بریتیە لە گوێڕایەڵی و پەرستش، ئـەوەیش دەیگەیـەنێ بـە خـوا بەگوێڕایـەڵی كردنـی‌و جێبـەجێكردنی فەرمانەكانی و وازهێنان لە قەدەغەكراوەكانی، ڕێگای نزیكبوونەوە لە خوا ئەوە نیە كە تۆ لە نێوان خۆت‌و خوادا ناوەند دابنێی، ئەمە نەلە قورئاندا هەیـەو نەلـە سوننەتیـشد وەهیچكام لە زانا باوەڕپێكراوەكانیش شتی وایان نەوتووە، بەڵكو ڕێگای نزیكبوونـەوە لـە خـوا لـە قورئانەكەیـدا بریتیـە لـە گوێڕایـەڵیكردنی وەك دەفـەرموێت (( ئـەی ئـەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و هۆكاری نزیكبوونـەوە لـەخوا بگرنـە بـەر)، واتە نزیكبوونەوە لەخواو گوێڕایەڵی كردنی، بەڵام یەكێ بێـت و بـەوە مانـای بكـات كـە بریتیە لە چەند ناوەندێك لەنێوان بەندەو خـوادا تـا بـە هۆیانـەوە لـەخوا نزیـك بێتـەوە ئـەوە مانـا كردنێكـی پووچـەو داهێنـراوەو هـیچ كەسـێ لـە زانایـان‌و پێـشەوایانی (( شیكەرەوەی قورئان )) وایان نەفەرمووە سوپاس بۆ خـوا، بەهـەرحاڵ ئەمانـە گوما پووچەكانیانە كە هیچ بایەخێكیان نیە سـوپاس بـۆ خـوا بـەڵام هـەر ئـەم گومانانـە كـە پشتیان پێ بەستووە لەكاتی ئەنجامدانی كردەوەكانیاندا، وە هەندێكیش هەیە پاساوو پۆزش بۆئەم جۆرە كەسانە دەهێننەوەو دەڵێن: ئەوانەی كـە گـۆڕ دەپەرسـتن نـەزانن.

[1] المائدة: ٣٥

چەندێ ئەم قسەیە دەبیستین لێیانەوەو لە پەرتووكەكانیاندا دەیخوێنینەوە كە دەڵێن (( ئەم كردەوەیەیان دروست و ڕێگەپێدراو نیە بەڵام نایزانن بۆیە دەیكەن).

پێیان دەڵێین: چۆن ئەوانە نەزانن لەكاتێكدا كە قورئان دەخوێننەوە و هەر لەو قورئانەشدا هاوبەش دانان بۆ خوا قەدەغەكراوە و دانانی نێوەندیش لەنێوان بەندەو خوای بەرزو بەڕێزدا بەهەمان شێوە قەدەغە كراوو یاساغە . هەركەسێكیش قورئانی پێ بگات و عەرەبیش بێت لە ماناو مەبەستی تێبگات ئەوا بەڵگەی لەسەر دروست بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾ [١]

واتە: (ئەم قورئانەشم بە وەحی بۆ هاتووە كە ئێوەو هەركەسێكی تریش ئەم قورئانەی دەگاتێ پێی بترسێنم و ئاگاداركەمەوە).

جا هەركەسێك قورئانی پێ بگاتو عەرەبیش بێت ئەوا بەڵگەی لەسەر دروستبووە، وە ئەگەر عەرەبیش نەبێت ئەوا بۆی وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی خۆی تا لە ماناو مەبەستەكەی تێ دەگات .

وە ئەوانەی كەلە ولآتانی عەرەبدا گۆڕەكان دەپەرستن عەرەبن و زۆر بە جوانیش بەعەرەبی قسە دەكەن بەڵكو پێ دەچێت هی وایان تیا بێت كە پەرتووكی بەناوبانگی ((سیبەوەیە))ی لەبەربێت، وەلە زمانیشدا زۆر شارەزا بێت و ڕەوانبێژی زمانەوانی بزانێو لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕ دەپەرستێ، ئایا كەسی ئاوا پۆزشی بۆ دەهێنرێتەوە بەوەی كەنەزانە بۆیە وا دەكات ؟ .لە ولآتانی عەرەبدا چەندە زۆرە بوونی گۆڕو نەزرگا كە قورئانیش بە زمانی خۆیان دابەزیوەو قەدەغەی كردووە لێیان، ئێوە چۆن دەڵێن ئەوانە نەزانن بۆیە ئەو كارە دەكەن ؟ تاكەی نەزانین ؟ لەبەرئەوەی لە دوای ناردنی پێغەمبەرﷺ و دابەزینی قورئان نەزانین لاچوو زانست شوێنی گرتەوەو بەڵگەش

---

[١] الأنعام: ١٩

لەسەر هەموو کەسێ دروستبوو، ئایا بە نەزان دادەنرێ کە قورئانی لەبەرەو لە وڵاتی عەرەبدا دەژی، قورئان دەخوێنێتەوەو گوێی لێیە، وەبە هەمیشەیی قسەی زانایان دەبیستێت بەتایبەتی لەدوای ئەوەی کە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن پەیدابوو هەموو قسەکانیان بۆ خەڵکی دەگوازێتەوە، بەیانیان‌و ئێواران قورئان دەخوێنرێتەوەو ئەمانەش دەیبیستن لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو هەموو شوێنێك، چۆن دەگوترێت ئەوانە بەڵگەی قورئانیان پێ نەگەیشتووە ؟ ئەوانە نەزانن ! لەگەڵ ئەوەی زۆرینەیان خاوەن شەهادەی بەرزن لەبواری زمانی عەرەبی‌و زانستە شەرعیەکان‌و خوێندنەوەکانی قورئان‌و فیقهو بنچینە زانستیەکان .

بەکورتی ئەوانە هیچ بیانوویەکیان نیەو بەڵگەیان بەدەستەوە نیە، بەڵگەکانیشیان زۆر بێ مانان لەلای پەروەردگاریان، داوا لە خوا دەکەین ڕێنموویان بکات بۆ هەق‌و ڕاستی، وە هەقیان بۆ ڕوون بکاتەوە، واز لە ملەجیڕێش بێنن، وە واز لە چاولێکەری کوێرانە بێنن، وە بگەڕێنەوە بۆ لای قورئانەکەی خوای گەورە و ڕێو شوێنی پێغەمبەرەکەیان محمد ﷺ بگرن هەتا بتوانن بەچاکی ئیسلامەتیەکەیان بکەن‌و ئاینەکەیان ڕاستتر بکەنەوەو ببن بە نەتەوەی محمد ﷺ و نەبنە نەتەوەی هاوەڵدانەران‌و شوێنکەوتەی ئەبوجەهل و ئەبولەهەب .

ئەمەش لەڕاستیدا کارێکی گەورەو مەترسیدارە، ئێوە ئەی بەندەکانی خوا دەخوێننەوەو دەبیستن، وە هەیشتانە ڕۆیشتووەو بەچاوی شتە سەرسوڕهێنەرەکانیانی دیوە لە هاوبەش دانانیان‌و بت پەرستیان‌و هیچ ئامۆژگاریەکیش وەرناگرن هەر گوێش نادەن بەوەی کە بانگیان دەکات بۆ حەق مەگەر یەکێ خوا خۆی بیەوێ، کارێکی زۆر مەترسیدارە دروستیش نیە بۆ فێرخوازانی زانست‌و زانایان کە بێ دەنگ بن لەبەرامبەریاندا، بەڵکو لەسەریەتی کە بۆ ئەو خەڵکە

ڕوون بکاتەوە و بانگەواز بۆ لای خوای گەورە بکات، وە پێویستیشە لەسەر کاربەدەستانی موسڵمانان دژ بەوانە جیهاد بکەن تا ئاین هەر بۆ خوا بێت و بەس .

بانگەواز بۆ لای خوا چ مانایەکی هەیە کە ئێمە بێ دەنگین لە ئاست ئەوانەدا ؟ بانگیان دەکەین بۆ ڕاستگۆیی‌و ساختەنەکردن لە کڕین‌و فرۆشتنداو داوێن پیسی ئەنجامنەدان بەڵام واز لە هاوبەش دانان دەهێنین‌و بانگیان ناکەین بۆ وازلێهێنانی ! ئەوەی زۆر مەترسیدارە وازی لێ دێنین‌و بانگەوازی یەکتاپەرستی دەست پێ ناکەین و هاوبەش دانان بۆ خوا پشتگوێ دەخەین !، وەکو ئاشکرایە کە هاوبەش دانان بۆ خوا ناچێتە ناو بازنەی لێخۆشبوونی خواییەوە بەڵام هەموو تاوانەکانی دی دەچنە ژێر لێخۆشبوونی خواییەوە بۆ کەسێ کە خۆی بیەوێ، ئەوەی کە ئێمە لە لق‌و پۆپەوە دەست پێ دەکەین و واز لە بنەڕەتەکە دێنین ڕێگەی دروستی بانگەواز نیە بۆ ئاینی خوای گەورە، چونکە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێ یەکەم شتێك کە دەستیان پێ کردووە لە بانگەوازکردنی خەڵکیدا بۆ لای خوا ئەوە بووە بیرو باوەڕیانی ڕاستکردووەتەوە، بە قەلاغەکان‌و لاکان دەستیان پێ نەکردووە کە هیچ سوودێکی نیە لەگەڵ نەبوونی یەکتاپەرستی‌و بیرو باوەڕی ڕاست‌و دروستدا. ئەگەر وا دابنێین مرۆڤێك وازی لە داوێن پیسی‌و ئارەق خواردنەوەو سوود وەرگرتن‌و وازی لە هەموو قەدەغە کراوەکان هێنا بەڵام لەهەمان کاتدا کەسێکی هاوبەش دانەربوو ئەوا وازهێنانی هەموو ئەوانە هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێ، ئەگەر شەوو ڕۆژ نوێژ بکات‌و هەموو ماڵ‌و سامانەکەی بکات بەخێر بەڵام هاوبەشی گەورە ئەنجامبدات بۆ خوا ئەوا هیچ سوودێکی پێ ناگەنێ ئەو کردەوە چاکانەی .

بەڵام ئەگەر یەکتاپەرستیەکەی هەبوو، پارێزراو بوو لە هاوبەش دانان بۆ خواو دڵسۆزبوو بۆی‌و لەهەمانکاتیشدا تاوانە گەورەکانی ئەنجامدەدا کە ناگەنە پلەی هاوبەش دانان بۆ خوا ئومێدی ئەوەی لێ دەکرێت کە بەر لێخۆشبوونی خوایی بکەوێت،

ئەگەر سزاش درا ئەوا بە هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا ناهێڵرێتەوە، جا چۆن ئێمە كارە مەترسیدارەكە وازلێ بێنین‌و رووكەینە كاری تر جگە لە هاوبەش دانان و مەترسیەكەی‌و بشڵێین ئەوە كارەو بانگەوازە بۆ لای خوای بەرزو بەرێز .

ئێستا دەزانن كە هەوڵی بانگەوازكردنی خەڵكی‌و زۆری بانگەوازكاران‌و بوونی دامەزراوەو ناوەندەكانی بانگەواز بەڵام لەهەمان كاتدا نزرگاكان هەروەكو خۆیانن بەڵكو تا دێت زیاتریش دەبێت لە جیهانی ئیسلامیدا، صۆفی گەریەتی‌و داهێنراویەتی لە دیندا زۆرتر دەبێت، كوا بانگەواز بۆ لای خوا ؟ كوان ئەم هەوڵانەو بەرهەمەكانیان؟

جا پێویستە لە سەرمان كە ئاگاداری بدەین لەم كارەو بانگەوازیشمان لەسەر چاوڕۆشنی بێت و بەوە دەست پێ بكەین كە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێ دەستیان پێ كردووە، ئەویش ڕاستكردنەوەی بیرو باوەڕە پاشان بینا كردنی شتی تر، لەبەرئەوەی ئەوە بنەڕەتەو جگە لەو لەسەری بنیات دەنرێت، جا ئەگەر بنەڕەتەكە دروستبوو ئەوا بیناكەی دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر بنەرتەكەی خراپبوو ئەوا بیناكە دەرووخێت و خاوەنەكەی هیچ سوودێكی لێ نابینێ، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾[1]

واتە: (ئاخۆ ئەوەی بنەڕەتی مزگەوتەكەی خۆی لەسەر خواناسین‌و تەقواو ڕەزامەندی خوادا ڕشتبێ – وەكو مزگەوتی قوبا – چاكترە یان ئەو كەسەی كە بنەڕەتی مزگەوتەكەی لەسەر لێواری ئاودڕی فشەڵ‌و ڕوخەك داناوە، دیوارێك لەسەر قوڕێ كرابێ لافاو هێنابێتی‌و بەرەو ڕووخان ملی نابێت ئەبێ چۆن بینایەكی لەسەر بكرێت ؟! ئینجا لە ناكاو بەو فشەڵ‌و ڕووخەكەوە دەكەوێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە،

---

[1] التوبة: ١٠٩

واتە ((ئایا کەسێك بناغەی ئاینی خۆی لەسەر دڵسۆزی و تەقوا دارشتبێ وەکو کەسێك دەبێ کەلەسەر پرو پاگەندەو دووڕوویی دایڕشتبێ ؟ هەرگیز خوا ڕێنمایی خەڵکانی ستەمکار ناکات).

ئەوە نمونەیەکی ڕوونە لەسەر کەسێ کە ئاینەکەی لەسەر بیروباوەڕی ڕاست و نیەتی چاك بنیات نابێ، لەگەڵ کەسێ بنیادی نابێ لەسەر هاوبەش دانان و شتی تر کە پێچەوانەی دینی خوایە (( ئایا وەکو یەك وان ؟ .. وەرگێڕ )) . داواکارین لە خوای پەروەردگار کە حەق و ڕاستیمان نیشان بدات و ڕێزی شوێنکەوتنیشمان پێ ببەخشێ وە ناهەقیشمان بە شێوە ناهەقەکەی پێ بناسێنێ و ڕێزی دوورە پەرێزیشمان لێی پێ ببەخشێ چونکە هەرخۆی بیسەرو وەڵامدەرە).



پرسیار: هەندێ لە زانایان باسیان کردووە کە هەموو تاوانەکان بەشێکن لە هاوەڵدانانی بچووک، ئایا ئەم وتەیە ڕاستە ؟

وەڵام: هەموو تاوانێك هاوبەش دانان نیە، هەیانە هاوبەش دانانەو هەشیانە هاوبەش دانان نیە، وە کردنی هەموو تاوانێك بە هاوبەش دانان بۆ خوا هەڵەیە.

پرسیار: بەڕێزتان باستان کرد کە زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ڕا جیاییان هەبوو دەربارەی هاوبەش دانانی بچووك کە ئایا دەکەوێتە بەر لێخۆشبوونی خوا یان نا، ئەوەی کە پەسەندە لە بۆچوونە جیاوازەکانیاندا کامەیە؟

وەڵام: پەسەند ئەوەیە کە خوا باشتریش دەزانێ کە ناکەوێتە بەر لێخۆشبوونی خواییەوە لەبەر گشتیەتی ئایەتەکە، بەڵام خاوەنی ئەنجامدەری هاوبەش دانانی بچووك بە هەتا هەتایی لەناو ئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە وەکو چۆن ئەنجامدەری هاوبەش دانانی گەورە تیایدا دەمێنێتەوە .

پرسیار: ((التَّبرُّك)) بە پیرۆز دانان کەی دەبێتە هاوبەش دانان و کەی نابێتەهاوبەشدانان؟ وەڵام: ئەگەر باوەڕی وابوو کە فەڕو پیرۆزی جگە لە خواوە بەدەست دێت، وەك ئەوەی دارێ بەردێ بەپیرۆز بزانێ و باوەڕی وابێ کە فەڕو کامەرانی دەبەخشێ ئەوە هاوبەش دانانی گەورەیە، بەڵام ئەگەر باوەڕی وابوو کە ئەو شتە هۆکارە بۆ دەستکەوتنی فەڕو پیرۆزی، وە شادیو فەڕو پیرۆزی لە خواوەیە بەڵام ئەوە هۆیەکە بۆ دەست خستنی لەو کاتەدا دەبێتە هاوبەش دانانی بچووك – خوا پەنامان بدات لە هەردووکیان .

پرسیار: ئەگەر پیاوێك قوربانیەكەی لای قەبری فلاَنێكدا سەربڕی بە هیوای ئەوەی پیرۆزی دابەزێتە سەر قوربانیەكەی، ئایا ئەو سەربڕینە بە هاوبەش دانانی گەورە دەژمێردرێ یان بچووك ؟

وەلاَم: ئەگەر سەری بڕیَ بۆ مردووەكە، یان سەری بڕیَ بۆ گۆڕەكە ئەوا بە هاوبەش دانانی گەورە دەژمێردریَ، بەلاَم ئەگەر بۆ خوای سەربڕی بەلاَم وا گومان دەبات كە ئەو شوێنە بەڕێزە لای خوا بۆیە لەویادا سەری دەبڕیَ ئەوا هاوبەش دانانی بچووكەو ڕێگەیەكیشە لە ڕێگەكانی تووش بوون بە هاوبەش دانانی گەورە . خوا بمانپارێزیَ .

پرسیار: ئایا بۆ جێگیربوونی ئەوەی كەسێك هەڵگەڕاوەتەوە مەرجی باوەڕ پێكراو هەیە ؟

وەلاَم: مەرجەكانی هەڵگەڕانەوە:

یەكەم: پێویستە كەسێك نەبێت پۆزشی نەزانینی بۆ بهێنرێتەوە، وەك ئەوەی هیچی پیَ نەگەیشتبیَ، یان لە شوێنێكدا ژیابیَ دوور لە موسڵمانان، هیچی نەبیستبیَو هیچی پیَ نەگەیشتبیَ، ئەوە حوكم نادریَ بەسەریدا تا بۆی ڕوون نەكرێتەوە و بۆی شی نەكرێتەوە كە ئەوە هاوبەش دانانەو بیَ باوەڕیە .

دووەم: زۆر لێنەكردن، بەلاَم ئەگەر زۆری لێكرا لەسەر وتنی وشەی بێباوەڕی و قسەی بێباوەڕی لەگەڵ دروستی ئیمانەكەی لە دڵ و بیرو باوەڕیدا، ئەوجۆرە كەسە پاساوی زۆرلێكردنی بۆ دەهێنرێتەوە ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ [1]

واتە: (مەگەر كەسیَ زۆری لێكرابیَو دڵەكەی دڵنیابیَ بە باوەڕ ).

[1] النحل: ١٠٦

پرسیار: بۆچوونی بەڕێزتان دەربارەی کەسێك چۆنە کە دەڵێ هەردوو پەرتووکی (نواقض الإسلام) و (کشف الشبهات) خەڵکی فێری بە کافردانان دەکەن و هانیان دەدات بۆ ئەو کارە، جا باشتر ئەوەیە نەخوێنرێن‌و خەڵکی فێرنەکرێن ؟

وەلام: ئەی ئێمە لەکاتی خوێندنی وانەکەماندا نەمان وت کە هەیە دەڵێت پێتان بۆچی خەڵکی فێری ئەم شتانە دەکەن ؟ بۆچی ڕاڤەو شیان دەکەنەوە ؟ خەڵکی موسڵمانن‌و ناوی ئیسلامیش بەسە بۆیان جا هەرچی دەکەن با بیکەن، ئەمە قسەیەکە دەیڵێن‌و وتووشیانە، ئەوانە دوژمنی یەکتاپەرستین دەیانەوێ یەکتاپەرستی نەمێنێ‌و لەناو بچێ‌و تەنانەت ناویشی نەهێنرێت، ئەوە مەبەستیانە، بەلام ئێمە هەر دەیخوێنین إن شاالله، وە لە قوتابخانەکانیشدا دەبێتە پرۆگرام و ڕاڤەش دەکرێت لە مزگەوتەکاندا بە کوێرایی چاویان، ئەوەش پێویستە لەسەر زانایان کە هەڵسن بەو کارە پێویستیشە لەسەر خەڵك کە فێری بن لەبەرئەوەی ئەوە بنچینەی ئاینە .

پرسیار: پیاوێك دەپاڕێتەوە جگە لە خوا، منیش هەواڵم داوەتێ کە ئەو کارە هاوبەش دانانە بۆ خوا، وەلامی نەدایەوەو وازی لێ ناهێنێ، ئایە حوکم بدەم بەسەریدا بە هاوەڵدانان، یان دەبێت لەلایەن زانایەك لە زانایانەوە ئەو حوکمە بدرێت بەسەریاندا؟

وەلام: حوکم نادەین بەسەریدا هەتا گوێی لێ نەگرین، وە بارو دۆخەکەشی نەزانین، ئایا ژیری تەواوە یان تێکچووە، ئەوە پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ لای زانایان و زانای شوێنەکەی خۆی لێ ئاگاداربکێتەوە تالەگەڵیدا ئەوەی پێویست دەکات بۆی ئەنجام بدەن.

# وانەی سێیەم لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەری دووەم

**زانـای بـەڕێز ( محمـد بـن عبـدالوهاب ) ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ دەفـەرموێت ((وە هەرکەسـێ لـەنێوان خۆی وخـوادا کۆمـەڵێ ناوەنـد دابنـێ لێیـان بپاڕێتـەوەو داوای تکایـان لێ بکـات و پـشتیان پـێ ببەستێ بە کۆی دەنگی زانایان بێباوەڕ بووە )).**

## ( ڕاڤە )

ڕەحمەتی خوای لێ بێ فـەرموی ((دووەم)) واتـە دووەم لـە هەڵوەشـێنەرەوەکانی ئیسلام (( هەر کەسێکە لـە نێـوان خـۆی و خـوادا نێوەنـد دابنـێ و لێیـان بپاڕێتـەوە و داوای تکـا کردنیـان لێ بکـات و پـشتیان پـێ ببەسـتێ بێبـاوەڕ بـووە بـە یەکـدەنگی زانایان)) .

وتەی ( هەرکەسێ لەنێوان خۆی و خوادا کۆمەڵێ ناوەند دابنێ ) واتە ئەو ناوەندانـە لە دروستکراوان دەبنە ناوەند بۆی لای خوا بەگومانی خۆیان ئەم باسە — باسی ناوەند دانان لەنێوان خواو دروستکراوانیدا — فراوانی تێدایە[1] هەروەکو زانای بەڕێز فـەرمووی. جا هەرکەسێ بڵێ گومانی تێدا نیە کە دەبێ ناوەنـد هـەبێ لـەنێوان خـواو بەندەکانیـدا پرسیاری لێ دەکرێ: مەبەستی بـە ناوەنـد چیە؟ ئەگـەر مەبەسـتەکە ئـەوە بێـت: کـە پێویست دەکات ناوەند هەبێت بۆمان لـەنێوان ئێمـەو خـوادا لـە گەیانـدنی پەیامەکـەدا ئەوە زۆر ڕاست ودروستە.

---

[1] أنظر مجموع الفتاوى (١/١٢١ـ١٢٣).

ئـەم ناوەندێتیـە پێویـستیە و بـێ ئـەو نـابێ هەرکەسـیش ملـەجیڕێ بکـات لـەوەدا بێبـاوەڕە، بـێ ناوەنـد نابێـت لـە گەیانـدنی ئاینەکەیـدا کـە ئـەوانیش پەیامبـەرانن لـە فریشتەو مرۆڤەکان هەرکەسێکیش ئەم ناوەندە بەرپەرچ بداتەوە بێباوەڕە، هەرکەسـێ فریـشتەکانو پێغەمبـەران بـە ڕاسـت نـەزانێ ئەوانـەی کـە شـەرعی خـوا دێـنن و بڵـێ پێویستمان پێیان نیە ئێمە خۆمان پەیوەندی بە خـواوە دەکـەین و ئەوانیـشمان نـاوێ وەکـو صـۆفیەکان دەڵـێن ئـەوان ڕاسـتەوخۆ لـە خـواوە وەریـدەگرن بـەبێ ناوەنـد بەیەکدەنگی زانایان ئەوکەسانە بێباوەڕن .

وە ناوەندێکی تریش هەیە هەرکەسێ باوەڕی پێی بێ و بیسەلمێنێ ئـەوە بێبـاوەڕە بێگومان، هەرئەوەشە کـە زانـای بـەڕێز باسـی کـردووە، کـە بریتیـە لـە دانـانی ناوەنـد لەنێوان خۆی و خوادا . هاواریان دەکـاتێ و لێیـان دەپاڕێتـەوە و داوای تکاکردنیـان لێ دەکات و پشتیان پێ دەبەستێ ئەم جۆرە لـە ناوەنـد هەرکەسـێ بـاوەڕی پێـی بێـت بێباوەڕە بەکۆی دەنگ .

لەبەرئـەوەی ناوەنـد نیـە لـەنێوان ئێمـەو خـوا لـە پەرسـتنیدا، بـەڵکو پێویـستە لەسەرمان کە خوا بپەرستینو هاواریکەینێ ڕاستەوخۆ لەخۆی بەبێ هیچ ناوەنـدێك، وە پشتیـشی پـێ ببەسـتین بـەبێ بـوونی ناوەنـد لـەنێوان ئێمـەو خـوادا، خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ [1]

واتە: (لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە) نەیفەرموو لێم بپاڕێنەوە بـا فلانـە کـەس لەنێوانماندا بێت، یان ناوەند دابنێن، ئەم ناوەنـد دانانـە هەرکەسـێ بـاوەڕی پێـی بێـت بێبـاوەڕ دەبێـت، ئـەوەش بـەوە دەبێـت کـە چـەند ناوەنـدێ لـەنێوان خـۆی و خـوادا دادەنێت و چەند پەرستشێکی بۆ دەکات لـە پێنـاو ئـەوەی لـە خـوا نزیکـی بکەنـەوە.

---

[1] غافر: ٦٠

هەروەکو هاوبەش دانەرە کۆنەکان کە دەیانوت: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾[1]

واتە: (جگە لە خوا دەپەرستن لە کاتێکدا کە ئەو پەرستراوانە ناتوانن زیانیان لێ دووربخەنەوەو سوودیان پێ بگەیەنن وە دەشڵێن ئەوانە تکاکارمانن لای خوا) خوای گەورە ئەمەی ناونا پەرستن وە دوای ئەوە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٨﴾ ﴾[2] هەمان ئایەتی پێشوو.

واتە: (بڵێ ئاخۆ هەواڵ بەخوا دەدەن بەهاوبەشێك خۆی نەزانێ پێی لە ئاسمانەکانو لە زەویدا، خوا پاکو خاوێن و بێ خەوشە، بەرزو بڵندە لە هەرشتێك بێباوەڕان دەیکەنە هاوەڵ و هاوبەشی).

ئەمەشی بە هاوبەش دانان ناو برد و خۆیشی پاك ڕاگرت لێی، ئەوە حاڵی گۆڕپەرستان و جێ نەزرگا پەرستانی ئەمڕۆیە، دۆستانی خواو پیاوچاکان دەکەنە نێوەند لەنێوان خۆیان و خوادا، ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕن لەلای گۆڕەکانیاندا، نەزریان بۆ ئەنجام دەدەن و داوای فریاکەوتنیان لێ دەکەن و لێیان دەپاڕێنەوە جگە لە خوا، ئەگەر پێشیان بوترێت ئەوە هاوبەش دانانە دەڵێن ئەوانە ناوەندن لە نێوان ئێمەو خوادا، ئێمە باوەڕمان وا نیە کە ئەوانە توانای دروستکردنو ڕۆزی دان و هەڵسوڕاندنی کاروباریان هەبێت بەڵکو کردوومانن بە ناوەند لەنێوان خۆمان و خوادا پێویستیەکانمان بە خوا دەگەیەنن، ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕن و شت لەسەر خۆیان پێویست دەکەن کە

[1] یونس: ١٨

[2] یونس: ١٨

بۆیان ئەنجام بدەن بە بەڵگەی ئەوەی ئەوانە نێوەندی نێوان خۆیان و خوان، وە هەرئەوەش كاری هاوبەش دانەرانی پێشوون وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ ﴾[1]

واتە: (ئەوانەی كەلەباتی خوا چەند دۆست و بتێكیان بۆ خۆیان گرتووە، وە بەبێ هیچ بەڵگەیەكیش دەڵێن ئێمە هەر لەبەرئەوە ئەو بتانە دەپەرستین كە لە خوامان نزیك بكەنەوە و تكامان بۆ بكەن لای، كەچی ئەگەر پێیان بوترایە ئەی كێ ئێوەی دروست كردووە؟ ئەی كێ ئاسمانەكان و زەوی بەدیهێناوە ؟ لەوەڵامدا ئەڵێن – الله – ئیتر پێیان ئەوترا ئەی بۆچی خوا بە تاك و تەنها ناپەرستن ؟ وشەی – ما نعبدهم – وەڵامیان بوو، جابا هەر وا بكەن بێگومان خوا هەق و ناهەق جیا دەكاتەوە و بڕیاری خۆی دەربارەی ئەو دووبەرەكیەی نێوانیان دەدات، ئەوكاتە موسڵمانان دەچنە بەهەشتەوە و بێباوەڕانیش بۆ دۆزەخ دەنێردرێن، دیارە ئەو كەسانە گومڕاو سەرلێشێواون خۆ بەڕاستی خوایش مرۆڤی درۆزن و سپڵە ڕێنموویی ناكا).

ئەو كردەوەیەی بە درۆزن و بێباوەڕی ناو برد، بەڵام كەسێك ئەو نێوەندانە بەكاردەهێنێت و باوەڕی وایە كە هۆكارن و لێیان ناپاڕێتەوە و ئاژەڵ سەرنابڕێت و شت لەسەر خۆی پێویست ناكات بۆی و باوەڕیشی وایە كە پەرستن تەنها بۆ خوا دەكرێت و جگە لە خواش كەسی دی ناپەرستێ، بەڵام دەیانكاتە ناوەند لەسەر ئەوەی كە ئەوانە هۆكارن نزیكی دەكەنەوە لە خوا بە گومانی خۆیی و داوا لە خوا دەكات بەخاتری ئەوان و ڕێزی ئەوان ئەو كارەی بۆ بكات، ئا ئەو كارەی داهێنراوەو

[1] الزمر: ٣

پێشینانمان نەیانكردووە و هۆكارێكیشە بۆ هاوەڵدانان بۆ خوا، لەبەرئەوەی خوا فەرمانی پێمان نەكردووە كە ناوەند بگرین لە نێوان خۆمان و خوادا بۆ پاڕانەوە و داوای تكاكردن لە خوا، ئەوە هۆ نیە بۆ وەڵامدانەوەی پاڕانەوە كە بچیت یەكێ لە پیاوچاكان یان لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت بكەیتە نێوەندی خۆت و خوا، چونكە ئەوە قسەیەك بەناوی خواوە دەكەیت بێ ئەوەی زانیاریت هەبێت پێی، خوای گەورە فەرمانی كردووە پێمان تا لێی بپاڕێینەوە بەڵام فەرمانی پێ نەكردووین كە ناوەند بگرین لەنێوان خۆمان و خوادا، پێویستە جیاوازی بكرێت لەنێوان ئەم دوو بارەدا، حاڵێك كە ناوەندەكان دەپەرستێ و ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕێ و شت لەسەر خۆی پێویست دەكات بۆیان و خۆییان لێ نزیك دەكاتەوە، وە حاڵەتێكیش كە ناپەرستێ بەڵكو تەنها دەیانكاتە نێوەند تا پێویستیەكەی بگەیەنێتە خوای بەرزو بەڕێز، لەبەر ڕێزو چاكیو گەورەیی ئەو ناوەندە لای خوا، ئەوە پووچەو داهێنراوە لەبەرئەوەی داهێنانی شتێكە لە ئایندا كە خوا مۆڵەتی نەداوە بە كردنی وە یەكێكیشە لە هۆكارەكانی هاوبەش دانان بۆ خوا، ئەمانەی دوایی تەنها بەوەوە نەوەستاون كە تەنها ئەوانە بكەنە ناوەندو هیچ شتێكیان لەپەرستن بۆ ئەنجام نەدەن بەڵكو زۆرینەیان دەیانپەرستن‌و شتیان لەسەرخۆ پێویست كردووە بۆیان و ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕن، وەكو چۆن لای جێ نەزرگەكان دەیكەن، بەخۆڵەكەی فەڕوپیرۆزی داوا دەكەن و كەلوپەلەكانی ناوی بەكاردێنن بۆ داوا كردن‌و دەستی پیا دەهێنن‌و ماچی دەكەن و لەچەند كاتێكی دیاری كراودا سەردانی دەكەن ( وەك ڕۆژی چوارشەممە لای خۆمان .. وەرگێڕ ) و لەدەوریدا دەمێننەوە وە ئاژەڵی زۆر دێنن و لە مەیدانی نەزرگەكەدا سەریان دەبڕن بە مەبەستی خۆ نزیك كردنەوە لە گۆڕەكەو ڕازی كردنی، خاوەنی گۆڕەكانیش بە گومانی خۆیان لە خوا نزیكیان دەكەنەوە و پێویستیەكانیان دەگەیەنن بە خوا، ئەوەیە كاریان و ئاینیان هەر لە كۆنەوەو لەوكاتەوەی كە مزگەوتەكان لەسەر گۆڕەكان دروستكران هەر وەكو چۆن پێغەمبەر ﷺ هەواڵیدا و هاتیشە جێ، ئەوانە

هـەروەکو گـاوڕ و جوولەکـەکان کەوتنـە نـاو ئـەو تاوانـە گەورەیـەوە کـە ئـەویش دروستکردنی مزگەوتە لەسەر گۆڕەکان وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( ئەوانـەی لـەپێش ئێـوەوە بـوون دەهـاتن گـۆڕی پێغەمبـەر و پیـاو چـاکەکانیان دەکردە مزگەوت، جا ئاگادارین ئێوە گۆڕەکان نەکەنە مزگەوت من قەدەغـەی ئـەوەتان لێ دەکەم))[1] ئەوە قەدەغـەبوو لەسـەرەتای ئـەم ئاینـە پاکـەدا و لەسـەردەمی خەلیفـە ڕاشیدینەکانیش و سێ سەدە چاك و پڕ خێرەکەدا، هـیچ نـەدەبینراو بـوونی نـەبوو کـە بینا لەسەر گۆڕ دروستکرابێ، هەتا دەوڵەتی فاطمیە شیعەکان هات و دەستیان بەسـەر میصردا گرت و زۆرێکی تریش لە ناوچەو وڵاتـەکان، ئەوانـە شـیعەی بـاطنی بـوون کـە چەندین بینایان لەسەر گۆڕ دروستکرد لە میصرو شوێنانی تریشدا، پاشـان گـۆڕو جـێ نەزرگا زۆربوو لەدوای ئەوە لە وڵاتانی موسڵمانانـدا بـەهۆی ئـەو شـیعە پیـسانەوە خـوا ئەوەندەی تر ناشرینیانکات، ئەوان یەکـەم کەسـێك بـوون کەلەسـەر گۆڕەکـان بینایـان دروسـت کـرد هــەروەکو شـەیخی ئیـسلام ( ابـن تیمیـە ) ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت فەرموویەتی: ئەوانە کۆمەڵێك گومانیان هەیە کە دەیانکەنـە بەڵگـە و وا گومـان دەبـەن کە بەڵگەبن:

<u>گومانی یەکەم</u>: ئەمە لەو ڕێگایانەیـە کـە دەگیرێنـە بـەر بـۆ نزیکبوونـەوە لـە خـوا، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾[2]

واتە: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسـن و فەرمانـەکانی جـێ بـەجێ بکەن، بۆ نزیکبوونـەوە لـە خـوای گـەورە ڕێگـای نزیکبوونـەوە بگرنەبـەر وە لـە پێنـاو خـوای گەورەشـدا کۆشـش بکـەن و غـەزا بکـەن بـەڵکو لەهـەردوو دنیـادا سـەرفرازو بەختیاربن).

---

[1] اخرجه مسلم ٥٣٢ من حديث جندب بن عبدالله رضي الله عنه

[2] المائدة: ٣٥

((الوسیله)) یان بەوە لێكداوەتەوە كە ناوەند لەنێوان خۆت و خوادا دابنێی لە دروستكراوەكانی . وە هەروەها لەبەر فەرموودەكەی خوای گەورە كە دەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ﴾[1] واتە: (ئەوانەی ئەوان دەیانپەرستن و هانایان بۆ دەبەن، (بۆ نموونە: جوولەكە بۆ عوزەیر، گاور بۆعیسا، هاوبەش دانەرەكان بۆ فریشتە ) خۆشیان هەتا لە خواوە نزیكترین، هێشتا هەر لە هۆیەك دەگەڕێن كە خۆیانی زیاتر لە پەروەردگار پێ نزیك بكەنەوە، ئیتر ئێوە چۆن ئەوانە دەپەرستن ؟! بە ئومێدی ڕەحمەت و میهرەبانی ئەو پەروەردگارەن، وە لە تۆڵەو سزایشی دەترسن).

بە هەمان شێوە هەروەكو ئایەتەكەی تر (الوسیلة) یان بە ناوەندگرتن لەنێوان خۆیان و خوادا ڕاڤەو شی كردۆتەوە كە ئەوەش ڕاڤەیەكی پووچەو هیچ كام لە پێشەوایانی شیكەرەوەی قورئان وایان نەفەرمووە، بەڵكو ئەو پێشەوا بەڕێزانە (الوسیلة) یان بە گوێڕایەڵی خوای گەورە و نزیكبوونەوە لێی بە ئەنجامدانی پەرستشەكان لێكداوەتەوە بە تەنها بێ هاوەڵدانان بۆی، نزیك بوونەوە لێشی تەنها ڕێگەیەك كە پێی بگات پەرستشكردنە بۆی بە تاك و تەنها .

جا كە وا بوو (الوسیلة) بریتییە لە پەرستنی خوای گەورە بە ئەنجامدانی فەرمانەكانی و دووركەوتنەوە لە قەدەغەكراوەكانی . بەڵام فەرموودەی خوای گەورە كە فەرموی (ئەوانەی ئەوان دەیانپەرستن و هاناو هاواریان بۆ دەبەن خۆیشیان هێشتا هەر لە هۆیەك دەگەڕێن كە خۆیانی زیاتر لە پەروەردگار پێ نزیك بكەنەوە، ئیتر ئێوە چۆن ئەوانە دەپەرستن، بە ئومێدی ڕەحمەت و میهرەبانی ئەو پەروەردگارەن و لە تۆڵەو سزایشی دەترسن).

---

[1] الإسراء: ٥٧

واتاكەی ئەوەیە كە ئەوانەی فریشتەكان دەپەرستن لە عەرەبەكانو وە ئەوانەشی كە عیسا ﷺ دەپەرستن لە گاورەكان، خوای گەورە بەرپەرچی دانەوە بەوەی ئەوانەی كە ئێوە دەیانپەرستن جگە لە خوا ئەوانە بەندەی منن‌و خۆیان لەمن نزیك دەكەنەوەو دەمپەرستن‌و هیچیان بەدەست نیە، لەپەروەردگاریەتیشدا هیچی بەدەست نیە .

ئەوانە بەندەی خوان و خۆیانی لێ نزیك دەكەنەوە بە پەرستنی و بەئومێد و ڕەحمەتی ئەون و لە سزاكەشی دەترسن، بۆیە دروست نیە بكرێنە كۆمەڵە ناوەندێك و بكرێنە هۆكار بۆ نزیك بوونەوە لە خوا، فەرموودەكەی (( ئەوانەی دەیانپەرستن )) واتە هاواریان دەكەنێ لەلایەن هاوبەش دانەرانەوە لە فریشتەكان، وە هەندێ لە پێغەمبەرانیش وەكو عیسا سەلامی خوای لێ بێ هەموویان بەندەی خوان و هیچیان بەدەست نیە كە بتوانن بیكەن ﴿يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ﴾ [1]

بەڵكو خۆیان بەدوای هۆكاردا دەگەڕێن تا لە خوا نزیك ببنەوە، ئەوانە هەژارن‌و پێویستیان بە خوای گەورەیە ﴿وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ﴾ بە ئومێدو ڕەحمەتی پەروەردگارن و لە تۆڵەو سزایشی دەترسن، ئیتر چۆن دەبێت بكرێنە خوایەكی دی و بپەرسترێن جگە لە خوای گەورە و لەگەڵ خوادا، ئەوانە بەندەن و لە سزای خوا دەترسن و بەهیوای ڕەحمەتی ئەون و خۆشیان زیاتر لەخوا نزیك دەكەنەوە بە ئەنجامدانی پەرستنەكان بۆی و گوێڕایەڵی كردنی، ئەوە لێكدانەوەی دروستی ئایەتەكەیەو زانایانیش هەروا ڕاڤەیان كردووە .

وتراویشە: خەڵكانێك لە مرۆڤ خەڵكانێكیان دەپەرست لە پەریەكان، بەڵام پەریەكان موسڵمان بوون و ئەوانەی كە ئەمانیان دەپەرست نەیانزانی بوو كە موسڵمان بوون واتە پەریەكان، خوای گەورە هەواڵی دانێ كە ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن جگە

---

[1] الإسراء: ٥٧

ـە خوا موسڵمان بوون، جا چۆن دەبێت ئەوانە لەگەڵ خوادا بپەرسترێن لەكاتێكدا كـە ـەندەن و خۆیان لەخوا نزیك دەكەنەوەو بەهیوای ڕەحمەتی ئەون و لە تۆڵەو سزایشی ـەترسن، بۆیە دروست نیە كە بكرێنە هاوبەش لەگەڵ خـوادا لەپەرستندا، وە بەمـەش ـڤە كردنیان بۆ (الوسیلە) كە بریتیە لە دانانی چەند ناوەندێك لەنێوان خۆیـانو خـوادا ـە دروستكراوەكانی هەڵوەشـایەوەو بەڵگـەكانیان پـووچ بوویـەوە سـوپاس بـۆ خـوای گەورە .

<u>گومـانی دووەم</u>: ئەوانە ئەو ناوەندانە دادەنێن لە نێوان خۆیان و خـوادا لـەو ڕووەوە كە خوا بە گەورە دەزانن، خوای گەورە مەزنە نـاتوانرێ بیگـەنێ تـەنها بـە دانـانی ئـەو ناوەندانە نەبێ وە ئەوانە تكاكارنو تكـا دەكـەن لای و دەبنـە نێوەنـد لـە نێـوان خـواو بەندەكانیدا، ئەوەیە گەورەییو مـەزنی خـوا بـە گومـانی خۆیـان و نـاتوانن پەیوەنـدی پێوە بكەن تەنها لە ڕێگەی ئەو ناوەندانـەوە نـەبێت، هـەروەكو چۆن پاشـاكانی دونیـا ئەگەر یەكێ بیەوێ پەیوەندیان پێوە بكـات و بیانگـاتێ پێویـستە لـە ڕێگـەی تكاكـارو ناوەندێكەوە بێت، ئەوەش هەروایە بە گومـانی ئـەوان، بـەو گومانـە پووچـانەی ئـەوان چەندین شت دێتە ئاراوە، لەوانە:

یەكـەم: ئەوانـە خـوای گـەورەیان وەكـو پاشـاكانی دونیـا لێكـردو پێوانـەیان كـرد، ئەوەش كارێكی بەتاڵەو پووچە، ئەوە گەورەیی نیە بۆ خوای گەورە بەڵكو ئەوە كەم و كووڕیە بۆی لەو ڕووەوە كە پێوانەیان كردە سەر دروستكراوەكانی شتێكیان لەپەرستن ئەنجامـدا بـۆ جگـە لـەخوا، هاوبـەش دانـان كەموكووڕیـە بـۆ خـوای بـەرزو بـەڕێز نـەك گـەورەییو مەزنیـەتی وەكـو گومـان دەبـەن . (( چـونكە لـە بـە گـەورە دانـان نیـە هاوەڵدانان بۆی .. وەرگێڕ )) .

دووەم: پێوانەكردنی خوا لەسەر مرۆڤ ناتـەواویو كـەمو كووڕیـە بـۆ خـوای گـەورە، خوای بەرزو بڵند بار و دۆخەكانی بەندەكانی باش دەزانێ، بەڵام ئادەمیزادو پادشاكان

هیچ كاتێك هەواڵو بارودۆخی ژێر دەست و خەڵكی وڵاتەكەیان نازانن مەگەر یەكێ پێی بگەیەنێ و پێی بڵێ چونكە ئەوانیش مرۆڤن وەكو ئەو خەڵكە، بەڵام خوای بەرزو بەڕێز هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە دەیزانێ و پێویستی بەكەس نیە پێویستی بەندەكانی پێ بگەیەنێ .

سێیەم: پاشاكانی دونیا پێویستی بەوەیە كە تكای تكاكاران وەربگرێ، لەبەرئەوەی پێویستی بە یارمەتی دەرو وەزیرەكان هەیەو ئەگەر تكاكەیان وەرنەگرێ ئەوا دەكەونە فروفێڵ لێیو دوژمنایەتی دەكەن، جا لەبەرئەوە ئەو پادشایانە تكاكانیان وەردەگرن با پێشیان ناخۆش بێت تەنها لەبەر مانەوەی دەسەڵاتەكەیان، وە ڕاكێشانی بۆ لای خۆیان تابەجێ بەجێ كردنی داواكاریەكانیان ملكەچیان كەن بۆخۆیان، بەڵام خوای بەرزو بڵند دەوڵەمەندە لەوەی پێویستی بە بەندەكانی بێت، پێویستی بە وەزیرو تكاكار نیە وەكو پادشاكانی دونیا .

چوارەم: پادشاكانی دونیا بەزۆری خێریان ناوێ بۆ خەڵكیو بە زۆرو گران نەبێت داوا جێ بەجێ ناكەن، بەڵام خوای گەورە بەڕێزەو كەس ناتوانێ كاریگەر بێت لەسەری لە ویستی خێرو چاكەدا بۆ بەندەكانی، هەروەكوچۆن كاریگەری دەكرێتە سەر پادشاكانی دونیا، خوای بەرزو بەڕێز ئەگەر داوات لێكردو هاوارت كردێ ئەوا نزیكەو وەڵامدەرە پێویستی بە ناوەند نیە بە پێچەوانەی پادشاكانی دونیاوە كە هیچ شتێك نادەن مەگەر بە داواكاریەكی زۆرو لەدوای یەك وەكو زانراوە، لەبەرئەوەی ئەو پاشایانە ئادەمیزادن و سیفەتی ئادەمیزادو مرۆڤیش ڕژدیو پیسكەییو نەدانو نەهێشتنو فێڵكردنە، بەڵام خوای بەرزو بڵند بەڕێزەو وەڵام دەداتەوەو نزیكەو دەوڵەمەندە .

پێنجەم: پاشاكانی دونیا هەژارن، ئەوەی لایانە تەواو دەبێت، هەندێ جاریش دەگونجێ هیچیان لا نەبێو پێویستیان بە قەرز كردنو فێڵكردن بێت، بەڵام خوای پەروەردگار هەرچی لە ئاسمانەكانو زەویدایە هی ئەوەو دەوڵەمەندو بەڕێزیشە، هەموو

پێویستیەكانی بەندە لای دەست دەكەوێت، وەكو خوای گەورە لە فەرموودەیەكی قودسیدا دەفەرموێت: ((يا عبادي لو أنّ أوّلكُم و آخركم و إنْسَكُم و جِنَّكُم قاموا في صَعيدٍ واحدٍ، فَسألوني فأعطَيتُ كُل واحدٍ مسألَتَهُ مانَقَص ذلكَ مما عندي إلاّ كما يَنقُصُ المخيطَ إذا أُدخِلَ البحر))[1] واتە(( ئەی بەندەكانم ئەگەر هەرهەمووتان یەكەمینتان و كۆتاییتان، وە مرۆڤ و پەریەكان لە دەشتێكی پان و بەریندا وەستان، داوایان لێ كردم ئەوا هەرچی داواكاریانە جێ بەجێی دەكەم و پێیان دەبەخشم بە هەریەكێكیان، هیچ كەم نابێتەوە لەوەی لامە، هەروەكو دەرزی ئەگەر بخرێتە ناو دەریا چەند ئاو لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ و لەو ئاوە كەم دەكاتەوە ئەوەندەش لە موڵكی من كەمدەكات ))، جا ئەگەر هەموو دروستكراوەكان سەرەتا و كۆتاییان مرۆڤ و پەرییان، داواكاری هەموویان جێ بەجێ بكات هیچ لە موڵك و سامانی ئەو كەم ناكات بە پێچەوانەی پاشاكانی دونیاوە ئەگەر لەوەی هەیانە ببەخشن ئەوە تەواو دەبێت سامان و موڵكەكەیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ ﴾

واتە: (ئەوەی ئێوە هەتانە تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی خوا هەیەتی هەر دەمێنێ و لەناو ناچێ).

پێوانەكردنی خوا لەسەر دروستكراوەكانی بەدانانی ناوەند، پێوانەیەكی پووچەڵە لەچەندین ڕووەوە .

<u>گومانی سێیەم</u>: ناوەندەكان لەنێوان خوا و بەندەدا پیاوچاكانن، وە پێگەیەكیان هەیە لای خوای پاك و بەرز، ئێمە داوا لە خوا دەكەین بەهۆیانەوە، لەبەرئەوەی ئێمە تاوانبارین و ئەوانە پیاوچاكن و بەڕێزن لای خوا ئێمەش داوایان لێ دەكەین كەلە خوا نزیكمان بكەنەوە و تكامان بۆ بكەن لای خوای پاك و بێگەرد .

---

[1] - اخرجه مسلم (٢٥٧٧) عن ابي ذر رضي الله عنه.

وەلأمی ئەو گومانەشیان ئەوەیە کە چاکەی خەڵکانی ترو کرداری کەسانی تر هیچی بۆتۆ ڕەوا نیە، کرداری ئەوان هی خۆیانەو تۆش هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ مەگەر کردەوەی خۆت بێت، جا ئەگەر خۆت کردەوەت نەبێت ئەوا هەرگیز ئەوانە هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا ۖ وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾ ﴾[1]

واتە: (ڕۆژێکی سەختی وایە کە هیچ کەسێك بۆ کەسی تر هیچی بەدەست نیە تابتوانێت بۆی بکات).

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَـٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾[2]

واتە: (لەو ڕۆژەدا برا لە برای خۆی وەلە دایكو باوکیو لە ژنیو لە کوڕەکانی ڕادەکات، چونکە هەرکەسێك سەرگەرمی کارو کێشەی خۆیەتیو نایپەرژێتە سەر ئەویتر تەنانەت پەیامبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێت هەریەکەیان دەڵێت — نفسی نفسی — خۆم خۆم).

چاکیەتی ئەوان سوود بەتۆ ناگەیەنێ تا خۆت کردەوەت نەبێت، ئەی بۆچی خۆت کردەوە ناکەیت تا ببیتە پیاوچاكو نزیك ببیتەوە لەخوا، بەڵام ئەگەر باوەڕت وابێت کە کردەوەی جگە لەخۆت نزیکت دەکاتەوە لەخوا، خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾ ﴾[3]

---

[1] الانفطار: ١٩
[2] عبس: ٣٤ ـ ٣٧
[3] البقرة: ١٣٤

واتـە: (ئەمانـە نەتەوەیـەك بـوونو ڕۆیـشتن ئـەوەی كـە كردیـان بەدەسـتی خۆیـان هەرئەوەیەو ئێوەش ئەوەی دەیكەن هەر ئەوە هی ئێوەیـە، پرسـیار لـە ئێـوە ناكرێـت دەربارەی ئەوەی ئەوان كردیان).

سوودت پێ ناگەیەنێ چاكی ئەوانو نزیكیان لـەخواوە ئەگـەر تـۆ كـردەوەی چـاكت نـەبێتو لەسـەر بیروبـاوەڕێكی ڕاستودروسـت نـەبێت، وە هـەروەها كردەوەكـەت هاوبەش دانانە.

وەڵام: هاوبـەش دانـەریش تكـای بـۆ وەرنـاگیرێ، لەبەرئـەوەی خـوای بـەرزو بـەڕێز دەفەرمووێت: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ٤٨﴾[١]

واتە: (تكای تكاكاران هیچ سوودێكیان پێ ناگەیەنێ، ئەگەر گریمان هەشبێت بۆیـان واتە ئەگەر كەسـانێكیش بیانـەوێ تكایـان بـۆ بكـەن هـیچ سـوودێكی نیـە بۆیـان). جـا هاوبەش دانەر تكای بۆ وەرناگیرێ، وە پەرسـتنی جگـە لـە خـواش، هاوبـەش دانانـە، ئەگەر تۆش وا گومان ببەی كە بۆیە دەیانپەرستیت تا ببن بەناوەند بۆت لای خـوا ئـەوا تۆ هاوبەش دانەری بۆ خوا، هاوبەش دانەریش تكا هیچ سوودێكی نیـە بـۆی، جـا بۆیـە پێویستە كردەوەت چاك بكەیت لەگەڵ خوای پاك وبێگەردا، ئاوریش مـەدەرەوە بـەلای كردەوەی كەسانی تردا چونكە بۆ خۆیانە، چاكییانو كردەوەیان تەنها بۆ خۆیانە، هیچ سوودت پێ ناگەیەنێ تەنها كردەوە چاكەكانی خۆت نەبێت، جا ئەگەر خۆت كردەوەی باشت نەبێت هیچ كەسێك سوودت پێ ناگەیەنێ با ئەو كەسـە نـزیكترین كەسـیش بێـت لای خوا .

[١] المدثر: ٤٨

گومانی چوارەم: کە بریتیە لە گومانێکی بەهێزو فراوان لایان: کە عومەر ڕەزای خوای لێ بێ ئەگەر تووشی ساڵی نەهاتیو بێ بارانی ببوایە ئەوە داوای بارانی لە خوای گەورە دەکرد بە عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو داوا لەخوا بکە با بارانمان بۆ ببارێنێتو دەیفەرموو (( ئەی خوای گەورە ئێمە تەوەسولمان پێ دەکردی بەدوعای پێغەمبەر ﷺ تۆش بارانت بۆ دەباراندین، وە ئێمە ئێستا تەوەسولت پێ دەکەین بەدوعای مامی پێغەمبەر ﷺ دەی بارانمان بۆ ببارێنە، جا خوای گەورە بۆی دەباراندن، عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەیفەرموو هەستە ئەی عەباس بپاڕێرەوە. عەباس هەڵدەستاو دەپاڕایەوە بۆیانو خواش پاڕانەوەکەی وەردەگرتو وەڵامی دەدانەوە ))[١]

هاوبەش دانەران وتیان: عومەر تەوەسولی کرد بە عەباس ئەم کارەشی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دانانی نێوەند لەنێوان خواوبەندەدا ڕێگە پێدراوەو ڕەوایە .

لەوەڵامیاندا دەڵێین: پاکو بێگەردی بۆ خوا، عومەر تەوەسولی بەپاڕانەوەکەی عەباس کرد نەك بە خودی عەباس خۆی یان بەڕێزیەکەی لای خوا بەڵکو تەوەسولی بەپاڕانەوەکەی کردو فەرموی: هەستە بپاڕێوە، داوای پاڕانەوەش لەپیاوچاکان کارێکی دروستەو ڕاستە، وە پێغەمبەریش ﷺ بە عومەری ڕەزای خوای لێ بێ کە دەیویست بچێت بۆ ئەنجامدانی عەمرەو خواحافیزی لێکردو پێی فەرموو ((لا تنسنا يا أخي من صالح دعائك)).[٢]

واتە ((ئەی براله لە دوعاو پاڕانەوە چاکەکانت لەبیرمان نەکەیت))، داوای پاڕانەوە لە پیاوچاکانی زیندوو کارێکی دروستە، بەڵام مردوو داوای هیچ شتێکی لێ ناکرێت،

---

١- أخرجه البخاري برقم (١٠١٠) من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه

٢- أخرجه احمد (١٩٥)، وابو داود (١٤٩٨)، والترمذي (٣٥٦٢)، وابن ماجه (٢٨٩٤) من حديث عمر بن الخطاب رضي الله عنه، وقال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح .

بەڵام پیاوی چاکی زیندوی ئامادە دروستە بۆت کە داوای لێ بکەی بۆت بپاڕێتەوە لەخوا یان بپاڕێتەوە بۆ موسڵمانان، وەهەروەها موعاویە رەزای خوای لێ بێ کاتێك لەسەردەمی ئەویشدا بێ بارانی بوو ویستی نوێژە بارانە بکات فەرمانی بە یەزیدی جورەشی کرد کە ئەویش ((إبن الاسود)) بوو کەلەخوا بپاڕێتەوە ئەویش لەخوا پاڕایەوە[1] وە لەبەرئەوەش شەرع زانان لەباسی نوێژە بارانەدا باسیان کردووە کە دروستەو کارێکی باشە داوا لە پیاوچاکان بکرێت کە بپاڕێنەوە لەخوا کە باران ببارێنێت[2] واتە بەپاڕانەوەکانیان، ئەگەر مەبەست بە تەوەسول کردن لەبەر خودی خۆیان و گەورەییان و ڕێزیان بوایە ئەوا هەرگیز هاوەڵان لە پێغەمبەر ﷺ لایان نەدەدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ پلەو پایەو گەورەیی لای خوا هەرمابوو بەمردنی پلەو پایەو گەورەیی لەدەست نەدابوو لای خوا، لەگەڵ ئەوەشدا نەپاڕانەوە لەخوا بەگەورەیی پێغەمبەر ﷺ وەنەڕاستیەتی و نە کرداری پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کارە لەگەڵ ئەوەی گەورە هەر پێغەمبەر ﷺ بوو وەباشترین دروستکراوبوو بەڵام لایاندا لێی بۆ مامەی کە هەرگیز بە ئەندازەی برازاکەی ﷺ پلەو پایەو گەورەیی نەبوو، لادانیشیان لە گەورەوە بۆ بچوکتر لەو تەنها لەبەرئەوە بوو کە گەورەکە (پێغەمبەر ﷺ) مردبوو وە مردوویش داوای هیچی لێ ناکرێ بەڵکو داوا لە زیندوو دەکرێت، داوای ماڵ و پاڕانەوەو یارمەتی لێ دەکرێت ئەگەر توانای بەسەردا هەبوو وە ئامادەیش بوو، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾[3]

واتە: (لەسەر چاکەو کۆمەك و هاوکاری و پارێزگاری، یارمەتی یەکتر بدەن). ئەوە بەرپەرچ دانەوەیانە لەکێشەی داواکردنی عومەر لە عەباس بۆ باران بارین رەزای خوا

---

[1] - أخرجه ابو زُرعة الدمشقي في التأريخ (١/٦٠٢)، واللالكائي في شرح إعتقاد اهل السنة (٩/٢١٤، ٢١٥) وصحح اسناده الالباني، وقال إبن المُلَقن : (مشهور، قال النووى) خلاصة البدر المنير (١/٢٥٢)

[2] - أنظر : المغني (٣/٣٤٦)، الكافي (١/٥٣٥)

[3] المائدة: ٢

لەهەردووكیان بێت، عومەر ﷺ تەوەسولی بە خودی عەباس و ڕاستیەتی و ڕێزو گەورەیی عەباسەوە نەكرد چونكە ئەوە كارێكی پووچە، بەڵكو عومەر ﷺ تەوەسوڵ بە پاڕانەوەی عەباسەوە ﷺ كردو فەرمووی هەستە بپاڕێوە، ئەوەش كارێكی ڕێگە دراوەو قەیناكە. لەم كاتەشدا:

یەكەم: داوا لێكردنی ڕەواو ڕێدراو، كە چەند جۆرێكە:

١ – پاڕانەوە لە خوای گەورەو داوالێكردنی بەناوەكانیو سیفەتەكانی خوای بەرزو پاكوبێگەرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾ [1]

واتە: (ناوەكانی خوا هەموو جوانو پڕشكۆن، دەسا ئێوەش هەربەو ناوانەوە بانگی بكەن، لاڵەو نزاو داوا هەر بەو ناوانە بكەن).

بپاڕێنەوەو داوا بكەن پێیان واتە بەو ناوە جوانانە داوا لەخوا بكەنو بیانكەنە وەسیلەی نێوان خۆتانو خوا لەكاتی پاڕانەوەكاندا، دەڵێی ئەی ڕەحمان بەزەییت پیامدا بێتەوە، ئەی غەفور لێم خۆشببە، ئەی كەریم ڕێزم پێ ببەخشەو بەڕێزمكە. ئەی دەوڵەمەند دەوڵەمەندمكە، وە بەوشێوە داوای لێ بكە بە ناوەكانی خۆی- هەروەكو چۆن ئەیوب سەلامی خوای لێ بێ داوای لێكردو فەرمووی: ﴿۞ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٨٣﴾﴾ [2]

واتە: (بێگومان دووچاری بەلاو نەخۆشیەك بووم ئەتۆش لەهەموو خاوەن بەزەییەكان بەبەزەیی تری).

---

[1] الأعراف: ١٨٠

[2] الأنبياء: ٨٣

داوای لەخوا كرد بەوەی كەلەهەموو خاوەن بەزەییەكان بەبەزەیی تره خواش وەڵامی دایەوەو بەهانایەوە چوو .

وە یونس سەلامی خوای لێ بێت لەكاتێكدا كەلە زكی حووتەكەدا بوو لەناو چەندین تاریكاییدا، تاریكی دەریاو تاریكی شەوو تاریكی سكی حووتەكەدا داوای لەخوا كردو فەرمووی: ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ﴾[1]

واتە: (لەناو تاریكستانی شەوو دەریاو ناو سكی نەهەنگەكەدا هاوارو بانگی لەخوا كردو وتی: پەروەردگارا بێ لەتۆ هیچ پەرستراوێك شك نابەمو هەرتۆش لەهەموو عەیبو نەنگێك خاوەن ڕائەگرم، بێگومان من لە ڕیزی ستەمكاران بووم، ستەمم لەخۆم كردو پەشیمانم، سا ئێمەش بەهانایەوە هاتینو وەڵاممان دایەوە لەو تەنگانەو غەمو پەژارەیەی تێی كەوتبوو ڕزگارمان كرد).یونس ﷺ داوای لەخوا بەیەكتاپەرستی كرد لاإله إلا أنت، وە هاناو هاواری بۆ لای خوا بەپاكڕاگرتنی لە لەنگی كرد واتە خاوێن ڕاگرتنی خوای گەورە، وە داوای لە خوا كرد بە دانانان بە تاوانەكەیدا ( بێگومان من لەڕیزی ستەمكاران بووم ) خواش وەڵامی دایەوەو بە هانایەوە چوو .

٢- هەروەها داواكردنو پاڕانەوە بە پاڕانەوەی پیاوچاكانی زیندووەوە ڕەواو ڕێگە پێدراوە، هەروەكو چۆن عومەر رضي الله عنه داوای پاڕانەوەی لە عەباس رضي الله عنه كردو هانای بۆ برد[2] وە هەروەكو چۆن موعاویە رضي الله عنه هانای بۆ یەزیدی جورەشی رضي الله عنه بردو[3] داوای پاڕانەوەی لێكرد تا بارانیان بۆ ببارێت لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، هەر لەبەر

---

[1] الأنبياء: ٨٧ – ٨٨

٢- تقدم تخريجه.

٣- تقدم تخريجه.

ئەوەشە شەرع زانان لەباسی نوێژە بارانەدا بەڕەوایان دانـاوە داوای پاڕانـەوە لەپیاوچاکانی زیندووی ئامادە (( بەڵام با پیاوچاکیش بێت ئەگەر مردبوو نابێت، وە ئامادەش نەبێت دەم بەدەم بەهەمان شێوە نابێت واتە نابێت ئەم لەشارێو ئەو لەشارێکی تر بێتو بەوشێوەیە .. وەرگێڕ )) . وەکو چۆن عومەر ﷺ ئەو کارەی کرد، مەبەستیش بەخودی خۆیانو ڕاستیەتی خۆیان نەبووە لەبەرئەوەی گەورەن، هانا بردنو داوا لێکردن بە گەورەیی‌و دروستی کەسەکەو پلەوپایەی کەسەکە لای خوا ئەمانە هەرهەمووی هانابردنو داوالێکردنێکی داهێنراوو قەدەغەکراون وە ڕێگەیەکیشە لە ڕێگەکانی هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە .

دووەم: داوالێکردنی قەدەغەکراو، بریتیە لە هانا بردن و داواکردن لەخوای گەورە بەخاتری گەورەیی کەسێكو دروستی کەسەکە لای خوا یان بە خودی کەسەکە، ئەوە داوالێکردنێکی قەدەغەکراوە، وە ڕێگەیەکیشە لەڕێگەکانی هاوبەش دانان، بۆیە پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان داوالێکردنی ڕەواو ڕێدراو لەگەڵ داوالێکردنی قەدەغەکراودا .

زانای پایەبەرز تقی الدین إبن تیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەپەرتووکی

(( التوسل والوسیلة – داوالێکردنو هۆ بەکارهێنان بۆ نزیکبوونەوە لەخوا ))دا باسی کردووە کەبەهۆی داپۆشینو تێکدانی نێوان جۆرەکانی داوالێکردن – التوسل – لەم بابەتەدا هەڵە ڕویداوە، بۆیە پێویستە مرۆڤ شارەزای داوالێکردنی ڕەواو ڕێدراوو داوالێکردنی قەدەغەکراو ببێت تا نەکەوێتە ناو تێکدانو هەڵەوە، ئەوە بابەتێکی زۆر گەورەیە، پێویستە گرنگی پێ بدرێ تا کارەکە تێکەڵاو نەکرێت، لەبەرئەوەی گومانەکانی ئەوانەی گومڕاکەرن باڵی بەسەر هەندێ خەڵکی بەگشتیدا کێشاوە، بۆیە پێویستە وەڵامی لەبارەیەوە بزانیت تا ڕووپۆش نەکرێنو خەڵکی چەواشە نەکرێت دەربارەی زانینی مانای ((التوسل والوسیلة)).

زانـای پایەبـەرز (محمـدی كـوڕی عبـدالوهاب) ڕەحمـەتی خـوای لێ بێت فـەرمووی: ((هەركەسێك لەنێوان خۆیو خـوادا چـەند ناوەنـدێك دابنـێ و هاواریـان بكـاتیو لێیـان بپاڕێتەوە وەك ئەوەی بڵێت: ئەی ئەحمەدی بـەدەوی، ئـەی عبـدالقادر، ئـەی حـسێن، ئەی عەلی، ئەی فلان بەهاوارمەوە بێو ڕزگارمكە، شیفای نەخۆشەكەم بدە، ونبوەكەی بۆ بگێڕەوە، بانگیـان دەكـەنو هاواریـان دەكـەنیو ناویـان دێـنن یـەك یـەك، ئـا ئـەوە هاوبـەش دانـانی گەورەیـە، لەبەرئـەوەی پاڕانەوەیـە جگـە لـەخوا، وە پاڕانـەوەش لەگەورەترین جۆرەكانی پەرستنە، هەروەكو پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (الـدعاء هـو العبادة)[1] واتە ((پاڕانەوە پەرستنە )) واتە گـەورەترین جۆرەكـانی پەرسـتن، جـا ئەگـەر جگەلە خواپاڕایەوە ئەوە گەورەترین هاوبەش دانانە بۆ خوا پـەنا دەگـرین بـەخوا، جـا ئەگەر لەفریشتەیەك یان پێغەمبەرێك یان پیاوچاكێك یان پەریەك یان مرۆڤێك پاڕایەوە.

هـەروەها زانـای شـارەزا بەئیـسلام ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت باسـی كـردووە كـە شـەیتانەكان خۆیـان دەخەنـە سـەر شـێوەی مردوەكـان دەردەچـن بـۆلای خـەڵكی لەتەنیشت گۆڕەكانداو دەڵێن ((من فلانە كەسم خاوەنی گۆڕەكە چیت دەوێت؟)) ئـەوە شەیتانێكەو خۆی لەوێنەی مردووەكـەدا نیشان دەدات خـەڵكیش واگومـان دەبـەن كـە ئەوە مردووەكەیە، ئەوە مانای ئەوەیە كە شێخ باسی كـردوە . منـیش دەڵـێم: هەنـدێ جاریش دەستیان درێژ دەكەن وەكو دەڵێن كـە پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی درێـژ كـرد بـۆ ڕەفاعی و تەوقەی لەگەڵدا كرد، ئەوەش درۆیە با ڕوویشی دابێت چونكە ئـەوە شـەیتان بووە دەسـتی درێـژ كـردووە، لەبەرئـەوەی شـەیتانەكان خۆیـان دەخەنەسـەر شـێوەی خاوەن گۆڕەكانو جێ نزرگـەكان، یـان لـەناو گۆڕەكانـەوە قـسەدەكەنو خـەڵكیش ڕا گومان دەبەن كە مردووەكەیە قسەدەكاتو گوێیان لێیە، جا ئەوەی گوێی لە دەنگەكـە

---

١- أخرجه احمد (١٨٣٨٦)، وابوداود (١٤٧٩)، والترمذي (٣٢٤٧)، وابن ماجة (٣٨٢٨) مـن حـديث النعمان بن بشير رضي الله عنه وقال الترمذي هذا حديث حسن صحيح.

دەبێت وادەزانیّ‌و گومان دەبات کە دەنگی مردووەکەیە، وە ئەوەش گەلێك جار ڕووی داوە، شەیتانیش ئەوکارە بۆیە دەکات تا هەڵیان خەڵەتێنیّ‌و تووشی هاوبەش دانانیان بکات بەوەی کە بیّ ئاگان لێی‌و نایزانن، ئەوانیش لە گۆڕەکە دەپاڕێنەوەو داوای تکای لیّ دەکەن .

تکاکردنیش ڕاستو دروستە بەڵام داوا لە مردووەکان ناکریّ بەڵکو تەنها داوا لەخوا دەکرێت، دەڵێین (( خوایە بمخەرە بەر شەفاعەتی پێغەمبەرەکەت ﷺ )) (( خوایە بمخەرە بەر شەفاعەتی بەندە چاکەکانت لەکاتێکدا کە تکا دەکەن )) مەوەستە لای گۆڕو بڵێیت: ئەی فلانە کەس یان ئەی پێغەمبەر ﷺ تکام بۆ بکە، لەبەرئەوەی داواناکرێت لە مردوو هیچ شتێك، بەڵکو دەبێت تەنها داوا لەخوا بکرێت، تکاکردن‌و شەفاعەت تەنها موڵکی خوایەو موڵکی هیچ کەسێکی دی نیە . شەفاعەت ( تکاکردن ) نابێت تەنها بەدوو مەرج نەبێت:

**مەرجی یەکەم**: کە خوای گەورە خۆی ڕیّ بدات پێی .

**مەرجی دووەم**: ئەو کەسەشی کە تکای بۆ دەکرێت دەبێت لە یەکتاپەرستان بێت، هاوبەش دانەرنەبێت، ئەو دوو مەرجەش وەرگیراون لە قورئانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ﴾[1]

واتە: (کیّ بێت لەڕۆژی دواییدا بتوانیّ شەفاعەت بکات لای ئەو، هەتا ئەو خۆی مۆڵەتی نەدا ؟ دیارە کە هەتا ئەو خۆی مۆڵەتی نەدات هیچ کەسێك ناتوانێت تکا بکات، هاوبەش دانەرەکان پێیان وابوو کە بتەکان دەتوانن شەفاعەتیان بۆ بکەن).

وە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾[2]

واتە: (لە دواڕۆژیشدا تکاو شەفاعەت ناکەن، مەگەر بۆ کەسێك خوا خۆی ڕازی بێت لێی‌و خاوەن بڕواو موسڵمان بێت).

---

[1] البقرة: ٢٥٥

[2] الأنبياء: ٢٨

واتە خوا لە گوفتارو کرداری ڕازی بێتو یەکتاپەرستیش بێت، بەڵکو کەسی هاوبەش دانەر خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾﴾[١] واتە (( تکای تکاکاران هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت )) .

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾﴾[٢] واتە: (ئەوکات ستەمکاران هیچ دۆستێكو پشتیوانێکیان نیە بتوانێ کەڵکیان پێ بگەیەنێ، وە هیچ تکاکارێکیشیان نیە تکای وەربگیرێ، هەموو پەیوەندیەك دەپچڕێ)، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾﴾[٣]

واتە: (فریشتەیەکی زۆر لە ئاسمانەکاندا هەن تکایان هیچ کەڵك نابەخشێ بۆ پەرستیارەکانیان، مەگەر ئەو بتانەی ئێوە چۆن تکایان وەردەگیرێ بۆتان ؟! مەگەر پاش ئەوەی هەرکەسێك خوا خۆی بیەوێ ڕازی بێ مۆڵەت بدات فریشتە تکای بۆ بکات، ئەوەش بۆ پیاوە چاكو یەکتاپەرستەکان دەبێت).

خوای پەروەردگار باسی هەردوو مەرجەکەی کرد: ﴿مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾﴾[٤] ئەوە مەرجی یەکەم ﴿وَيَرْضَىٰٓ﴾ ئەوەش مەرجی دووەم .

خواش ڕازی نابێت مەگەر موسڵمان بێتو یەکتاپەرست بێتو هەرگیز لە هاوبەش دانەران ڕازی نیەو نابێت .

کەواتە شەفاعەت حەقو دروستە تەنها داوا لە خوای بەرزو بەڕێز دەکرێت بۆی، بەڵام داواکردنی شەفاعەت لە مردووان پووچو بەتاڵە، قسەکەشیان پووچ بوویەوە کە

[١] المدثر: ٤٨
[٢] غافر: ١٨
[٣] النجم: ٢٦
[٤] النجم: ٢٦

دەڵێن ئەوان داوای شەفاعەت لە مردووەكان دەكەن وە دەشڵێن شەفاعەت حەق و ڕاستە، ئێمەش دەڵێین: بەڵێ شەفاعەت حەقە بەڵام داواكردنی لە مردووەكان بەتاڵەو پووچە، بەڵكو بەتاكو تەنها دەبێت داوا لەخوا بكرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا﴾[1]

واتە: (بڵێ تكاو شەفاعەت هەرهەمووی تەنها بۆ خوایە).

تكاكردن موڵكی خوایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾[2]

واتە: (وە ئەو پەرستراوانەی ئەوان لەباتی خوا هاواریان لێ دەكەن و دەیانپەرستن دەسەڵاتی شەفاعەت و تكایان نیە، بەڵام كەسێك شایەتی بەحەق دابێ و بڕوای هێنابێت وەك فریشتەكان و عوزەیرو عیسا ئەوانە دەتوانن داوای شەفاعەت بكەن وە ئەوان دەزانن حەقیقەتی شایەدەكەیان).

واتە شایەتی لاإلەإلاالله دەكات، وە﴿وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە مانای ئەم وشەیە دەزانن و كردەوەشی پێ دەكەن، بەتەنها دەربڕینی ئەم وشەیە بەس نیە لەهەمان كاتیشدا ماناكەی نازانێ و یان دەیزانێ بەڵام كردەوەی پێ ناكات، ئەوە هیچ سوودێكی پێ ناگەیەنێ، وە هەروەها داواكردنی شەفاعەت لە زیندوویەكی ئامادە بەواتای ئەوەی كە داوای پاڕانەوەی لێ بكەی و بڵێی ئەی فلانە كەس داوا لەخوا بكە بۆم بەوەو بەوە. هەروەكو چۆن عومەرﷺ داوای پاڕانەوەی لە عەباسﷺ كرد، وە هەروەكو چۆن خەڵكی لەڕۆژی قیامەتداو لەمەیدانی حەشركردندا داوا لەپێغەمبەر ﷺ دەكەن.

[1] الزمر: ٤٤

[2] الزخرف: ٨٦

<u>گومانی پێنجەم</u>: هاوبەش دانەرە سەرەتاییەكانو پێشینەكان هاواریان لە بتەكانو شەیتانەكانو پەری دەكرد بەڵام ئێمە هاوار لە خەڵكانی چاك دەكەین، جا ئێوە چۆن پیاوچاكانو بتەكان وەك یەك سەیر دەكەن، دەڵێین: پاكو بێگەردی بۆ خوا! ئایا ئێوە قورئان ناخوێننەوە، ئایا هاوبەش دانەرەكانی پێشین داوای تكایان لە فریشتەكان نەدەكرد كە لە چاكان بوو، وە داوای تكایان لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت نەدەكرد لە دوای مردنیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾[1]

واتە: (جگە لە خوا شتانێك دەپەرستن كە نە سودیان پێدەگەیەنێت نەزیانیشیان لێدەدات، وە دەشڵێن ئەوانە تكاكارمانن لای خوا).

وە ئەوانە فریشتەكانو عوزێرو عیسا دەپەرستن ئەوانەش خەڵكانێكی چاك بوون جا نەفامو نەزانەكان جۆراو جۆرن لە پەرستنەكانیاندا، هەیانە بتەكان دەپەرستنو هەیانە خۆرو مانگ دەپەرستن، وە هەیانە كە دارو بەرد دەپەرستن، وە هەیانە فریشتەكانو پیاو چاكان دەپەرستن: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ ﴾[2]

واتە: (ئەوانەی كە لە باتی خوا چەند دۆستو بتێكیان گرتووە، بە بێ هیچ بەڵگەیەكیش ئەڵێن: ئێمە هەر بۆ ئەوە ئەو بتانە دەپەرستین كە لە خوامان نزیك بكەنەوەو تكامان بۆ بكەن لای، كەچی ئەگەر پێیان بواترایە كێ ئێوەی دروست

[1] یونس: ١٨

[2] الزمر: ٣

کردووە؟ کێ ئاسمانەکان‌و زەوی بەدیهێناوە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: هەر (الله) یە ئیتر پێیان ئەوترا: ئەی بۆچی خوا بە تاک‌و تەنەها نا پەرستن؟ وشەی (ما نعبدهم)وەڵامیان بوو، جا با هەر وابکەن بێگومان خوا حەق‌و ناحەق جیا ئەکاتەوەو بڕیاری خۆی دەربارەی ئەو دووبەرەکیەی نێوانیان دەدات، ئەوکات موسوڵمانان بۆ بەهەشت‌و بێ باوەڕنان بۆ دۆزەخ دەنێردرێت، دیارە ئەو جۆرە کەسانە گومڕاو سەر لێشێواون، خواش بەڕاستی مرۆڤی درۆزن‌و سپڵە ڕێنوێن ناکات).

جیاوازی نییە لە نێوان پەرستنی دواییەکان بۆ گۆڕەکان لەگەڵ پەرستنی یەکەمیەکان لە هاوبەش دانەران، پەرستشی هاوبەش دانەرانی پێشین کە تەنها لەسەر بت پەرستی نەوەستابوو وەکو دەڵێن، وە لەسەر پەرستنی دارەکان‌و بەردەکان نەوەستاون، بەڵکو هەیان بووە کە پیاو چاکانیان دەپەرسستن بە بەڵگەی قورئان، خوای گەورە باسی کردووە کە ئەوان فریشتەکانیان دەپەرست، وە خەڵکانێك لە بەنەدەکانی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾[1]

واتە: (ئەوانەی ئەوان دەیانپەرستن‌و هاناو هاواریان بۆ دەبەن خۆشیان وەسیلە دەگرنە بەر بۆ لای پەروەردگاریان تاوەکو نزیکتر ببنەوە)، کارەکە زۆر ڕوونەو دیارە بەڵام هەڵەکان لای ئەوان لە ژماردن نایە، بۆیە پێویستە لەسەر فێر خوازی زانستی شەرعی کە لەسەر چاو ڕۆشنی بێت بەم کارانە بە تایبەتی ئەوانەی کە دەچنە ڕێڕەوی بانگەواز کردنەوە بۆ لای خوای گەورە، لەبەر ئەوەی دوچاری ئەم گومانانە دەبنەوە لە لایەن ئەوانەوە بۆیە پێویستە ئەم شتانە بزانن‌و شارەزا بن، لە پێناو ئەوەی بتوانن پەرچی ئەو گومان کارانە بدەنەوە کە خەڵکیان لە ناو بردووە بە گومانەکانیان.

---

[1] الإسراء: ٥٧

گۆڕ پەرستەکان پشت بە مردووەکان دەبەستن، هەتا بە مردووەکە دەڵێن ئەی فلان من هەر هی تۆم‌و پشت بە تۆ دەبەستم، وە پشت نابەستن بە خوای بێگەردو پاك‌و بەرز، لە زمانیانەوە زیکری خوا نابیستی بەڵکو هەمیشە زمانیان لە خزمەت ئەمانەدایە کە دەیان پەرستن جگە لە خوا، پشتیان پێدەبەستن‌و جێگەی متمانەیانن، وە پشت بەستنیش لە گەورەترین جۆرەکانی پەرستنە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾[1]

واتە: (باوەڕدارانی راستەقینەو دڵسۆز هەر ئەوانەن کە هەر ناوی خوا هێنرا دڵیان لەبەر گەورەیی ئەو دەکەوێتە لەرزە وە ترسی لێدەنیشێت، هەر کە ئایەتەکانیش دەخوێنرێنەوە بەسەریاندا باوەڕیان زیادو بەهێز دەبێت، هەر بە پەروەردگاریشیان پشت دەبەستن پەنایان هەر بەوە).

واتە لە سیفەتی باوەڕدارانە کە بە پەروەردگاریان پشت دەبەستن، لە ئایەتەکەدا مەعمولە کە پێشخراوە بۆ گەمارۆدان ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ وە نەیفەرموە پشت دەبەستن بە پەروەردگاریان بەڵکو فەرموی: بە پەروەردگاریان پشت دەبەستن (پێشکەوتنی (جارو مەجرور) کە مەعمولەکەیە لەسەر عامیلەکە بۆ سودی گەمارۆدان‌و قەتیس کردنە، بۆ وێنە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ الفاتحة: ٥ ناپەرستین جگە لە تۆ ئەوە بە هێزترە لەوە کە بوترێ (نعبدوك) دەتپەرستین، لەبەر ئەوە دەتپەرستین گەمارۆدان ناگەیەنێ واتە (تەنها خوا).

---

[1] الأنفال: ٢

بەڵام بە تەنها تۆ دەپەرستین، گەمارۆدانو قەتیس كردن دەگەیەنێت: پشت بەستن بە خوا پەرستنێكی زۆر گەورەیە كە بریتیە لە متمانە بەخواو گەڕانەوەی هەموو ئەوكارانە بۆ لای ئەو ئەمەش قەدەغەی ئەوە ناكات كە هۆكاری بەسود بگرێتە بەر لەگەڵ پشت بەستن بە خوا هەردووكیان كۆ دەكاتەوە (واتە گرتنە بەری هۆكاری بەسود لەگەڵ پشت بەستن بە خوای گەورە.. وەرگێڕ).

تەنها پشت بەستن ناگرێت و هۆكارە بەسودەكان پشت گوێ بخات، وە متمانەش ناكاتە سەر هۆكارەكانو پشت بەستن بە خوا پشت گوێ بخات، بەڵكو هەردووكیان كۆ دەكاتەوە، ئەوەش ئیشی ئیماندارە، وە پێغەمبەریش ﷺ گەورەترین كەس بووە لە پشت بەستن بە خوا لەگەڵ ئەوەشدا هۆكاری گرتۆتە بەر، هێزی ئامادە كردووە بۆ جیهادكردن، كراسی شەڕو زرێو قەڵغانی بەكار هێناوە لە جیهادكردنیدا، ئەمانە هۆكاری بەسودن **بإذن الله**، هەر لەبەر ئەمەشە كە دەڵێن: (متمانە نەكردن بەس لەسەر هۆكارەكان هاوبەش دانانەو واز هێنان لە هۆكارەكانیش تانە دانە لە شەریعەتی ئیسلام، لەبەر ئەوە دین هاتووە بۆ وەرگرتنی هۆكارە بە سودەكانو بەكار هێنانیان)

ئەو هاوبەش دانەرانە پشت بەمردووەكانو دارەكانو بەردەكانو دروستكراوەكان دەبەستن، وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (من تعلق بشيءٍ وكل اليه)[1]

واتە: (هەر كەسێك خۆی بەشتێكەوە پەیوەست بكات دەدرێتەوە دەست ئەو شتە).

(واتە: باوەڕی بە هەر شتێ هەبێ سودی پێبگەیەنێ زیانی لێ دوربخاتەوە دەدرێتە دەستی وەكو ئەوەی باوەڕی وابێ ناڵ چاو پیس لا ببات یان توێكڵەداری سەر گۆڕ برنجو شەكرو ڕۆنو چای بۆ زیاد بكات ئەوە خوای گەورە دەیداتەوە دەستی ئەو

---

[1] اخرجه احمد (١٨٧٨١)، والترمذی (٢٠٧٢)، والحاكم (٤/٢١٦)و حسنه محققو المسند، وذكروا شواهدة فانظرها.

شتانە كە هەمووی هاوبەش دانانە بۆی.. وەرگێڕ). هەركەسێك خۆی پەیوەست بكات بە خواو پشتی پێببەستێت بەسیەتی خوا بۆی، وە هەركەسێكیش پشت بە جگە لە خوا ببەستێت خوای گەورە دەیداتە دەست ئەو دروست كراوە لاوازە، تیا دەچێ چونكە پشتی بە جگە لە خوا بەست لە كاتێكدا كە هەر پشت بە خوا دەبەسترێت لە هەموو شتێكدا پشت بە لاوازێكی وەكو خۆی یان لە خۆشی لاوازتر بەست گومانیشی تێدا نیە كە زیندوو وەكو مردوو نیە چونكە زیندوو دەتوانێ بڕواتو بخواتو بخواتەوە شت بە دەست بێنێو كار بكات، بەڵام مردوو بێگومان كاری تەواو بووە، جا چۆن ئەگەر مردن كردنیان بە خوا جگە لە خوای گەورە لە كاتێكدا ئەمانە مردوون هیچیان بەدەست نیە تەنانەت بۆ خۆشیان، ناتوانێ هیچ شتێك بەدەست بێنێ بۆ خۆی لە بارمتەدایە، جا چۆن پشتی پێ دەسپێرێتو متمانە دەكرێتە سەری داوای پێویستەكانی لێدەكرێ كەهیچی لا نییەو ناشتوانێ؟ بەڵام ئەگەر پاكیەتی مرۆڤ هەڵگەڕایەوە چاولێكەری كوێرانە دێت شەیتانیش ئەم شتانە بۆ مرۆڤ جوان دەكات، بەڵكو تەنانەت ئەمان لەم شتانە ناو دەنێن بە یەكتا پەرستی وە یەكتا پەرستیش بە بێ باوەڕیو هاوبەش دانان دادەنێن، وە هەركەسێكیش كە ملیان بۆ نەدات پێیان بڵێ كە ئەم كارانە خراپە دەڵێن تۆ دۆستانی خوات خۆش ناوێت، لەبەر ئەوە هاواریان ناكەیتێو حەیوانیان بۆ سەرنابڕێ، شت لەسەر خۆت پێویست ناكەیت بۆ یان، خۆشەویستی دۆستانی خوا لای ئەوان ئەوەیە كەبكرێتە هاوەڵ بۆ خوا، بەڵێ..... ئێمە دۆستانی خوامان خۆش دەوێتو شوێنیان دەكەوینو بۆیان دەپاڕێینەوە بەڵام كە بیانكەینە هاوبەشی خوا لەگەڵ خوای پاكو بێگەردا خۆمانیان لێ نزیك بكەینەوە بە پەرستش كردن بۆیان ئەمە هیچ كات خۆشەویستی پیاو چاكانو دۆستانی خوا نیە بەڵكو هاوبەش دانانە بۆ خوا، وە پیاو چاكانیش ڕازی نابن بە هاوبەش دانان یان بت پەرستن لەگەڵ خوای بەرزو بەڕێزدا، جا كێ پیاو چاكانی خۆش دەوێ؟ یەكتاپەرستە

کە پیاو چاکانی خۆش دەوێ‌و بە دۆستانیان دەزانن‌و بۆیان دەپاڕێنەوە وە شوێنیان دەکەون‌و داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات، نەك وەك کەسێ دەیانپەرستێ جگە لە خواو، ئاژەڵیان بۆ سەردەبڕێ‌و لەسەر خۆی شت پێویست دەکات بۆیان، کە ئەوان خۆیان پێی رازی نین‌و هیچیشیان بەدەست نییە، تۆ ئەگەر بێیت‌و بە یەکێك بڵێی لە خەڵکی: تۆ پاشای، وا هەست دەکات کەتۆ گاڵتەی پێدەکەیت؟ ئایا بە مرۆڤی سادە دەوترێت تۆ پاشای یان هاوشێوەی پاشای؟ وا دادەنێ ئەو قسە کردنە گاڵتە کردنە پێی لە کاتێکدا لە شوێنێکدا کە نەگەیشتووە پێی، ئەو کەسەی پیاو چاکان دەخاتە شوێنی خواو کارەکانی خوا بە هی ئەو دەزانێ لە ڕاستیدا لە ڕێزیانی کەمکردۆتەوەو بە سوکی زانیون‌و خۆشی ناون، بەڵکو کەسانی ئەوانی خۆش دەوێ کە شوێنیان دەکەون‌و بۆیان دەپاڕێنەوە.




پرسیار: جیاوازی چیە لەنێوان هەڵوەشێنەرەی یەکەمو دووەم؟

وەڵام: دووەم جۆرێکە لە یەکەم، یەکەم گشتییەو ئەوە تایبەتەییە، زانای پایەبەرزیش جەختی کردۆتەوە لەسەری چونکە بوونی هەیە لە ناو خەڵکدا، لە پەرستنی جیّ نەزرگاو پەرستنی گۆڕەکانو دۆستانو پیاوچاکان ئەمە زۆر بوونی هەیە لە ناو خەڵکدا، بەڵام پەرستنی بەردەکانو دارەکان جگە لەمانەش، ئەمەیان کەس لە موسوڵمانان بە زۆری دانی پیانانیّ، بەڵام پەرستنی گۆڕەکان زۆرێك لەوانەی خۆیان بە موسوڵمان دەزانن، دانی پیادەنێینو بە بەشێك لە ئیسلامیشی دەزانن، لەبەر ئەوە جەختی کردۆتە سەری باسی کردووەو تایبەتی تری کردووە، ئەمە جۆرێکە لە یەکەم، بەڵام دووەمیان بوونی هەیە، لە ژیانی زۆرێك لەوانەی خۆیان بە موسوڵمان دەزانن، ناڵێن موسوڵمانان بەڵکو دەڵێین خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلامو خۆیان بە موسوڵمان دەزانن.

پرسیار: جیاوازی چییە لە نێوان کەسێکدا کە ناوەندەکە وەك هۆکارێك بگرێت لەگەڵ کەسێکدا کە ئاژەڵی بۆ سەربڕیّ یان چەمینەوەو کڕنوشی بۆ ببات، ئایا جیاوازی هەیە لە نێوانیاندا؟

وەڵام: ئەگەر هاواری بکاتیّو لێی بپاڕێتەوە ئەوە هەڵوەشێنەری یەکەمە، بەڵام ئەگەر هاواری نەکاتیّو ئاژەڵی بۆ سەرنەبڕیّ شت لەسەر خۆی پێویست نەکات بۆی، بەڵام وا گومان دەبات کە هۆیەکە دەیگەیەنێتە خوا دەڵێین ئەمە داهێنراوە و هۆکارێکە بۆ هاوبەش دانان لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەوەی نەکردۆتە هۆکار بۆ ئـ و کارە.

پرسیار: كۆمەڵێك كەس هەن بەدەوری گۆڕەكاندا دەسوڕێنەوەو لەگەڵ هاوبەش دانەرانداو دەڵێن: لە ڕووی خۆشەویستی ئەو هاوبەش دانەرانەوە بۆمان ئێمەش ئەو كارە دەكەین، پاشان بانگیان دەكەین بۆ واز هێنان لەو سوڕانەوەیە جا ئایە حوكمی ئەو كارە چییە؟

وەڵام: هەركەسێك لەگەڵیاندا بسوڕێتەوە ئەوا كرداری ئەوانی كردووە ڕازی بووە بە كارەكانیان یەك دەنگە لەگەڵیاندا، إن شاألله لە هەڵوەشێنەری سێیەمدا باسەكەی دێت، هەركەسێك هاوبەش دانەران بە بێ باوەڕ نەزانێت، یان گومانی لە بێباوڕ بوونیانیاندا هەبێت...تا كۆتاییەكەی، دروست نییە بۆ موسڵمان كە بەشداری هاوبەش دانەران بكات لە كردارەكانیانداو بسوڕێتەوە لەگەڵیان لەسەر گۆڕەكان لە پێناو خۆگونجاندنو ڕازیكردنیان بە هەڵە دانەنانیان، ئەوە دروست نییە، وە ئەوەش لە بەرنامەی بانگەواز نییە بۆلای خوا.

پرسیار: تا چەندە ئەم دەستەواژەیە دروستە(سۆنگەو ناوەندی من هەر خوایە، كاتێك مرۆڤ پرسیار دەكات لەوەی دەبێتە ناوەندی بۆی لە هەر شوێنێكدا بێت؟

وەڵام: ئەگەر مەبەستی پشت بەستن بێت ئەوا دەستەواژەكەی خراپ بەكار هێناوە، بەڵام واتاكەی ڕاستە، بەڵام پێویستە بەو شێوەیە دەری نەبڕێ لەبەر ئەوەی بۆنی ئەوەی لێدەكرێت كە خوای گەورە دەكرێتە ناوەند بۆ لای جگە لە خۆی.

پرسیار: حوكمی ئەم قسەیە چییە: فلأنەكەس بڕیاری پەیوەست بوونی خۆی داوە، بەڵام فلأنە كەس هەژارەو جگە لە خوا كەسی تری نیە؟

وەڵام: بەڵام هەژار جگە لە خوا هیچ كەسی دیكەی نییە، هیچ كەسێ لە خەڵكی نایەوێ نەیارمەتی بداتو سەیریشی بكات، بەڵام خوای بەرزو بەڕێز هەرخۆیەتی كە یارمەتی دەداو هاوكاری لاوازو هەژار دەدات، وتنی ئەو دەر بڕینە قەدەغە نییە.

پرسیار: ئایا دروستە بۆ کەسیٚ کە دەپاڕێتەو کە بلێیت: (أللهم إني أسالك بأسمائك الحسنى و صفاتك العلا) واتە ( خوایەگیان داوات لیٚ دەکەم بە ناوە جوانەکانتو سیفەتە بەرزەکانت ( ئایا ئەو پاڕانەویە بەو شێوەیە دەبێتە پاڕانەوە بۆ سیفەتەکە ؟

وەڵام: داوات لێدەکەم بە ناوە جوانەکانتو سیفەتە بەرزەرکانت، ئەوا داوا لێکردنە لە خوا، بە ناوەکانیو سیفەتەکانی پاڕانەوە نییە بۆ سیفەتەکە، بەڵکو پاڕانەویە لە خوا، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾[1]

واتە: (وە هەر بۆ خوای گەورەیە ناوەجوانەکانو پیرۆزەکان جا ئێوەش بەو ناوە جوانانە داواو نزا لە خوای گەورە بکەن لێی بپاڕێنەوە، واز بێنن لەوکەسانەی کە لادەدەن لە حەقو راستی لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەدا، بەڕاستی ئەوانە لە ئایندەیەکی نزیکدا پاداشتی کردەوەکانی خۆیان وەردەگرنەوە)، ئەو (با)ە بائی تەوەسولە، بۆ وێنە (برحمتك استغيث ومن عذابك استجير) ئەوە فەرمودەیە.

واتە: ((بە بەرزیت داوای فریاکەوتنت لێدەکەم لە سزاشت داوای پەنات لێدەکەم)).

پرسیار: نموونە چییە لەسەر پاڕانەوەی سیفەتی قەدەغەکراو؟

وەڵام: وەك ئەوەی بڵێی (ئەی ڕووی خوا ئەی بەزەیی خوا وە هاوشێوەی ئەو)

پرسیار: ئایا جیاوازی هەیە لە نێوان داوا لێکردن بە خودی کەسێك یان داواکردن بە گەورەییەکەی؟

وەڵام: جیاوازی نییە لەنێوانیاندا هەردووکیان قەدەغەکراو، داواناکرێت لە کەسێك بەخودی خۆی یان بە خانەدانیو گەورەیی خۆی.

---

[1] الأعراف: ١٨٠

پرسیار: حوکمی کەسێك چییە کە ناوەند دابنێ لە نێوان خۆیی و خودا؟ بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ شتێ لە پەرستنی بۆ ئەنجام بدات، ئایا ئەوە هاوبەشدانانی بچوکە؟

وەڵام: ئەوە داهێنراوە، ڕێگایەکیشە بۆ هاوبەش دانان.

پرسیار: فەرموودەی کوێرەکە بەڵگەی بەهێزو قسەی بیدعە چییەکانە وەگومانێکیشیانە تێگەیشتن لەو فەرموودەیە چۆن دەبێت و دروستییەتی فەرمودەکە چۆنە؟

وەڵام: فەرموودەی کوێرەکە ئەگەر راست بێت بە هیچ شێوەیەك داوا لێکردنی لە پێغەمبەر ﷺ تیادا نییە، بەڵکو داوای پاڕانەوەی لە پێغەمبەر ﷺ تیادایە، وە پێغەمبەریش ﷺ زیندو ئامادەبوو داوای پاڕانەوە لە زیندوو دروستە، ئەوەش بریتیە لەداوا لێکردن بە پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ، هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەوان تێدا نییە، هەر چەندە لە سەنەدەکەشدا قسە هەیە.

# وانەی چوارەم لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەری سێیەم

**كە بریتیە لەوەی (هەر كەسێك هاوبەش دانەران بە بێ باوەڕ نەزانێت و گومانی هەبێت لە بێباوەڕ بوونیان یان ڕێچكەو ڕێبازەكەیان بەڕاست بزانێت بێ باوەڕە).**

## ( ڕاڤە )

وتەی سێیەم واتە هەڵوەشێنەری سێیەم لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام، هەركەسێك هاوبەش دانەران بە بێ بڕوا نەزانێت، لەبەر ئەوەی پێویستە موسوڵمان كە هەركەسێ خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ بە بێ باوەڕیان دابنێ ئەویش بە بێ باوەڕی دانابێ، خوای بەرزو بەڕێز هاوبەشدانەرانی بەبێباوەڕ داناوە ئەوانەی كە بتەكان دەپەرستن جگە لەوانەش كە جگە لە خوا لەگەڵ بتەكاندا دەپەرستن، وە هەروەها ئەوانەی كە باوەڕیان بە پێغەمبەران یان هەندێكیان نییە بە بێ باوەڕی داناون هەروەكو چۆن لە قورئان و سوننەتدا هەیە، هاوبەش دانەرانی لە جولەكەو گاورو بت پەرستان بە بێ باوەڕ داناوە، بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمانان كە بە دڵی باوەڕی وابێت كە ئەوانە بێ باوەڕن، كردار بە بێ باوەڕ دانانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾[1]

[1] المائدة: ١٧

واتە: (بێ گومان لەوانەی وتیان خوا خۆی عیسای کوڕی مەریەمەو لەودا جێی بۆتەوە بێ باوەڕو کافرن).

وە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ﴾[١]

واتە: (فەنحاسی یەهودی نەفامو نەزان گوتی: خودا دەستی زنجیر کراوەو بەستراوە، بۆیە وا رژدو چروکە، رزقو رۆزی بەندەکانی خۆی نادا! دەك دەستی ئەوان کەلەپچەو ئیفلیج بێت شەلەل لێی بداو هەر ئەوانیش رژدوو چروکن، وە لەبەر ئەوقسەشیان نەفرینی خوایان لێکرا بۆیە بەردەوام چروكو بەخیلن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ ﴾[٢]

واتە: (بێ گومان خوا وتەی ئەو کەسانەی بیست کە وتیان خوا هەژارە ئێمە داراو دەوڵەمەندین).

جگە لەم قسانەش خوای گەورە دەربارەیان دەگێڕێتەوە ئەوانە خاوەن پەرتوکی ئاسمانی بوون، بەسە بۆ باوەڕ پێکردنیان کە ئەوان بێ باوەڕ بوون، بەرامبەر ﷺ کە خوای گەورە ناردویەتی بۆ هەموو خەڵکی، ئەو پێغەمبەری ﷺ کە لای خۆشیان بە نوسراوی هەیە لە تەوراتو ئینجیلدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟

---

[١] المائدة: ٦٤

[٢] آل عمران: ١٨١

ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[١].

واتە: (ئەو پێغەمبەرو هەواڵدەرەی ﷺ كە نە خوێندەوارە كە ناوو سیفەتەكانی لە ئینجیلو تەوارتدا نوسراوە لای خۆیان دەستیان دەكەوێ واتە زۆر بە چاكی دەیناسن، فەرمانیان بە چاكە پێ دەكات لە شتی خراپو نا پەسەندی ڕێیان پی دەگرێت وە هەموو شتێكی پاكو خاوێنیان بۆ حەڵاڵ دەكاو هەموو شتێكی پیسو زیان بەخشیان لێ یاساغ ئەكات، وەكو عارەقو گۆشتی بەرازو سود... هتد، وە بارو تەكلیفی قورسو كۆتو زنجیرێ لەسەریان شەتەك درابوولای دەبا، مەبەست لابردنی ئەو شتانە كە لە سەر شانیان قورسو گرانبوو وەك خۆ كوشتن بۆ پەشیمان بوونەوە، لە پەرستنی كۆیلەو، حەرامیەتی دەسكەوتی جەنگی، ...هتد، واتە بە هاتنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ ئەو شتە قورسانە گشت هەڵگیران ئینجا ئەوانەی بڕوا ڕایان بەو پەیامبەرە هێنا بە ڕێزو حورمەتەوە ڕایان گرتوو هاوكاریو پشتگیری لێكرد ئەو خەڵكانەی ئەمانە سیفەتیان بن بەختیارو سەرفرازن، ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: ئەی خەڵكینە چاك بزانن كە من پەیامبەرو نێراوی خوام بۆلای سەرجەم ئێوە، نەك تەنها بۆلای هەندێكتان، من ئەو خوایە ناردوومی كە دەسەڵاتدارێتی ئاسمانەكانو زەوی تەنها هی ئەوە).

فەرموودەی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ گشتییە كە لە هەموو خەڵكی خاوەن پەرتوكو جگە ئەوانیش، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾﴾[٢]

---

[١] الأعراف: ١٥٧ – ١٥٨

[٢] الأعراف: ١٥٨

واتـە: (مـن نێـراوی خـوام بـۆلای سـەرجەمتان، ئـەو خوایـەی كـە دەسـەڵاتدارێتی ئاسمانەكانو زەوی تەنها هی ئەوە، هیچ پەرستراوێك نییە شایەنی پەرستن بێت تـەنها خۆی نەبێت، ژییەنەرو مرێنەرە، جا بـاوەڕ بـەخواو پێغەمبەرەكـەی ﷺ بهێـنن، ئـەو پێغەمبەرە ﷺ كە باوەڕی هێناوە بە خواو ووشـەكانی، شـوێنی بكـەون بـەو هیوایـەی ڕێنموویی بكرێن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾[١]

واتە: (ئێمە هەربۆیە تۆمان نارد ئـەی محمد ﷺ كـە بـۆ تـەواوی خـەڵكی جیهـان ببیتە موژدەدەرو ترسێنەر).

جا هەركەسێك بـاوەڕ بـە هـەموو پەیامەكـەی پێغەمبـەر ﷺ نـەهێنێت بـا دانـیش بـەوەدا بـینێ كـە ئـەو پێغەمبـەری خوایـە ﷺ بـەڵام بڵـێ پەیامەكـەت تایبەتـە بـە عەرەبـەوە بـۆ كەسـانی دی نییـە، ئـەوە بـێ بـاوەڕە، جـا چ جـای هـەر بێبـاوەڕ بێـت پەیامەكەی لە بنەڕەتەوە باوەڕی پێنـەبێت؟ ئـەوە بـێ باوەڕەیەكـەی قورسـترە. هـەر كەسێك گومانی لە بێ باوەڕی هاوبەش دانەراندا هەبێت بە گشتی ئیتر لە بت پەرسـتان بێت یان لـە گـاورو جولەكـە یـان لـەو كەسـانە بێـت كـە خۆیـان داوەتـە پـاڵ ئیـسلامو هاوبەشیش بۆ خوا دادەنێن، پێویـسنە بـیرو بـاوەڕت وابێـت كـە بـێ بـاوەڕن، هـەموو ئەوانەی كە لەگەڵ خودادا هاوبەشی بۆ دادەنێنو لەگەڵ ئەودا شتی دی دەپەرستن لـە دارەكانو بەردەكانو پەیكەرەكان وپەیكەرەكانو گۆڕەكانو جێنزرگەكان ئـەوە بـێ بـاوەڕو هاوبەش دانەرە پێویستە بە بێ باوەڕی بزانێت تەنانـەت ئەگـەر بانگەشـەی موسـوڵمان بوونیش بكات وە بڵێت (لاَ إِلَهَ إلاَّ االلهُ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله) لەبەرئـەوی هاوبـەش دانـان بـۆ خوا شایەتمان پوچ دەكات وە ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە یەكتاپەرستی خـراپ دەكـات.

---

[١] سبأ: ٢٨

پێویستە لەسەر موسوڵمان کە هاوبەش دانەران بە بێباوەڕ بزانێت ئەوانەی کە جگە لە خوا دەپەرستن ئیتر لە عەرەب بن یان جگە لەوانیش یان لە گاورو جولەکە بن یان لەوانەی خۆیان بە موسوڵمان دەزانن‌و خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام ئەمە بیرو باوەڕەو سازشی لەسەر ناکرێت، جا هەرکەسێك هاوبەش دانەران بە بێ باوەڕ نەزانێت ئەوە وەکو ئەوان بێ باوەڕو هەڵگەڕاوەیە، لەبەر ئەوە لای ئەو باوەڕو بێباوەڕ وەکو یەك وایە، جیاوازی نییە لە نێوان ئەوەو ئەمەدا، ئەوەش بێ باوەڕییە.

هەروەها هەرکەسێك گومانی هەبێت لە بێباوەڕ بوونی هاوبەش دانەران و بڵێ نازانم ئایا بێ باوەڕن یان بێ باوەڕ نین؟ ئەمیش دەبێتە بێ باوەڕ، لەبەر ئەوە دوو دڵە لە ئاینەکەی لە نێوان بێ باوەڕی‌و باوەڕداردا، جیاوازی ناکات لە نێوان ئەوەو ئەوەدا.

وە لەوەش توند تر ئەوەیە کە (کە ڕێچکەو ڕێبازەکەیان بە ڕاست بزانێ) واتە: هەر کەسێك ڕێبازی هاوبەش دانەران بە ڕاست دابنێ، ئای چەندە زۆرن ئەوانەی ڕێبازیان بە ڕاست دادەنێن‌و بەرگریان لێ دەکەن، بە تایبەتی گاورو جولەکە، ئێستا دەنگۆیەك هەیە کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەرسێ ئاینە ئاسمانیەکە بکرێتە یەك ئاین وەکو گومان دەبەن (ئیسلام‌و یەهودی و گاوریەتی)دەڵێن: هەموویان ئاینی ڕاست‌و دروستن، هەر هەموویان باوەڕیان بە خوا هەیە، بە بێ باوەڕیان نازانن، ئەوە زۆر خراپترە بێ باوەڕیەکەی لەوەی تەنها گومانی هەبووە لە بێ باوەڕ بوونیان، لەبەر ئەوەی ڕێبازەکەیانی بە ڕاست‌و دروست داناوەو وتی: ئەوانە باوەڕیان بە خوا هەیەو شوێن پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت دەکەون، جولەکەکان شوێن موسا ﷺ و گاورەکانیش شوێن عیسا ﷺ سەلامی خوای لێبێت دەکەون.

ئێمەش پێیان دەڵێین: ئەوان شوێن موساوعیسا نەکەوتوون ئەگەر شوێن ئەوان بکەوتنایە ئەوا باوەڕیان بە ﷺ دەبوو، چونکە هەریەك لە موساو عیسا سەلامی خوایان لێبێت موژدەیان داوە بە هاتنی ﷺ، وە ئەوەش هەیە لە تەورات‌و ئینجیلدا،،

تەورات کە دابەزییە سەر موسا ﷺ باسی ﷺ دەکات خوای گەورە دەفەرموێت: (ئیمانداری کامڵ ئەوانەن کە ئەو پەیامدارو هەواڵدەری خوایە کە نەخوێندەوارە، مەبەست لە ئومیی هیچ شتێکی نەخوێندبێ‌و نەنوسیبێ، ئەو پێغەمبەرەی کەناوو سیفەتەکانی لە تەوراتو ئینجیلدا نوسراوەو لای خۆیان دەستیان دەکەوێت واتە زۆر بە چاکی دەیناسن: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ ﴾ [1]

وە ئینجیلیش کە دابەزییە سەر عیسا ﷺ باسی ﷺ تیابوو بەڵکو عیسا ﷺ زۆربە راشکاوی باسی دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ﴾ [2]

واتە: (ئەی نەوەکانی یەعقوب ﷺ بێ گومان پێغەمبەرو نێراوی خودام بۆ لای ئێوە، ددانیش بە تەوراتدا دەنێم لەبەر دەستم دایە، مزگێنی بە هاتنی پێغەمبەرێك دەدەم کە پاش خۆم دێ ناوی (ﷺ)ە کێ بوو دی عیسا ﷺ هات، ئەوە پێغەمبەرمان ﷺ بوو وە ناویشی زۆرە).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ [3]

واتە: (ئەوانەی پەرتوكو نامەمان پێداون چاك ئەو پەیامبەرە دەناسنو هەرچیشی لەگەڵ خۆی هێناوە دەزانن ڕاستە، هەر چۆنێ منداڵو کوڕانی خۆیان دەناسن.

---

[1] الأعراف: ١٥٧

[2] الصف: ٦

[3] البقرة: ١٤٦

بەراستی دەستەیەكیشیان نكۆڵی ئەو حەقە دەكەن‌و راستی دەشارنەوە، وە چاكیش شارەزان‌و دەزانن كە حەق‌و راستی كامەیە).

جا لێرە چۆن هەوڵی بەیەكتركردن‌و نزیكردنەوەی جولەكایەتی‌و گاوریەتی‌و ئیسلامەتی دەدرێت؟ جا جولەكایەتی‌و گاوریەتی لە دوای نێردرانی ئیسلام هەڵوەشێندرایەوە، بە ئیسلام، وە ئیسلامیش ئاینێكی راستەو هیچ ئاینێك نەماوە جگە لە ئاینی ئیسلام كە پێغەمبەر ﷺ هێنای، جا هەركەسێك نەچێتە ناو ئیسلام باوەڕ بە ﷺ نەهێنێت ئیتر با جولەكە یان گاور یان بت پەرست یان بێ ئاین بێت، هەركەسێ باوەڕ بە ﷺ نەهێنێ بێ باوەڕە، ئەوانە ئێستا كۆڕو سیمینار دەبەستن بۆ نزیكبوونەوەی ئاینەكان لە یەكتر، بەڵام بەداخەوە كەسانێك پشتیوانیان لێ دەكەن، كە خۆی بە موسوڵمان دەزانێ‌و خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام‌و ئامادەی ئەم كۆنگرانە دەبن، ناوی دەنێ، گفتوگۆی نێوان ئاینەكان، یان گفتوگۆی نێوان شارستانییەتییەكان وە هاوشێوەی ئەوەش، ئەوانە ئامادەی ئەو كۆنگرانە نابن بۆ ئەوەی كە بۆچوونەكانی گاورو جولەكەكان بە تاڵ بكەنەوە، بەڵكو بۆ ئەوە ئامادە دەبن كە نێوانیان لەگەڵیاندا چاك بكەن، وە بەسیانە كە جولەكەو گاور دان دەنێن بەوەی كە ﷺ پێغەمبەرە بەڵام تەها ئەوەش لە روكەشدایە ئەوان هیچ كات دان بە هەموو پەیامەكەیدا نانێن، بێ باوەڕن بە گشتییەتی پەیامەكەی، وەك ئەوەی كە دەڵێن: (ڕازی بن لێمان ئێمەش ڕازی دەبین لێتان) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ﴾[1]

واتە: ( هەرگیز ئەم جولەكەو گاورانە لە تۆ خۆشییان نایە ئەی ﷺ هەتا پەیڕەوی لە ئاین‌و بەرنامەكەیان دەكەی، واتە هەتا دەچیتە سەر دینی ئەوان، هەرگیز بە تەمای ڕەزامەندی ئەوان مەبە).

[1] البقرة: ١٢٠

ئەوانە فێڵ دەكەن ئەوەی كە پێویستە ئەوەیە كەبە بێ باوەڕ بزانرێن‌و بڕیاری بێ باوەڕییان بدرێت‌و نابێت دوودڵی هەبێت لە بێ باوەڕ كردنیاندا هەتا باوەڕ بەهەمووپەیامەكەی ﷺ دەهێنن‌و شوێنی دەكەون، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ [١]

واتە: (ئینجا ئەوانەی بڕوایان بەو پەیامبەرە هێناو بە ڕێزو حورمەتەوە ڕایانگرت‌و هاوكاریی‌و پشتگیری لێكرد بە جیهادو تێكۆشان‌و وە دوای ئەو ڕووناكیەش كەوتن كە لەگەڵیا نێرراوە)

ئایا ئەوان شوێن ئەو ڕووناكییە كەوتن كە لەگەڵ پێغەمبەرمان ﷺ نێراوە، نە خێر، با بشڵێن كە ﷺ پێغەمبەرە، بەڵام ئەوان شوێنی ناكەوتن لەبەر ئەوە ئەوان بێباوەڕن بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لا یسمع بي یهودي ولا نصراني ثم لا یؤمن بالذي جئت به الا دخل النار))[٢]

واتە: (هیچ گاورو جولەكەیەك نییە كە گوێی لە من بێت (واتە ئاینەكەی منی پێ بگات) پاشان باوەڕ نەهێنێ بەوەی هێناومە بێ گومان دەچنە ئاگرەوە) بۆیە پێویستە بە تەواوی بڕیاری بێ باوەڕیان بدرێت ئەوانەی كە بێ باوەڕن لە پێش هەموو شیانەوە جولەكەو گاور زۆر بە توندی ئەوانە بێ باوەڕن لەبەر ئەوەی سەر پێچی خوایان كرد لەسەر زانین‌و چاوپۆشنی، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەوانەی پەرتوك‌و نامەمان پێ داون چاك ئەو پەیامبەرە دەناسن هەرچیشی لەگەڵ خۆی هێناوە دەزانن ڕاستە، هەرچۆنێ منداڵ‌و كوڕانی خۆیان دەناسن، بەڕاستی دەستەیەكیشیان نكۆڵی ئەو حەقە دەكەن‌و ڕاستی دەشارنەوە، وە چاكیش دەزانن حەق‌و ڕاستی كامەیە).

---

١ الأعراف: ١٥٧

٢ اخرجه مسلم (١٥٣)من حدیث ابي هریرة رضي الله عنه

جا پێویستە لەسەر موسوڵمانان كە باوەڕی وابێت هەرچی بێ باوەڕە بە بێ باوەڕی دابنێت هەركەسێ بن، هەموو كەسێ كە هاوبەش بۆ خوا دەدادەنێ وجگە لە خوا دەپاڕێتەوە بە هەر جۆرێك لە جۆرەكانی هاوبەش دانانی گەورە پێویستە بە بێباوەڕ دابنرێن، بە حوكم دانان لەسەری بە بێ باوەڕیو دروستیش نییە گومان هەبێت لە بێ باوەڕ كردنیدا، وە هەروەها دروستیش نییە ئەوەی لە سەریەتی لە بێ باوەڕی بەڕاست دانرێنو بوترێ ئەوە خاوەن ئاینە، ئەوە باشترە لە بت پەرستی، بێ باوەڕی یەك گەلە.

دەڵێین: هەركەسێ باوەڕی بە ﷺ نەبێتو شوێنی كەوێت ئەوا ئەوكەسە بێ باوەڕە هەرچیە بێت، ئەم بیرو باوەڕە پێویستە لەسەر موسوڵمان كە بیرو باوەڕی وابێت كە لە ئیسلام دەرنەچێت نەیشیزانێت، لە ئیسلام دەردەچێت بە بێ باوەڕ نەكردنی بێ باوەڕان بە ڕاست زانینی ڕێچكەو ڕێبازیان، بەوەی بە ڕاستی دابنێ ئەوەی جولەكەی لەسەرە بە ڕاستی بزانێ ئەوەی گاوری لەسەرە دەڵێن ئەوانە لە خاوەن ئاینە ڕاستەكانن، بەڵكو هەیشە لەوانەی كە دەدرێنە پاڵ بانگەوازی ئیسلامو دەڵێن: (براكانمان – برا گاورەكانمان)

پێیان دەڵێین: ئەوانە باوەڕیان نەهێناوە ئەگەر باوەڕیش بێنن شوێن ﷺ ناكەون، لەبەر ئەوەعیسا عليه السلام فەرمویەتی: ئەی نەوەكانی یەعقوب عليه السلام بێگومان من پێغەمبەرو نێراوی خوام بۆلای ئێوە دانیش بە تەورتدا دەنێم لەبەر دەستمدایە، مزگێنیش بە هاتنی پێغەمبەرێك دەدەم كە پاش خۆم دێ ناوی (احمد)ە ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾[1]

---

[1] الصف: ٦

باوەڕیشیان بەوە نەهێنا بەڵام عیسا ﷺ لە کۆتایی زەماندا دادەبەزێت شوێن محمد ﷺ دەکەوێتو حوکمیش بە ئیسلام دەکاتو دەبێتە نوێکەرەوەیەك لە نوێکەرەوەکان، هەرکەسێك بێ باوەڕ بێت بە هەواڵ دەرێك (نبی) ئەوا بێباوەڕ بووە بە هەموو هەواڵدەران، (**الانبیاء**) پێویستە شارەزابوون لەم شتە وەگەرنا گومانە پوچەکان کە گاورو جولەکەکانن ڕەواجیێ پێدەدەن برەوی پێبدرێت بڵاوە بکات، ئەوانە نایانەوێت موسڵمانان لەسەر ئاینەکەیان بمێننەوە، بەڵام ئەوان دەیانەوێ کە موسوڵمانان ڕابکێشن بۆ لای ئاینەکەی خۆیان خوای گەورە دەفەرموێت﴿وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ ﴾[1]

واتە: (هەرگیز ئەم جولەکەو گاورانە لە تۆ خۆشییان نایە ئەی محمد ﷺ هەتا نەچیتە سەر ئاینی ئەوان بە تەمای ڕەزامەندی ئەوان مەبە( ئەوە کەلامی خوایە).

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ تَهۡتَدُواْۗ ﴾[2]

واتە: (خاوەن پەرتوکە ئاسمانییەکان لە جولەکەو گاور بە موسوڵمانەکانیان دەوت وەرن بین بە گاورو جولەکە دەکەونە سەر ڕێی ڕاست( واتە بۆ لایان کە هەرکەسێك ببێت بە جولەکە یان گاور ئەوە لەسەر ڕێی ڕاست نییە، ئەوە قسەی خوایە کە ڕاسترین گوتەو قسەیە، جا چۆن ئێمە بە بێ باوەڕیان نەزانین؟ چۆن گومانمان هەبێت لە بێ باوەڕ بوونیان؟ داوای سەلامەتی بیروباوەڕ لە خوا دەکەن).

بە دڵنیاییەوە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ هەرکەسێکیان بە بێ باوەڕ داناوە کە هاوبەشی بۆ خوا دانابێت جگە لە خوای پەرستبێت، هەرکەسێك بێت، یان بێباوەڕ بوبێت بە یەکێك لە هەواڵدەران سەلامی خوایان لێبێت، یان باوەڕی بە یەکێك لە

[1] البقرة: ١٢٠
[2] البقرة: ١٣٥

پەیامەكانی ئیسلام نەبێت كە شەشن ئەوە حوكمی بێباوەڕی بەسەردا دەدرێت، دوودڵی تیا ناكرێ‌و گومانی تێدا نییە، پێویستە بە ڕاشكاوی بوترێت‌و دوژمنایەتی دەربڕێت دژی.

پاشان دوای كە زانیمان پیویستە بێ باوەڕ كردنی هاوبش دانەران‌و بێ باوەڕان هەركەسێك بن، وە ئەمەش بیرو باوەڕێكە كە ئیسلامەكەی ڕاست نابێت‌و ئاینەكەی دانامەزرێت مەگەر بەوە نەبێت، خەڵكی لای موسوڵمانان هەموویان وەك یەك نین بەڵكو جیاوازی دەكات لە نێوان هەق‌و بەتاڵ‌وباوەڕ دارو بێ باوەڕو یەكتاپەرست‌و هاوبەش دانەر هەروەك‌و چۆن خوای گەورە جیاوازی كرووە لە نێوانیاندا لە حوكم دان لە سەریان.

**ئەوەی لەسەر بێ باوەڕكردنی بێ باوەڕان بنیات دەنرێت كۆمەڵێك یاسای زۆرە بەشێكی لێ باس دەكەین لەوەی كە دەكرێت**

**یەكەم:** كەپێویستە ڕقەبەرایەتی بێ باوەڕان‌و دوژمنایەتی كردنیان‌و دۆستایەتەی نەكردنیان ئەگەر نزیكترین كەسیش بن لە موسوڵمانەوە، خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَـٰدًا فِى سَبِيلِى وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا۟ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ ۚ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ﴾[1]

**واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنی منو دوژمنی خۆتان مەگرنە دۆست‌و خۆشەویست، چونكە نیشانەی ئیمان‌و باوەڕی ڕاستەقینە ئەوەیە كە ناحەزو دوژمنانی دینی خواتان خۆش نەوێت‌و كە خۆشەویستیان بدەنێ بە ئاگاداركردنیان لە نهێنی خۆتان، كە بێ گومان ئەوان بێباوڕ بوون بەوەی هات بۆتان لە حەق واتە كافر بوون بە قورئان‌و ئیسلام، جگە لەوەش لە مەكەدا ئێوەو پێغەمبەریان ﷺ دەركرد لەبەر باوەڕتان بە خوای پەروەردگارتان ئەگەر ئێوە لە مەككە دەرچوون بۆجیهاد لە ڕێگەی**

---

[1] الممتحنة: ١ – ٤

منـدا بـەنیازی بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی مـن، دۆسـتایەتی دوژمنـی مـن و خۆتـان مەكـەن، كـە نهێنیـەكانتانیان بـە دزی بـدەنێ لەبـەر خۆشەویـستی وەكـو نامەكـەی (حاتەب) لە كاتێكدا من زانـاترم بـەوەی شـاردوتانەتەوە بـەوەش ئاشـكراتان كـردووە، هەركەسێكتان ئـەوكارە بكـات ئـەوە بـە دڵنیاییـەوە ڕێـی ڕاسـتی ون كـردووەو سـەری لێشێواوە تا دەفەرموێت: (بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە ئەی ئیمانداران لە ئیبراهیمو لەوانەی بڕوایـان هێنـابوو لەگـەڵیان، سەرمەشـقییەكی چـاكو جـوان جـا دەبێـت ئێـوەش ئـەی بڕواداران لەوان چاو بكـەنو خۆتـان لـە بتـەكان و لـەو خزمـە دارو بتپەرسـتانە بـەدوور بگرن، تەنها خواتان خۆش بوێ، كاتێ بە قەومە بـێ باوەڕەكانیـان وت بەڕاسـتی ئێمـە بێزارو بەرین لە خۆتانو لەوبتانەی لە جیاتی خوا ئەیپەرستن، وە بێ باوەڕین پێتان وە هەمیشە دوژمنایەتیو ركەبەرایەتی لە نێوانمانـدا پەیدابووە تـا بـاوەڕ بـە خـوای تـاكو تەنیا دێننو هاوبەشی بۆ دانانێن).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾[1]

واتە: (هیچ كۆمەڵێك نابینین كە باوەڕی بە خواو بەڕۆژەكـەی تـر ببێـت دۆسـتایەتی ئەوانە بكەن دوژمنایەتی خواو پەیامبەرەكەی دەكەن، هەرچەندە ئەوانـە باوكیـان یـان كوڕو نەوەیان براو عەشیرەتیان بن، ئەوانەی كە لـە دۆسـتایەتی دوژمـانی خـوا خۆیـان دەپارێزن كە سانێكن خوا باوەڕی لـە نێـو دڵیانـدا چەسـپاندووەو بـە هـیچ شـتێك لـەق نابێـت بۆیـە (ئـەبو عوبەیـدە رضي الله عنه لـە ڕۆژی بـەدردا بـاوكی خـۆی كوشـت، ئەبوبـەكری سـدیق رضي الله عنه بڕیـاری كوشـتنی عەبـدولڕەحمانی رضي الله عنه كوڕیخۆیـدا، موسـعەبی كـوڕی

[1] المجادلة: ٢٢

عومەرﷺ عوبەیدەی برای خۆی کوشت چونکە ناحەزو دژ بەئیسلام بوون، وە پشتگیری کردوون بەسەرخستن لە لایەن خۆیەوە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا﴾[1]

واتە: (ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە تاغوت نەبێت(تاغوت: هەرکەسێکە جگە لە خوا رازییە بەو پەرستنەی بۆی دەکرێت وەکو ئەو کەسەی دانیشتووە لەبەردەم خەڵکانێکی گێلدا یەك یەك دەستو قاچی ماچ دەکەنو ئەویش رازییە پێیو بانگەشەشی بۆ دەکاتی.. وەرگێڕ). واتە بێباوەڕ بێت بە تاغوت باوەڕی بە خوا هێنا ئەوە بێگومان دەستی بە هەنگڵو دەسکێکی پتەوە قایمەوە گرتووە، کە هەرگیز هەڵناوەشێت پسانو پچڕانیشی بۆ نییە).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرگیز باوەڕ بە خواو باوەڕ بە تاغوت کۆنابێتەوە. بەڵکو پێویستە یەکەم جاربێ باوەڕ بێت پاشان باوەڕ بە خوا بهێنێت، پێویستە بێباوەڕ بوون بە تاغووتو دوژمنایەتی کردنی بێ باوەڕانو رقە بەرایەتییان با نزیك ترین کەسیش بن، لە مرۆڤی موسوڵمانەوە جا ئەگەر بێ باوەڕەکە دایكو باوکی یان برایان کەسانی لە هۆزو تیرەو عەشیرەتەکەی بێت، ئەوا ئەو موسوڵمانە رقەبەرایەتی دەکاتو خۆی دوورە پەرێز دەگرێت لێی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن

---

[1] البقرة: ٢٥٦

مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾
وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ۚ ﴾[1]

واتە: ( نە بە پێغەمبەر ﷺ ڕێدراوە نە باوەڕ دارانیش کە داوای لێبوردن بۆ هاوبەش دانەران بکەن ئەگەر چی خزمی نزیکیشیان بن بە تایبەتی پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوتووە کە دۆزەخیو بۆ کوفر کاردەکەن، (ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوە).

خۆ داواکردنەکەی ئیبراهیمیش بۆ لێخوش بوون لە باوکی تەنها لەبەر ئەوەبوو لە کاتی خۆی پێش ئەوەی بێ باوەڕی باوکی بۆ دەرکەوێت بەڵێنی دابوو داوای لێبوردنی بۆ بکات، جا کەزانی سور دوژمنی خوایە یەخەی لێ هەڵتەکاندوویەرائەتی لێکرد، چونکە ئیبراهیم پیاوێکی زۆر ملکەچ‌ودەست بە دوعاو هێمنو لەسەر خۆبوو، بەرامبەر بە خەڵکانی نەزان، خۆ پاش ئەوەی خوا خەڵکێکی خستبێتە سەر ڕاستەڕێ، ئیتر نەبووە جارێکی تر گومڕایان بکات، (ئەم ئایەتە سەبارەت بەو موسولمانانە هاتە خوارێ کە داوی لێبوردنیان کردبوو بۆ هاوبەش دانەرەکان، لەپاشا ترسان کە خوا قاریان لێبگرێ، ئینجا هات بۆ دڵدانەوەیان تا ئەو شتانەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە دەبێ خۆیانی لێ بپارێزن).

لە کاتێکدا کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند هەندێ لە موسوڵمانان بەداخەوە بوون لەوەی کەداوای لێبوردنیان بۆ باوکیان کردبوو، لە هاوبەش دانەران کە مردبوون، لەم ئایەتە ترسان، خوای گەورەش ئایەتی (١١٥)ی سورەتی تەوبەی دابەزاند بۆ دڵدانەوەیانو فێرکردنیان، جا لە کاتێکدا کە ئەم ئایەتە دابەزیبوو، وە پێش ئەوەی

---
[1] التوبة: ١١٣ – ١١٥

موسوڵمانان بزانن كە داوی لێخۆش بوون بۆ هاوبەش دانەران قەدەغەیە لێی ناگیریێ‌و گوناهبار نابێت.

**دووەم:** لەوەی لەسەر بێ باوەڕ كردنی هاوباش دانەر دروستو دادەمەزرێ ئەوەیە كە ئەو هاوبەش دانەرو بێباوەڕە مرد سەرپەرشتی تەرمەكەی ناكات مەگەر هەر نەبێت سەرپەرشتی بكات ئەوا لەو كاتەدا ناچار دەبێت چونكە شاردنەوەی لاشەكەی پێویستە لەو كاتەدا بە خۆڵ داپۆشیێ‌و دەبێت بنێژرێت لە گۆڕستانی موسوڵماناندا نانێژرێت بەڵكو لە گۆڕستانی بێ باوەڕاندا دەبێت بنێژرێت، بەڵام ئەگەر بێباوەڕی وەك خۆی هەبوو ئەوا موسوڵمانان نە دەبێت سەرپەرشتی تەرمی بێ باوەڕان بكەن وە نایشی شۆن‌و كفنی ناكەن‌و هەڵی ناگرن بۆ گۆڕستان ڕێ‌و رەسمی بۆ ساز ناكەن و وەكو بۆ موسوڵمانانی ساز دەكەن‌و ئامادەی لە گۆڕ نانەكەشی نابن‌و لە گۆڕستانی موسوڵماناندا نایبنێژن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾[1]

واتە: (هەرگیز نوێژ لەسەر كەسێ لەو دووڕووانە مەكەن بمرێ، چونكە نزاو نوێژی تۆ دەبێتە میهرەبانی، بارانی بەزەیی خوا، دیارە ئەوانیش شیاوی ئەوە نین، وە لەسەر گۆڕەكەشی بە پێوە مەوەستە بۆ داوای گوناه پۆشین‌و لێخۆش بوون، لێبوردن، چونكە بەراستی ئەوانە بەر لەوەی بمرن حاشایان لە خواو پێغەمبەرەكەی ئەو كرد ﷺ، هەر بە فاسقی‌و یاخیانەش مردن).

واتە: ئەو خوانەناسانە لەناو كۆمەڵگەدا نابێ پلەو ڕێزیان بۆ دابنرێ) ئەم ئایەتە سەبارەت بە عبدالله ی كوڕی دایك سەلول هاتە خوارەوە كە دوو ڕوو بوو، جا موسوڵمان ئامادەی تەرمی لە گۆڕنانی بێ باوەڕ نابێت‌و ئامادەی ناكات‌و كفنی ناكات‌و

---

[1] التوبة: ٨٤

لە گۆڕستانی موسوڵمانانیشدا نانێژرێ، بەڵام سەردانی نەخۆش لە بێ باوەڕان ئەگەر لەبەر بانگکردنی بێت بۆ لای خوا ئەوا موسوڵمان سەردانی نەخۆشی بێ باوەڕ دەکاتو بانگی دەکات بۆ لای خوا، پێغەمبەر ﷺ سەردانی جولەکەیەکی کرد کە نەخۆش بوو بۆ ئەوەی موسوڵمان بێت ئەویش موسوڵمان بوو لەسەر ئیسلامەتی مرد شایەتی دا بەوەی هیچ خوایەك نییە شایەنی پەرستن بیت جگە لە الله محمدیش ﷺ نێردراوی ئەو خوایە[١] وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ سەردانی مامی کرد لەکاتی ئەو نەخۆشییەیدا کە مردو پێی فەرموو (یا عم قل لا اله الا الله)[٢] واتە ئەی مامە بڵێ لا اله الا الله) واتەجا ئەگەر سەردانی نەخۆشی بێ باوەڕان مەبەست لێی بانگ کردن بێت بۆ ئیسلام قەیدی ناکات، بەڵام ئەگەر مرد لەسەر بێ باوەڕیەکەی ئەوا موسوڵمان سەرپەرشتی ناکات، نزیکترین کەسی بێت باوکی بێت لە کاتێکدا کە ئەبوو تالیب مرد لەسەر کوفرەکەی( بێ باوەڕیەکەی) پێغەمبەر ﷺ سەپەرشتی لە گۆڕنانی نەکرد ئامادەی نەکرد بۆ ئەوەی لە گۆڕ بنرێ بەڵکو فەرمانی بە کوڕەکەی عەلی کرد کە دایپۆشێ لە زەویاو لە سەرزەوی بە مردوویی جێی نەهێڵێ تا بۆگەنی لاشەکەی خەڵکی ئازار نەدات[٣].

**سێیەم:** موسوڵمان میرات لە بێ باوەڕ ناگرێو بێ باوەڕیش میرات لە موسوڵمان ناگرێ لەبەر ئەوەی خوای گەورە پەیوەندی نێوانیانی پچڕاندووە، هیچ کام لە موسوڵمانانو بێ باوەڕان میرات لە یەکتری ناگرن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ( لا یرث المسلم الکافر، ولا الکافر المسلم)[٤] و هذا في صحیح عن اسلمة بن زید ﷺ، واتە: (نەموسوڵمان میرات لە کافر دەگرێت، نە کافر لە موسوڵمانی دەگرێت) بەڵکو دەبێت

---

[١] اخرجه البخاري (١٣٥٦)، و ابو داود (٣٠٥٩)، والنسائي في الکبری (٧٢٥٨)و احمد (١٣٩٧٧)، عن انس بن مالك رضي الله عنه

[٢] اخرجه البخاري (١٣٦٠) و مسلم (٣٩)من حديث المسيب بن حزن ﷺ.

[٣] اخرجه ابو داود (٣٢١٤) و النسائي، (٢٠٠٦) و صحيح الالباني.

[٤] اخرجه البخاري (٦٧٦٤)، و مسلم ١٦١٤من حديث اسامة بن زيد رضي الله عنه.

میراتی بێ باوەڕان بۆ نزیکەکانیان بێت لە بێ باوەڕانو نزیکەکانیان لە موسوڵمانان هیچ لەو میراتە ناگرن، جا بۆیە بێ باوەڕی لە ڕێگرەیەکانی میرات گرتنە لای زانایان، (واتە لە کاتی دابەشکردنی میراتدا یەکێ لە هۆکارەکانی میرات نەبردن بێباوەڕییە ..... وەرگێڕ) .

**چوارەم**: دروست نییە کە بێ باوەڕ ئافرەتی موسوڵمان بخوازێ ببێ بە هاوسەری لە ترسی ئاینەکەی تا ئەو ئافرەتە موسوڵمانە نەکەوێتە ژێر دەستەلاتی ئەو بێ باوەڕە، خوای پاکو بێگەرد دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ﴾[1]

واتە: (ژنانو کچانی باوەڕدار لە خوا نەناسو هاوبەش دانەران مارە مەکەن تا نەبنە خاوەن باوەڕی دامەزراو، چونکە بێگومان کە بەندەیەکی باوەڕدار لە پیاوێکی ئازادی هاوبەش دانەرە بە ڕێز ترەو چاکترە هەر چەندە ئەو هاوبەش دانەرە قەدو قیافەو پلەو پایەی سەراسیمەتان بکات).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ ﴾[2]

واتە: (جا ئەگەر زانیتان باوەڕ دارنو تەنها لەبەر ئیسلام هاتوون مەیانگێڕنەوە بۆلای مێردە کافرو بێ باوەڕەکانیان چونکە ئەو ژنانە حەلاڵ نین بۆ ئەو پیاوە بێ باوەڕانە، وە ئەو پیاوە بێ باوەڕانەش حەلاڵ نین بۆ ئەو ژنە بڕوادارنە واتە ژنی موسوڵمان دەبێت تەنها بۆ پیاوی موسوڵمان بێت).

---

١ البقرة: ٢٢١
٢ الممتحنة: ١٠

جا دروست نییە بەهیچ شێوەیەك ئافرەتی موسوڵمان شوبکات بە پیاوی بێ باوەڕ نە جولەکە نە گاور نە بت پەرست، بەڵام هەرچی سەبارەت بە هێنانی ژنی بێ باوەڕە لەلایەن پیاوی باوەڕ دارەوە ئەوە ئەگەر ئافرەتەکە بت پەرست بوو ئەوا بە هیچ شێوەیەك دروست نییە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ﴾[١]

واتە: (ژنانی خوا نەناس و هاوبەش دانەر مارە مەکەن تا باوەڕی دامەزراو راستەقینە دێنن، وە بەڕاستی کە نیزەکێکی باوەڕدار بۆ هاوسەرگرتن لە ژنێکی هاوبەش دانەر بەڕێز ترو باشترە، ئەگەر چی ئەم ژنە خوانەناسە جوانیو ماڵو داراییەکەی سەرسامی کردبن و زۆریش حەزیان لێبکەن، ژنان و کچانی باوەڕدار لە خوانەناس و هاوبەش دانەران مارە مەکەن، تا نەبنەخاوەن باوەڕی دامەزراو چونکە بێگومان کە بەندەیەکی باوەڕدار لە پیاوێکی ئازادی هاوبەش دانەرو خوانەناس بەڕێزترو چاکترە، هەرچەندە ئەو هاوبەش دانەرە قەدو قیافەو پلەو پایەی سەرسورهێنتان بکات).

بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە جولەکە بوو یان گاور بێت ئەوا دروستە بۆموسوڵمانان کە بیانکاتە هاوسەری ژیانی بە مەرجێ کە ئەو ئافرەتە داوێن پاك بێت و ناموسی پاراستبێ، ئەوەش لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَـٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَٱلْمُحْصَنَـٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾[٢]

واتە: (سەربڕاوی دەستی ئەوانەی نامەیان پێ دراوە رەوایە بۆتان و دەتوان بیخۆن، وە خواردن و سەربڕاوی دەستی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵەو رێی پێ دراوە، وە

---

١ البقرة: ٢٢١

٢ المائدة: ٥

ژنانی باوەڕدارو داوێن پاکو ئازادیشتان بۆ حەڵاڵە، هەروەها ئەو ژنە داوێن پاکانەش کە لە پێش ئێوە نامەیان پێدراوە (لەو جولەکەو گاورانە) بڕوایان بە تەوراتو ئینجیل هەیە)، (خۆ پارێزی ژنانیان ئەوانەی کە داوێن پاکنو زیناناکەن بەڵام ئەگەر داوێن پیس بوو هەرکاتێ لای پیاوێك بوو ئەوە دروست نییە بۆ موسوڵمان کە مارەیان بکات. بەڵکو دروستە ئافرەتی جولەکەو گاور مارە بکات کە داوێن پاکنو ناموس پارێزن. لەبەر ئەوەی ژن لە ژێر دەسەڵاتی پیاو دایەو لەوەش دەچێت ئەو ئافرەتە موسوڵمان ببێت کە لە ژێر دەسەڵاتیدایە، دەسەڵات دەبێت موسوڵمان هەیبێت بەسەر ئافرەتی بێ باوەڕدا بە پێچەوانەی ئەوەوە کە نابێت بێ باوەڕ دەسەڵاتی هەبێت بەسەر ئافرەتی موسوڵمانەوە لەبەر فەرموودەی خوا کە دەفەرموێت: ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾﴾[1]

واتە: (دیارە هەرگیز خوا ڕێنادات بێ باوەڕان دژی موسوڵمانان بنو زاڵ بن بەسەریاندا).

ئەوە درێژەی بابەتی ژنو ژن خوازی نێوان موسوڵمانو بێ باوەڕانە، جا ئەگەر ئافرەتێك بتپەرست یان بێ دین یان هەڵگەڕاوە بوو ئەوا بە هیچ شێوەیەك دروست نییە موسوڵمان بیانکاتە هاوسەری خۆی، بەڵام ئەگەر لە خاوەن نامەکان بن دروستە بە مەرجێك پارێزراو بێت واتە داوێن پاك بێت زینا نەکات، لەبەر ئەوەی دەچێتە ژێر دەسەڵاتی پیاوی موسوڵمانەوە بواری ئەوەی بۆ دەڕەخسێ کە موسوڵمان بێت.

**پێنجەم:** لەو شتانەش کە لەسەر بێ باوەڕ دانانی بێ باوەڕانو دوورە پەرێزی لێیان دادەمەزرێت ئەوەیە کە پێویستە لەسەر موسوڵمانان کە لە وڵاتەکەیان کۆچ بکات، جا پێویستە لەسەر ئەو موسوڵمانانەی کەناتوانێ ئاینەکەی خۆی ئاشکرا بکات کە کۆچ بکات بۆ وڵاتی موسوڵمانان هەروەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەبەڕێزەکانی

---

[1] النساء: ١٤١

ڕەزای خوایان لێبێت بە خۆیانو ئاینەکەیان هەڵهاتن موسوڵمانان نامێنێتەوە لە وڵاتی بێ باوەڕاندا لە کاتێکدا ناتوانێ ئاینەکەی ئاشکرا بکاتو لە هەمان کاتیشدا توانای کۆچکردنی هەیە، خوای پاکو بێگەرد دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ﴾[1]

واتە: (بێگومان ئەوانەی کە فریشتە گیانی کێشان لە کاتێکدا نا حەقیان لە خۆیان کرد چونکە (دار الشرك) یان بە جێ نەهیشتوو کۆچیان نەکرد بۆ نیشتیمانی ئیمان (شاری مەدینە)، بەر لەوە ئەڵێن باشە ئێوە لە کوێبوون بۆچی لێرە کۆچتان نەکردو لەگەڵ هاوبەش دانەراندا مانەوە؟! ئەڵێن ئێمە لە وڵاتی مەککەدا بێ دەسەڵاتو لاواز کرابوین نەماندەتوانی بۆ هیچ لایە کۆچ بکەینو بە ناچاری هەر لەو شوێنە ماینەوە، فریشتەکان دەڵێن: ئایا زەوی خوا فراوانو ئاوەلا نەبوو تا لەوێ کۆچ بکەنو بڕۆنە جێگایەکی ترو بە ئازادانە خوا پەرستی خۆتان کردایە، جا لە ڕۆژی دوایدا شوێنو جێگەیان دۆزەخەو ئەویش چارەنوسێکی نالەبارو خراپە ئەو پیاو ژنو منالانە نەبێ کە توانای هیچ خۆدەرباز کردنێکیان نییەو شارەزای ڕێگەش نینو ڕێ دەرناکەن، جا بێ گومان خوا لەوانە دەبورێت، وە خوا هەمیشە گوناە پۆشی لێ بوردەیە لە خاوەن بیانو بیانو وەردەگرێت).

١ النساء: ٩٧ - ٩٩

جا ئەگەر كەسێ ناتوانێ كۆچ بكات ئەوا بیانوی هەیە بەڵام كەسێك دەتوانێ پێویستە كۆچ بكات، دروست نییە بۆی كە دانیشێ لە نێوان هاوبەش دانەراند پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (انا بريء ممن يقيم بين اظهر المشركين).[1]

واتە: ( من دوورە پەریزێزم لە كەسێ نیشتەجێی نێوان هاوبەش دانەران بێت

( بۆیە پێویستە لسەر كەسێك كە ناتوانێت ئاینەكەی كە لەسەر یەتی ئاشكرای بكات كۆچ بكات، وە كۆچكردنیش نزیكراوەی جیهاد كردنە لە پێناو خوای گەورەدا. باسی كۆچكردن بە نزیكراوەیی لەگەڵ جیهادا هاتووە لە قورئانداو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾[2].

واتە: (بێگومان ئەو كەسانەی كە بڕوایان هێناوە كۆچیان كردوو دەربەدەر بوونو لە ڕێی خودا جیهادیان كرد).

جا كۆچكردن زۆر گەورەیە لە ئیسلامدا كە بریتییە لە ڕاگوێزان لە وڵاتی بێ باوەڕییەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانان هەڵهاتن بە ئاینەكەیەوە.

**شەشەم**: لەو شتانەی كە لە بێ باوەڕ كردنی بێ باوەڕانەوە دروست دەبێت ئەوەیە كە دەست پێشخەری نەكرێت لە سەلام كردن لە بێ باوەڕەكانو هاوبەش دانەرەكان، پێغەمبەر ﷺ دەنفەرموێت: ((لا تبدأوا اليهود و النصارى بالسلام وان سلمو فقولو: و عليكم))

واتە: دەست پێشخەری جولەكەو گاور مەكەن بە سەلام كردن ئەگەر سەلامیشیان كرد لە وەڵامیاندا بڵێن لە ئێوەش).

---

[1] اخرجه ابو داود (٢٦٤٥) والترمذي (١٦٠٤)، والنسائي (٤٧٨٠) وقد رجح ترمذي فيه الارسال و نقله عن شيخه البخاري.

[2] البقرة: ٢١٨

**حەوتەم:** لەو شتانەی تر پێش ناخرێن لە دانیشتنەکانوکۆڕو کۆبوونەوەکانداو ڕێگەشیان بۆ فراوان ناکرێت تا بە ئارەزووی خۆیان بێنو بڕۆن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( اذا لقيتموهم في طريقهم فاضطهر وهم الى اضيقيه)[1]

واتە: ( ئەگەر پێتان گەیشتن لە ڕێگەدا ناچاریان بکەن کەلە ڕێگە تەسكو تەنگەبەرتر بنیاندا بڕۆن ڕێگەیان لێ ناگیرێ لە تێپەڕینو ڕۆیشتن بەڵام ڕێگەشیان بۆ فراوان ناکرێت پێش ناخرێن لە کاتی ڕۆیشتندا وەکو چۆن بۆ موسوڵمانان فراوان دەکرێتو ڕێگەیان بۆ دەکرێتەوە تا بڕۆن، وازیان لێدەهێنرێت کەلە ڕێگەکانەوە بڕۆن وەك سوکایەتیەك بۆیان، چونکە خوای گەورە سەرزەنشتی کردوون.

**هەشتەم:** ڕێگەنەدان پێیان لە چونە ناو مزگەوتی حەرام لە مەکەی پیرۆزو دەوروبەری، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَاۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾[2]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە چاك بزانن هەرچی هاوبەش دانەرو موشریکە ناپاکو پیسن لە بیرو باوەڕو نییەتیاندا، دوای ئەم ساڵەیان (ساڵی نۆیەمی کۆچی) نابێ نزیکی کەعبەی پیرۆز ببنەوە، ئەمە ئەو ساڵەبوو کە ئەبوبەکر رەزای خوای لێبێت حەجی پێکردنو سورەتی بەرائەش هات، خۆ ئەگەر لە هەژاری دەترسان بە نەهاتنی ئەوان بۆ کڕینو فرۆشتن بۆ بازاڕەکانی مەکە دڵنیابن ئەگەرخوا بیەوێ لە ڕۆزی خۆی دەڵەمەنتان دەکات، چوون بەراستی خوا زانایەو کارزانو کار جوانە).

---

[1] اخرجه البخاري في الادب المفرد (١١٠٣) و مسلم(٢١٦٧) والترمذي (١٦٠٢) وابو داود (٥١٠) من حديث ابي هريرة رضي الله عنه، واحمد (٧٥٦٧)، وقال الترمذي: هذا حديث حسن الصحيح

[2] التوبة: ٢٨

لە کاتێکدا کە ئەم ئایەتە دابەزی پێیغەمبەر ﷺ عەلی ڕەزای خوای لێبێت نارد بۆ وەرزی حەج کردن بانگی دەکرد کە لەم ساڵ بە دواوە هیچ هاوبەش دانەرێك نابێت بێت بۆ حەجکردن وە ناشبێت بە رووتی حەج بکەن[١].

قەدەغە کرا لێیان کە ئیتر بچنە ناو حەرەمەوە لەو مێژووە ئەم قەدەغە کردنەش تا رۆژی دوایی بەردەوام دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

(( چاك بزانن کە هەرچی هاوبەش دانەرە پیسن‌و نابێت نزیکی مزگەوتی کەعبە ببنەوە)) مەبەست لە قەدەغە کردنیان تەنها مزگەوتەکە ناگرێتەوە بەڵکو حەرەم‌و دەورووبەریشی (فلا تقربوا المسجد الحرام بعد عامهم).

**نۆیەم**: وە لەو شتانەی تر کە لەبەر بێ باوەڕ کردنی هاوبەشدانەران‌و بێباوەڕان دێتە کایەوە ئەوەیە کەپێویستە لەسەر کار بەدەستان کە لە دورگەی عەرەبی وەدەریان بنێن[٢]، لەبەر ئەوەی دورگەی عەرەب کانگەی پەیام‌و بانگەوازی ئیسلامە. جا دروست نییە کە هیچ ئاینێکی تر جگە لە ئاینی ئیسلامی تێدا بێت بۆیە نابێت نیشتەجێی دورگەی عەرەبی بن بە شێوەیەکی بەردەوام، ئەگەر هات بە شێوەیەکی گەشتیاری یان بازرگانی یان بۆ کارێ نێرراو لە باڵوێز خانە یان بۆ هەرکارێکی تر لە کارەکان‌و ئەرکەکان، یان موسوڵمانان خۆیان هێنایانن بۆکارێ کە جگە لەوان کەس لێی نازانێ ئەوا قەدەغە نییەو ڕێگری ناکرێت، بەڵکو ئەوەی قەدەغە کراوە ئەوەیە

---

١ اخرجه البخاري (٣٦٩)، و مسلم (١٣٤٧) من حديث ابوهريرة رضي الله عنه

٢زانای پایە بەرز (صالح الفوزان لەسەر ئەمە دەفەرموێت: ئەمە لە تایبەت مەندی کاربەدەستانی موسوڵمانانە دروست نیە بۆتاك تاكی خەڵكی هەستن بە دەركردنیان وەكو لە ئێستادا نەزانەكان‌و گەنجەكان ئەوانەی بە بیرو بۆچوونی خەواریجیەكان كاریگەرن هەڵدەسن بە كوشتنی ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵدا بەستراوە دڵنیا كراوانەی تێدا نیشتەجێن، ستەم لەو پەیمانەی موسوڵمانان دەكەن لەگەڵ ئەوانەد ناپاكی ئەو پەیمانەدەكەن بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "هەركەسێ كەسێ بكوژێ كە پەیمانی لەگەڵدا بەستراوە بۆنی بەهەشت ناكات"

کەبتوانن جێگرى‌و چەسپاو خاوەندارێتیان هەبێت لە دورگەی عەرەبدا، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی مردنیدا فەرمووی: (اخرجوا الیهود والنصارى من جزیرة العرب)[1]، واتە: (گاورو جولەکە وەدەرنێن لە دورگەی عەبەرەبیدا) و دەفەرموێت ﷺ ((لا یبقى في جزیرة العرب دینان))[2] واتە: (لە دورگەی عەرەبیدا دوو ئاین نامێنن) جا عومەرﷺ ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەریﷺ جێبەجێکرد، گاورو جولەکەی لە دورگەی عەرەبی دەرکردو لێیانی پاکردەوە، بەڵام ئەگەر هاتنە ناوەوەیەکی کاتی بۆ کارێکی سەر شانیان لە ئەرکەکانیان یان وەك نێراو لە دورگەی عەرەبیدا، جا نەتوانن دروشمەکانیان دەرخەن‌و نەشتوانن کەنیسە دروست بکەن لە وڵاتی موسوڵماناندا بەڵکو تەنها کارەکە لەسەر ئەوە کورت دێنێ لە نێوان خۆیانداو لە شوێنەکانی نیشتەجێبوونە کاتییەکانیانداو بێ باوەڕی خۆیان دەرناخەن لەوڵاتی موسوڵماناندا تا خاچ دابنێن لە نا

١ورد ذلك في جملة من الاحادیث منها.

- عن ابن عباس ﷺ بلفظ (اخرجوا المشركین من جزیرة العرب) اخرجه البخاري (٣٠٥٣) ومسلم (١٦٣٧) و ابو داود (٣٠٢٩).

- عن عمر بالخطاب ﷺ بلفظ: (للاخرجن الیهود والنصرى من جزیرة العرب حتى لا ادع الى مسلماً) واتە: " بەردەوام هەوڵ دەدەم بە دەرکردنی گاورو جولەکە لە دورگەی عەرەبی تاوای لێدەکەم جگە لە موسوڵمانی تێدانەبێت" اخرجه المسلم (١٧٦٧)، و ابو داود (٣٠٣٠)

عن _أبي عبیدة بن جراح ﷺ بلفظ (اخرجه الیهود و الحجاز و اهل النجران من جزیرة العرب)أخرجه أحمد(١٦٩١)و (١٦٩٤)وصححه الالباني.

٢ اخرجه الطبراني في الاوسط (١٠٦٦) عن عائیشة رضي الله عنها بلفظ لا یترك في جزیرة العرب دینان" واتە: " دورگەی عەرەبی وازی لێناهێنرێ بە بوونی دوو ئاین تیایدا"، واخرجه ابو عبیدة في الاموال ص(١٠٧) رقم ٢٧٢ موفوقا على عمر ﷺ بلفظ "لا یجتمع" "کۆ نابێتەوە" و مالك في الموطأ (٢/٨٩٢- ٨٩٣) عن ابن شهاب الزهري مرسلا ان رسول ﷺ قال: (لا یجتمع دینان في جزیرة العرب)، واتە: ( کۆ نابێتەوە دوو ئاین لە جەزیرەی عەرەبیدا) قال مالك: قال ابن شهاب: ففحص عن ذلك عمر بن الخطاب حتى اتاه الثلج والیقین ان رسول الله ﷺ قال: لا یجمع دینان في جزیرة العرب فاجلى یهود خیبر والنظر بالتمهید (١٢/٣١١- ٣١٣) ط الفارع الحدیث.

قووسەكەیان بدەن بەڵكو ئەوە لە نێوان خۆیاندا دا بنێت لە كاتی مانەوەیاندا دەرنەكەوێ لە وڵاتی موسوڵمانانداو وە ئەوەش تایبەت نییە تەنها بە جولەكەو گاورەوە بەڵكو هەموو هاوبەش دانەران لە گۆڕ پەرستانو جگە لەوانیش، كە نەتوانن جێ نزرگا دروست بكەن وە نەتوانن كە مزگەوت دروست بكەن لەسەر گۆڕەكان.

جا پێویستە لەسەر كاربەدەستانی موسوڵمانان كە ئەو جێ نزرگایانە بڕوخێنن، وە هەروەها هاوبەش دانەرێك نابێت رێی پێ بدرێ كە هاوبەش دانانەكەی دەر بخات لە وڵاتی موسوڵماندا.

**دەیەم:** وە لەو شتانەی كە لە ئەنجامی بێ باوەڕ كردنی هاوبەش دانەرانو بێ باوەڕانەوە دێتە كایەوە ستایش نەكردنو پیاهەڵدانەدانیان لەبەر ئەوەی خوای گەورە گلەیی و گازەندەی لێداونو وە ئەوانە دوژمنانی خواو پێغەمبەرن ﷺ، جا چۆن ستایش دەكەن؟هەندێ لە خەڵكی دەڵێن: (ئەمانە سەرراستو راستگۆن، مامەڵەیان جوانە پیایانا هەڵدەداتو دەڵێت، موسوڵمانان هەیانە فێڵبازو ناپاكن، ئێمەش دەڵێن موسوڵمانان ئەگەر هەندێكیشیان سەرپێچیان هەبێتو فێڵبازبن ئەوا ئەوان باشترینی خەڵكی سەر زەوین بەڵام بێ باوەڕان هەموویان دژی خواو پێغەمبەرن ﷺ (هەرچەندەش شتی واجوانیشنیان هەبێت لە سیفەتە جوانەكان مامەڵەی پێدەكەن لە ژیانی رۆژانەیاندا، جابە هیچ شێوەیەك دروست نییە ستایش كردنیان لە كاتێكدا خوا گلەیی لێیانە بەوەی بێ باوەڕن، وە ئەوەی پێویستە لەسەر ئێمە گازەندەیان لێبكەین لەبەر بێ باوەڕیان بە خوای گەورە.

**یانزەیەم:** وە هەروەها لەوشتانەی كەلە ئەنجامی بێ باوەڕكردنی هاوبەش دانەرانو بێ باوەڕانەوە دێتە كایەوە ئەوەیە قەدەغەیە خۆ چواندن پێیانەوە لە پۆشاكەكانیانو نەریتەكانیان كە تایبەتە بە خۆیانەوە، خۆ چواندن پێیان لە پەرستنەكانیان توندو خراپترە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من تشبه بقوم فهو منهم)[1]، واتە: (هەركەسێك

١اخرجه احمد (٥١١٤، ٥١١٥)، و ابو داود (٤٠٣١) و غيرهما، و صححه الالباني والله اعلم.

خۆی بچوێنی بە هەر گەلو نەتەوەیەکەوە ئەوە لەوانە(، وە ئەوە لە لقەکانی بێ باوەڕکردنیانەو دوژمنایەتی کردنیانە، لەبەر ئەوە خۆ چواندن پێیان لە ڕوکەشدا بەڵگەی خۆشەویستیانە لە ناخدا، وە ئەگەر موسوڵمانیش رقی لەو شتانە بێت کە خۆ چواندنە پێیانەوە، وە پێویستە لەسەر موسوڵمانان کە شانازی بە ئاینەکەیانەوە بکەن خۆیان نە چوێنن بە بێ باوەڕانەوە لە پۆشاکدا وە لە نەریتە تایبەتەکانیان، وە خراپتریش لەوە ئەوەیە کە خۆ چواندنە پێانەوە لە ئاینەکەیاندا بەوەی شتێك دابنێن لە ئاینەکەماندا کە لەوەی ئەوان بچێت لە شتە داهێنراوەکان، بۆ وێنە (ئاهەنگێران بە لەدایك بوونەکانەوە) ئەوە خۆ چواندنە بەبێ باوەڕەکانەوە ئەوانەی ئاهەنگ دەگێڕن بە لەدایك بوونی عیسا سەلامی خوا لە خۆیو دایکی بێت. ئیمە خۆمان نا چوێنین پێیانەوە لە نەریتیانو پەرستەنەکانیانو پۆشاکە تایبەتەکانیانەوە.

**ئەوەی ماوەتەوە بزانین ئەو شتانە چین کە دروستە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن پێیانەوە، چەند بڕیارو یاسا هەیە کە دروستە بۆموسوڵمانان کە لەگەڵ بێباوەڕاندا ئەنجامی بدەن چونکە بەشێك نییە لە خۆ شەویستیو دڵسۆزی بۆیان بەڵکو لەو شتانەیە کەرێگە دراوە پێی لە شتە بەسودە هاوبەشەکان جا دروستە بۆمان**

یەکەم: کە مامەڵە بکەین لەگەڵ بێ باوەڕانداو بازرگانیان لەگەڵدا بکەینو شتیان لێبکڕین پێیان بفرۆشین (لەو شتانەی کە دروستە کڕینو فرۆشتینان پێوە بکرێت لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا.. وەرگێڕ).

دووەم: وە دروستە بۆمان کە سودمەند بین لە پسپۆڕیانو بە کرێیان بگرین بۆ هەستان بەو کارانەی کە لە لای موسوڵمانان کە سانێك نین کە هەستن بە ئەنجام دانی، بەڵام بە کرێیان ناگرین تا شارەزایان بکەین بە کارەکانو شتە تایبەتەکانی خۆمان وەك ئەوەی بیانکەینە وەزیرو راوێژکارەکان بەڵکو تەنها بۆ ئەوە بە کرێیان دەگرین

بەڵکو هەستن بەو کارانەی کە دوورە لە نێهێنی موسوڵمانانەوە وەك خەریك بوونیان لە دروستکردنی خانوبەرەو باڵەخانەکانو کارکردن لە کارگەکاندا کە هیچ نهێنییەکی تێدا نییە، وە پێغەمبەر ﷺ بێ باوەڕێکی بە کرێ گرت تا ڕێگەی پێ نیشان بدات لە گەشتی کۆچکرنیدا، (عەبدوڵای کوڕی ئەریقطی) بە کرێی گرت تا ڕێگەی پێ نیشان بدات چونکە ئەو پیاوە کەسێکی هێمنو شارەزاو زیرەك بوو[1].

سود لە پسپۆڕی شارەزایان وەردەیگرین بە مەرجێك لە نهێنی کارو شتە تایبەتەکانی خۆمان ئاگاداریان نەکەینو شارەزا نەبن.

سێیەم: وە دروستە بۆمان لەگەڵیاندا پەیمان ببەستین ئەگەر لەوەشدا بەرژەوەندی موسوڵمانی تێدابوو، بێ گومانە کە پێغەمبەر ﷺ ئاشتەوایی ڕێکەوت لەگەڵ جولەکەکانی ناو شاری مەدینە[2]، وەرێکەوت لەگەڵ هاوبەش دانەران لە ئاشتەوایی حودەیبیەدا[3]، جا ئەگەر لەوەدا کە ڕێکەوتنەو ئاشتەواییە بەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدابوو یان موسڵمانان توانای شەڕکردنیان نییە لەگەڵ بێ باوەڕاندا دروستە بۆیان پەیمان ببەستنو ئاشتەواییان لەگەڵدا بکەنو ڕێکەون لەگەڵیان لەوەی کەبەرژەوەندی موسوڵمانانی تێدایە[4].

---

١ اخرجه البخاري (٢٢٦٣- ٢٢٦٤) من حديث عائشة رضي الله عنها.

٢ انظر : زاد المعاد (١٢٦/٣)

٣ اخرجه قصة الحديبية مطولا البخاري برقم (٢٧٣١)و (٢٧٣٢) عن المسرور ابن مغرمة و مروان، ومسلم (١٧٨٥) عن سهل بن حنيف عن البراء و (١٧٨٤) عن انس رضي الله عنهم.

٤ فائدة: قال الحافظ ابن حجر رحمه الله فيفتح (٣٢٦/٦):

"و هەرچی سەبارەت بە جیهاد کردنە دەگەڕێتەوە بۆ لای پێشەواو سنوری نییە لە دیاریکردنی بەرژەوەندی موسوڵمانان کە لە چیدایەو نابێ کەسی تر خۆی تێ هەڵقورتێنێ، ئەوەی کە پێشەوا بە باشی دانا بۆ موسوڵمامانان ئەوە وەردەگرێ بە مەرجێ پێچەوانەی بنچینەکانی ئیسلام نەبێت " ١.هـ

چوارەم: دروستە بۆمان کەپاداشتیان بدەینەوە لە کاتێکدا کە چاکەمان لەگەڵدا دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾[1]

واتە: (خوا ڕێتان لێ ناگرێ لەو بێ باوەڕانەی جەنگیان لەگەڵدا نەکردوون لە ئاینداو لە ماڵو زێدی خۆتان دەریان نەکردوون وەك خوزاعە کە چاکەیان لەگەڵ بکەنو مامەڵەیان لەگەڵ بکەن بە دادگەری بەراستی خوای گەورە دادپەروەرەو خەڵکانی دادپەروەی خۆش دەوێت).

جا ئەگەر کاریکی جوانیان لەگەڵ موسوڵمانandا کرد موسوڵمانانیش ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکەنو پاداشتیان دەدەنەوەو ڕێزیان دەگرن، بەڵام ئەمە بەشیك نییە لە خۆشەویستی بەڵکو تەنها لە رووی پاداشت کردنەوەیەو بەس، وە باوکی بێ باوەڕیش پێویستە لەسەر کوڕە باوەڕدارەکەی کە چاکەی لەگەڵدا بکات بە بێ ئەوەی کە خۆشی بوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ﴾[2]

واتە: (ئێمە دەربارەی دایكو باوك بە مرۆڤمان ڕاگەیاندو ئامۆژگاریمان کرد کە: هەمیشە رفتاری چاکەیان لەگەڵ بکەن، بە تایبەتی لەگەڵ دایکدا، دایکی بە سك هەڵیگرتووە بەلاوازی لەسەر لاوازی، تا لە داوێنی بەربۆتەوە( هاتۆتە ئەم جیهانەو،

[1] الممتحنة: ٨

[2] لقمان: ١٤ – ١٥

شیر برینەوەشی دووساڵی خایاند، کە وایە ئەی مرۆڤ: بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم سوپاسی باوكو دایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەتو ئازارە لە پێناوی تۆدا چێشتوویانە گێڕانەوەشتان هەربۆلای منە دوای زیندوو بوونەوە. هەمیشە گوێڕایەڵیانبەو لە سنوری رەزامەندی خودادا، ئەگەر هەوڵیشیان دا پێیان داگرت لە سەر ئەوە کە شتێك بکەی بە شەریكو هاوبەشم، کە هیچ بەڵگەیەکت پێ نییە، ئەوسا گوێڕایەڵیان مەکە، لەدنیادا لەگەڵ هەردووکیاندا بەشێوەیەکی چاكو پەسەند هاوەڵی بکە، هاوڕێیو هاوکارێکی چاکبە بۆیان بە جلو بەرگو خۆراکی چاك دڵخۆشیان بکە، بەردەوام هەر رێگەی ئەو بگرە کەبەرەو من رێگەی گرتۆتەبەروگەڕاوەتەوە بۆلام ).

جا، پێویستە لەسەر منداڵ کە باش بێت بۆ دایكو باوك بەڵام بەدڵ خۆشی ناون وە نابێت خۆشی بوێن چونکە بێباوەڕن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٢٢)﴾[١]

واتە: (هیچ کۆمەڵێك نابینیت کە باوەڕی بە خواوبەڕۆژەکەی تر هەبێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، هەرچەندە ئەوانە باوکیان یان کوڕو نەوەیان..).

---

[١] المجادلة: ٢٢

دۆستایەتی شتێکەو مامەڵە کردنی باش شتێکی ترە، دایکی ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) هات بۆ لای کچەکەی هاوبەش دانەریش بوو داوای ماڵی لێدەکرد چونکە پێویستی بوو، ئەسمائیش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی وت: (دایکم هات و دەیەوێت پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات لە گەڵمدا من کچی ئەوم و ئەویش دایکمە ئایا ڕازی ببم و پەیوەندیەکەی وەرگرم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ: پەیوەندی کە بە دایکتەوە)[1].

کاروباری ژیانی ڕۆژانەو مامەڵە بازرگانییەکان و پاداشت دانەوەو گۆڕینەوەی وبەرژەوەندی لە نێوان موسوڵمانان و بێ باوەڕاندا کە زەرەری بۆ ئاین نییە، هاوبەش دانەرەکان نێردراویان دەنارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و دانوستانیان لەگەڵ دەکردو دەهاتن بۆ لای ئەویش لە مزگەوتدا بوو، دانوستانیان لەگەڵ دەکرد، ئەم کارانە بەشێك نییە لە دۆستایەتی بەڵکو بەشێکە لە بەرژەوەندی بۆسودە ڕێدراوەکان لە نێوان موسوڵمانان و بێ باوەڕاندا، لەبەر ئەوە خوای گەورە ڕێی داوە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، وە ژن و ژن خوازی لەوانەی خاوەن نامەن لە جولەکەو گاور واتە دروستە ژنیان لێ بێنی نەك بە پێچەوانەوە ژنیان پێ بدەی، وە دروستە خۆشەویستیان و جیاوازی نەکردن لە نێو ئێمەو ئەواندا، ئەوە ڕۆچووە لە بەرامبەریشدا ڕۆچوویەکی زۆری تر هەیە کە دەڵێ: دروست نییە پەیوەندیکردن بە بێ باوەڕانەوە هەرگیز نە بە بازرگانی، نە بە باڵویز خانە نەوبە پاداشت و چاکەکردن، لەبەر ئەوەی لە دۆستایەتی کردنە لە گەڵیاندا.

پێی دەڵێین: ئەوە لە دۆستایەتی کردن نییە، پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان ئەوەو ئەودا، لەنێوان ڕۆچوو وشك هەڵگەڕاو، ئاین ناوەندە نە ڕۆچووەو توندڕەوە نە گوێش بە هیچ ناداتو لاگرە لە نێوان هەردووکیاندایە.

---

[1] اخرجه البخاري (٥٩٧٩)، ومسلم، (١٠٠٣) من حديث اسماء بنت ابى بكر رضي الله عنهما.

پێویستە بزانین ئەم پەیوەندیانە لەگەڵ بێ باوەڕاندا هەیە، کامەی دروستەو کامەی دروست نییە، بە تایبەتی لە ئێستادا کە زۆر بوون ئەوانەی لە بارەی کاروبارەکانی ئاینەوە قسە دەکەن بەبێ زانستو زانیاری، یا قسە لە بارەی ئاینەوە دەکات بە گوێرەی ئارەزووی، بۆیە پێویستە لەسەر فێر خوازی زانستی شەرعی کە حوکمی شەرع لەبارەی ئەمانەوە بزانێ، ئەوەش زۆر گرنگە چونکە پەیوەستە بە بیرو باوەڕی موسوڵمانەوە.




پرسیار: ئایا بێباوەڕ کردنی بێ باوەڕ تایبەتە بەبێباوەڕێ لە بنچینەدا بێ باوەڕ بووە یان بە بێ باوەڕی هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام؟

وەڵام: بەڵێ، بێ باوەڕ کردنی بێ باوەڕ گشتییە بە هەردوو جۆرەکەی بێ باوەڕەوە، (بنچینەیی‌و هەڵگەڕاوەیی)ش، هەرهەمویان یەك مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، بەڵام جیاوازیەك هەیە ئەویش ئەوەیە کە بێ باوەڕێ هەڵگەڕابێتەوە داوای گەڕانەوەی لێدەکرێت بۆ ئیسلام جا ئەگەر گەڕایەوە بۆ ئیسلام ئەوە باشە ئەگەر نا دەکوژرێت، بەڵام بێباوەڕی بنچینەی دروستە پەیمان لەگەڵ بەستنی، بەلام هەڵگەڕاوە وازی لێ ناهێنرێ لەبەر ئەوەی بیرو باوەڕی خراپ کردووە دەست درێژی کردۆتە سەری لە دوای ئەوەی کە حەقی ناسی‌و شارەزا بوو لێی بۆیە پێویستە بکوژرێت چونکە بووەتە ئەندامێکی خراپ‌و بێ کەڵك.

پرسیار: ئایا کەسێك لە دڵیدا گومانی هەبێت لە باوەڕی هاوبەش دانەراندا بە زمان دەری نەبڕێ بێ باوەڕ دەبێت؟ جیاوازی چییە لە نێوان ئەوەو قسەی دەروون؟

وەڵام: گومان لەدڵدا دەبێت، ئەگەر دوودڵ بوو لە هاوبەش دانەراندا ئایە ئەوانە بێ باوەڕن یان نا ئەوە بەوە هەڵدەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر بە زمان دەریببڕێ ئەوە خراپترو توند ترە، بەڵام قسەی دەروون بە گومان دروست بوون ئەوە هیچ زیانی نییە.

پرسیار: دەبینرێ لە کەناڵە ئاسمانییەکاندا کە دەڵێ جولەکەو گاور براماننن لە باوەڕدا، حوکمی ئەوانە چییە؟ ئایا بەوە بێ باوەڕ دەبن؟

وەڵام: هەرکەسێ بڵێ کە جولەکەو گاور برامانن ئەوە بێ باوەڕ دەبێت بەو قسەیەی، مەگەر ئەو کەسەی کە وا دەڵێت نەزان بێت، ئەوا بۆی ڕوون دەکرێتەوە

ئەگەر هەر سور بوو لەسەر قسەکەی ئەوا حوکمی بێ باوەڕی دەدرێت بە سەریدا.
بەڵام ئەگەر گەڕایەوە تەوبەی کرد خوای گەورە تەوبکەی لێ وەردەگرێت.

پرسیار: رێکخەر چییە لە بێباوەڕ کردنی دیاریکراودا (المعین)؟ وە هەیانە کەدەڵێ: هیچ کەسێك بە بێ باوەڕ دامەنێن بە تایبەتی هەتا دەردەکەوێت بۆمان ئەوەی بێ باوەڕی دەکات؟ واتە: ( ئەو کردەوەیە کە ئەنجامی دەدات بێ باوەڕی بوونە زانیشی ئەوجا بە بێ باوەڕ دا بنرێ.....وەرگێڕ).

وەڵام: هەرکەسێ بێ باوەڕی ئاشکرا بکات ئەوا حوکی بێ باوەڕی دەدرێت بە سەریدا، وە هەرکەسێ هاوبەش بۆ خوا دابنێت حوکم دەدەرێت بە سەریدا بەوەی هاوبەش دانەرە، بەڵام لە رۆژی دوایدا تۆ حوکم نادەیت بە سەریدا بەوەی لە ناو ئاگردایە، دەگونجیت کە گەڕابێتەوە تەوبەی کردبێ‌و تۆ نەزانی، کەسی پرسیار کار هەردوو کارەکەی تێکەڵاو کرد، باسی بە کافر دانان، وە باسی حوکم دان بەسەر کەسێکی دیاریکراودا کە لە ئاگردایە.

## وانەی پێنجەم لە راڤەی هەڵوەشێنەری چوارەم

**فەرموودەی چوارەم: هەرکەسێ باوەڕی وابێت کە رێنمونی و ڕێو شوێنی جگە لە پێغەمبەر ﷺ تەواو ترە لە رێنموویی و ڕێوشوێنی ئەو، یان حوکمی جگە لەو باشترە لە حوکمی ئەو، وەکو ئەو کەسەی حوکمی تاغوتەکانی لە حوکمی پێغەمبەر ﷺ پێ باشترە ئەوە بێ باوەڕە.**

**( راڤە )**

ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمووی: چوارەم لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام: - (هەرکەسێك باوەڕی وابێت رێنمویی جگە لە پێغەمبەر ﷺ تەواو ترە لە ڕێنموویی ئەو یان حوکمی جگە لەو باشترە لە حوکمی ئەو تا کۆتایی).

باسی یەکەم: هەرکەسێ باوەڕی وابێت کە رێنموویی جگە لە پێغەمبەر ﷺ تەواو ترە لە رێنمووی ئەو، وە رێنموویی پێغەمبەر ﷺ ئاینەکەیەتی و ئەو ڕێگەیەیە کە لەسەری دەڕوات لە بانگەواز کردن بۆلای خواو لە فێرکردن و لە ئاکارو رەوشتدا، پێغەمبەر ﷺ بێگومان تەواو ترین کەسە لە ناو خەڵکدا لە رێنموویی کردندا هەروەکو پێغەمبەر ﷺ خۆی فەرمویەتی: ( ان خير الكلام كلام الله، وخير الهدي هدي محمد)[1]

واتە: (باشترین وتەو قسە وتەو قسەی خوایە، وە باشترین رێنمویی رێنمویی پێغەمبەر (ﷺ)ە.

---

١ اخرجه المسلم (٨٦٧ ) عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما.

جا ئەو تەواو ترینی خەڵکە لە رووی ڕێنووییەوە لە مامەڵە کردنیدا لەگەڵ خەڵکدا وە لەگەڵ بانگکراواندا، لە ڕێنمووی کردنی لەگەڵ خەڵکیدا، ئەوە بووە کە بە باشترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، وە بانگیان بکات بە باشترین ڕێگەو شێوە.

هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾[1]

واتە: (بەراستی تۆ لەسەر خوڕەوشتێکی ئێجگار پەسەندو گەورەیت).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ ﴾[2]

واتە: (بەهۆی رەحمەتو بەزەیی‌و میهرەبانی خواوەیە تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ ئەوەندە نەرم‌و نیان بووی لەگەڵیان، سەرەڕای ئەو هەموو سەرپێچی‌و نافەرمانییەیان لە ئوحودا کردیان خۆ ئەگەر کەسێکی توندو قسە رەق‌و دڵ رەق بای دەوروبەریان چۆڵ دەکردی‌و لێت دوور دەکەوتنەوە، دەسا تۆ لە ئازارو هەڵەکانیان ببخشە لە خواش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە تا لە هەڵەو تاوانەکانیان ببوریٚ، وە لە تەواو کارەکانیشدا پرس‌و راو مەشۆرەت‌و راوێژیان پێ بکە).

ئەوە ڕەوشتییەتی ﷺ خەڵکی فێردەکردبە بەباشترین شێوە، هەرگیز لە فێرکرندا رق‌و تورەیی بەکار نەدەهێنا هەروەکو چۆن لە چیرۆکی ئەو پیاوەی کەهاتە ناو مزگەوت میزی تێداکردفەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد کە وازی لێبێنن تا میزەکەی تەواو دەکات، پاشان فەرمانی بە هێنانی دۆڵکە ئاویٚ کردو کردیان بەسەر میزەکەدا پاشان

[1] القلم: ٤
[2] آل عمران: ١٥٩

بانگی کردو پێی فەرموو: ((إنَّ المساجِدَ لَمْ تُبْنَ لِذلكَ، وإنَّما بُنِيَت لِذكرِ اللهِ عَزَّ وَجَلْ))[١].

بێگومان مزگەوتەکان بۆ ئەمە دروست نەکراوە بەڵکو بۆ ئەوە دروست کراوە کە یادی خوای بەرزو بەڕێزی تێدا بکرێ ( دەبینین، وە جگە لەمانەش لە چەندین شوێنی دیدا کە بەچاکترین رێگەو شێوەو تەواو ترین رێنمویی مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا کردووە لەکاتی فێرکردنیاندا ).

هەر لەو بارەشەوە چەندێ بەرگەی ئازاری خەڵکی گرتووەو تووڕەش نابێت، لەکاتێکدا کە خراپە کراوە دەربارەی خۆی ﷺ، وە زۆر هێواش وهێمنو لەسەر خۆ بوو، لەگەڵ کەسە تاوانبارەکەدا، بەڵام ئەگەر قەدەغەکراوکانی خوا بەزێنرایە ئەوە تورە دەبوو هەرگیز لەبەر خودی خۆی تورە نەدەبوو بەڵکو تەنها لە پێناوی خوادا تورە دەبوو، ئەوەش شتێکی جێگرو زانراوە لە سوننەتەکانیدا ﷺ [٢]. وە هەروەها لەو کاتەشدا کە پیاوەکە هات بۆ لایی و داوای قەرزەکەی دەکردەوەو لە قسە کردنی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان لێی راپەرین پێغەمبەر ﷺ فەرموی ((دعوهُ فان لصاحبِ الحَقِ مَقالاً)) واتە: (وازی لێبێنن چونکە خاوەن حەق قسەی خۆی هەیە)، پاشان فەرمانی کرد لەوەی خۆی باشتری بدەنێ کە داویەتی بە پێغەمبەر ﷺ، ئەوانیش لەوەی خۆی باشتریان دایەو پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (خَيْرُكُمْ أحْسَنُكُمْ قَضَاء)[٣]

واتە: (باشترینتان ئەوەیە لە کاتی دانەوەی قەرزدا باشتری بداتەوە).

---

١اخرجه البخاري (٢١٩) ومسلم (٢٨٤– ٢٨٥) من حديث انس بن مالك رضي الله عنه.

٢اخرجه البخاري (٦١٢٦)، ومسلم (٢٣٢٧) عن عائشة رضي الله عنها قال: "ومانتقم رسول الله لنفسه في شيء قط الا ان تنتهك حرمة الله فينتقم بها الله"

٣اخرجه البخاري ( ٢٣٠٦)، ومسلم (١٦٠١)من حديث ابي هريرة رضي الله عنه.

وە هەروەها ڕێنمویی پێغەمبەر ﷺ لە مامەڵەکردنی لە ناو ماڵو خێزانەکانیدا. مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکانیدا بە باشترین شێوە دەکرد، وە دەیفەرموو: (خيركم خيركم لاهله وانا خيركم لاهلي)[1].

واتە: (باشترینتان باشترینتانە بۆ ماڵو خێزانی منیش باشترینتانم بۆ ماڵو خێزانم).

ئەوە شتێکی زانراوە لە ژیانیدا، کەس ناتوانێ وەکو پێغەمبەر ﷺ بێت لە رفتارو خورەوشتو ڕێنمویدا.

جا چۆن دەبێت لەو باشتر بێت؟ جا هەرکەسێ وا گومان ببات کە کەسێ هەیە باشترە لە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێنمویدا ئەوە بێگومان بێباوەڕە، بێ باوەڕی گەورە کە دەری دەکات لە بازنەی ئیسلام.

**باس و بابەتی دووەم:**

(هەرکەسێ باوەڕی وا بێت کە حوکمی جگە لە پێغەمبەر ﷺ باشترە لە حوکمی ئەو ئەوە بێگومان بێ باوەڕە.

لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە گەیەنەرە، حوکمی پێغەمبەر ﷺ حوکمێکە لە خواوە دەردەچێت، هەروەکو خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ ﴾[2]

واتە: (ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ ناردوی کەبێگومان هەمووی ڕاستو حەقە ساتۆش ئەم قورئانە هەروەك خوا ڕێی پێ نیشان داویت دادپەروەرانە داد پەروەری خەڵك بکە).

---

[1] الخرجه احمد (٧٤٠٢) عن ابي هريرة، والترمذي (٣٨٩٥) عن عائشة واللفظ له وقال ترمذي: هذا حديث حسن غريب و صحيح الالباني رحمه الله.

[2] النساء: ١٠٥

هەورەها دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾[١]

واتە: (دیسان دەبێت هەر بەو بەرنامەیە هەر لە ناو جولەکەو گاورو خەڵکانی تریشدا حوکم بڕیار بدەیت کە خوا ناردوویەتی).

جا پێغەمبەر ﷺ تەنها بەوە حوکم دەکات کە حوکمی خوایەو خوا پیشانی داوە وە پێی نەفەرموو: بەوەی دەیبینیت خۆت بەڵکو فەرمووی: بەوەی خوا نیشانی داویت، بۆیە پێویستە حوکمی پێغەمبەر ﷺ وەربگریێو تەسلیمی بن ملکەچی بۆ بنوێنن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾[٢]

واتە: (سوێند بێت بە پەروەردگارت ئەی محمد ﷺ (نا بنە باوەڕدار تا بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ نەکەنە دادوەرو ئەوساش بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە هیچ تەنگییەکیان دەست نەکەوێ لە دەرونیانداو بەچاکی تەسلیمو مل کەچ بن).

ئەو پێغەمبەرە ﷺ بە حوکمی خوا دادوەری دەکات، ئەگەر بە هەڵەشداچوبێ لە هەندێ لە کۆششەکانیدا ئەوا خوای گەورە لەسەر هەڵە رازی نابێت بەڵکو راستەکەی بۆ روون دەکاتەوە وە دروستیش نییە رەخنە گرتن لەسەر حوکم دانەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴾[٣] واتە: (بۆ هیچ پیاوێکی باوەڕدار نییە کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاری شتێکیاندا سەر پشککرانیان بۆ هەبێ لە

---

[١] المائدة: ٤٩
[٢] النساء: ٦٥
[٣] الأحزاب: ٣٦

کارەکەیاندا واتە بۆیان نییە خۆیان بارێك هەڵبژێرن بەڵکو دەبێت بێ بیر لێکردنەوە فەرماندارو ملکەچبن، هەرکەسێك سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ بەو شێوەیە کە جگە لەبڕیارەکانی ئەوان کارێکی دی هەڵبژێرێ بۆ خۆی ئەوە بێگومان گومڕابووەو بە گومڕابونێکی ئاشکرا).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾﴾[1]

واتە: (وە هەرچی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن واتە بەچی فەرمانی پێکردن چ لەم دەسکەوتەداوچ لەهەرشتێکی تردا جێبەجیی بکەن، وە رێشی لە هەرشتێ لێگرتن ئێوەش دەستی لێ هەڵبگرن ).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾﴾[2]

واتە: (قسەو گوفتاری ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە هەواو ئارەزووی خۆیەوە نییە، بەڵکو ئەوەی رایدەگەیەنێت تەنها وەحیو نیگای خوایە).

ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ وەحییە لە خواوە، سوننەتیش قورئان راڤە دەکاتە وە وەحیشە، سەرچاوەی دووەمە لە دوای قورئان بۆیە پێویستە رێزی لێبگیرێ وەکو چۆن ڕێز لە قورئان دەگیرێ. هەروەها دەبێت وەریش گیرێت هەروەکو چۆن قورئان وەردەگیرێت، هەرەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾﴾[3]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پێشی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ مەکەون و لە بڕیارو پێشنیاردا، خۆتان لە نافەرمانێکی خوای گەورە بپارێزن، چونکە بەڕاستی خوا بیسەرە بە گوفتارتان زانایە بە نیازو نهێنییەکانتان).

---

[1] الحشر: ٧

[2] النجم: ٣ - ٤

[3] الحجرات: ١

وە پێویستە لەسەر موسوڵمان کە ئەحکامەکانی ئاین لە قورئان‌و سوننەتەوە وەرگرن، کە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە هیچ شتێکدا بە بۆچوونی دوور لە بەڵگە حوکم نەدات یان بە باشی بزانێت، بەڵکو هەرچی یاساو ئەحکامەکانە لە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگرێت.

وەدروست نییە بۆ هیچ کەسێ کە قسەی فلانێ پیش قسەی خواو پێغەمبەری خوا بخات ﷺ، هەرکەسێ ئەو کارە بکات ئەوە پێش خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کەوتووە.

وە دروست نییە بۆی کە ژیری‌و بیری تێدا بەکار بهێنی یان بۆچوونی جگە لەو وەربگرێت لە شتێکدا کە پێچەوانەی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ی خوا ﷺ بێت.

وە پێویستە بیروباوەڕ وابێت کە هەرچی حوکمی خواو پێغەمبەری خوا هەیە ﷺ هەق‌و راستەو هەرچییەك پێچەوانەی ئەو دوانەبێت ئەوە پوچە، ئەمە بیرو باوەڕێکە کە موسوڵمانان باوەڕی پێیەتی، جا هەرکەسێ بۆچوونی وابێت کە حوکمی دروست کراو باشترە لەحوکمی خوای گەورە وە حوکمی جگە لە پێغەمبەر ﷺ باشترە لە حوکمی ئەو، ئەوە بێگومان بێ باوەڕە ئەویش لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامە.

## بابەتی فەرمان ڕەوایی كردن بە جگە لەوەی خوا داییەزاندووە

وە هەركەسێ وا گومان ببات كە كات گۆڕاوە، وە وا گومان ببات كە حوكمی قورئانو سوننەت لە كاتێكدا بووە كە بەسەر چووە، وە بارودۆخ لە كاتی ئێستادا وا پێویست دەكات كە حوكمی گونجاو بهێنرێت لەگەڵ كاتی ئێستادا بگونجێت وەكو دەڵێن ئائەمە هەڵگەڕانەوەیە لە ئاینی ئیسلام.

ئەو كەسەی دەبینێت كە حوكمی شەریعەتی ئیسلام بۆ كاركردن ناگونجێت لەم كاتەدا بەڵكو دەبێت كۆمەڵێك یاساو ڕژێمی وا بهێنرێت كە لەگەڵ كاتدا گونجاو بێت بەگومانی خۆیان، كە ئەوەش بێباوەڕییە بە خوای بەرزو بەڕێز، لەبەر ئەوە شەریعەت گونجاوە بۆ هەمو كاتو شوێنێك تا ڕۆژی دوایش، وە پێویستە باوەڕی وابێت، بەلام ئەگەر بۆی ڕوون نەبووبێتەوە ئەوە لە ناتەواوی خۆیەتیو ولە ناتەواوی هەست كردنییەتی نەك لە ناتەواوی شەریعەت بێت.

وەهەیە دەڵێت: (كە جێبەجێ كردنی سزای بەزاندنی سنورەكانو بەردباران كردنی داوێن پیس لە ژنی شوكردوو پیاوی ژن هێنراو وە بڕینی دەستی دز، وە كوشتنی كەسی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام ئەم یاسایانە توندن لەگەڵ كاتی ئێستادا ناگونجێن كە ژیان پێشكەوتووەو ژیریەكان پیشكەوتنیان بە خۆوە دیووە، جا بۆیە گونجاو نییە جێبەجێكردنی سزای سنورەكان، وەنابێت هەستان بە كوشتنەوەی بكوژ لەبەر ئەوەی دڕندەیەتییە( ئەم جۆرە دوو ڕووانە لە لایەن هەندێك دووڕووەوە دەردەچێت هەڵەگەڕانەوەیەكی ئاشكرایە، لە ئاینی ئسلام، لەبەر ئەوە ڕەخنە گرتنە لە حوكمی خوا، وە وا دادەنێت كە حوكمی خوا كەمتەرخەمەو گونجاو نییە، وە ئەوەشە هەڵگەڕانەوەیەكی ڕاشكاوە لە ئاینی ئیسلام.

وە هەروەها ئەوەی دەڵێ: (ئەو سەرپشكە لەوەی كە حوكم بە شەریعەت بكات یا حوكم بە یاسا دانراوەكان بكات، ئەگەر ویستی حوكم بە شەریعەت دەكات وە ئەگەر

ویستی حوکم بە یاساکان دەکات کە مرۆڤ خۆی دایناوەن)، جائەوەی کە ئەم وتەیە دەڵێ هەڵگەڕاوەتەوە لە ئاینی ئیسلام، لەبەر ئەوە حوکمی خوا سەرپشکی تێدا نییە هەرکەسێ بیەوێ وەریبگرێ هەرکەسێکیش بییەوێ وازی لێبێنێ، بەڵکو حوکمی خوای گەورە ناچارییە هەر دەبێت ملکەچ بین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾[1] واتە: (دیسان دەبێت هەربەو بەرنامە لە ناو جولەکەو گاورو خەلکانی تریشدا حوکمو بڕیار بدەیت کە خوا ناردویەو نابێ شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوان بکەویو چەواشەت بکەن).

جا حوکمی خوا ناچارییە، وە جگە لە حوکمی خوا هیچ بەکەڵکی خەڵك نایەت کارەکەی سەرپشکی نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾[2]

واتە: (بۆ هیچ پیاو ژنێکی باوەڕدار نییە کاتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاری لە کارێکیان دا سەرپشکردنیان بۆ هەبێت لە کارەکەیاندا، هەرکەسێ سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بەو شێوەی کە جگە لە بڕیارەکانی ئەوان کارێکی تر هەڵبژێرێ، بۆ خۆی ئەوە بێگومان گومڕا بووە بە گومڕابونێکی ئاشکرا).

جا فەرمان ڕەوایی کردن بەوەی کە خوا دایبەزاندووە جۆرێکە لە جۆرەکانی پەرستن، بۆیە پێویستە لەسەر بەندەکان ملکەچی فەرمانی خوای بەرزو بەرێز بن، وە دەبێت باوەڕیان وابێت کە هیچ شتێك وەکو ئەو نییەو باشتر نییە لێی، هیچ کەس

---

[1] المائدة: ٤٩

[2] الأحزاب: ٣٦

گومـان نـەبات كارەكـە سەرپـشككردنەو خـەڵكی ئـازادن وەك ئـازادی بۆچـوونو بـیر كردنـەوە، وە هاوشـێوەی ئـەوە لـەوەی بانگـەزای بـۆ دەكـات لـە بـێ بـاوەڕان و دوو ڕووەكانو عەلمانییـەكان، ئەوانـەی ئەمـە وتەیانـە بێگومـان بـێ بـاوەڕن، لەبـەر ئـەوە گوێڕایەڵی فەرمانی خوا نابن لە حوكمەكانیدا، پاكو بێگەردی بۆ خوای گـەورە، ئەوانـە خۆیان بە گەورە دەگرن لە بەرامبەر حـوكمی خـوای بـەرزو بـەڕێزدا، هـەروەها كەسـێ دەڵێ: حوكمی خواحەقە بەڵام پێویست بە پابەند بوون ناكات پێیـەوە، وە دروستیـشە بۆ مرۆڤ كە حوكم بە جگە لە حوكمی خوا بكات، وە لەگەڵ سەردەمدا بڕوات ئەگـەروای بەباش زانی، ئەوە هەڵگەڕاوەتەوە لە ئاینی ئیسلام، لە بەر ئەوەی دروست نییە حـوكم بكات بە جگە لەوەی كە خوای گەورە دایبەزانـدووە، وە هـەموو حـوكمێكیش جگـە لـە حوكمی خوا پوچو بەتاڵە.

وە هەروەها ئەوە كێشەكانی نێوان خەڵكی چارەسەر ناكات بـەڵكو كێشەكانیان بـە دروستكردنی كێشەی تر زیاد دەكات، ئەگەر بەوە بڵێیـت: ئەمـە حـوكمی خـوای بـەرزو بەڕێزە بۆیشی نییـە هیـچی تـر تـەنها وەرگرتنـی حوكمەكـەی خوانـەبێت وەكـو خـوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾[1]

واتــە: (وتــەو گوفتــاری بــاوەڕ دارەكــانیش كــاتێ بــانگ دەكــرێن بــۆلای خــواو پێغەمبەرەكەی ﷺ بۆ ئەوەی لە نێوانیاندا داوەری بكات، هەر ئەمەیە كە دەڵێن: ئـەو بیستمانو گوێڕایەڵیشن).

واتە سەرپـشككردن نییـە لـە حـوكمی خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر ویـستت وەریبگری ئەگەر نەشتەوێت وەرینەگری بەڵام ئەگەر بە ویستی خـۆت بتـەوێ لـە مـافی

---

[1] النور: ٥١

خۆت خۆش بیت ئەوە شتێکی ترە، بەڵام کە بڵێی نامەوێ (رازی نیم) وە دەڕۆم بۆ دادگا یاساییەکان ئەمە هەڵگەڕانەوەیە لە ئاینی ئیسلام.

بەڵام ئەگەر کەسێك باوەڕی وابوو کە دروست نییە فەرمانڕەوایی کردن بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووەو پێغەمبەر ﷺ هیناویەتی بەڵام سەرپێچی دەکاتو بۆ ئارەزوویەك لە دەروونیدا لەگەڵ باوەڕ بوونی ئەوەی کە ئەو کارەی قەدەغە کراوەو ئارەزووی پاڵی پێوەناوە کە ئەو کارە بکات، بە جگە لەوەی کە خوا دایبەزاندووە یان چاوچنۆکی پاڵی پێوە ناوە وەك ئەوەی کە بەرتیلی درایە یان ماڵێکی درایە جا حوکمی کرد بەوەی کە جگە لە خوا دایبەزاندووە واتە یاسا دەستکردەکان لەبەر ئەوەی ماڵێکی دەست بکەوێ وە لە هەمان کاتیشدا باوەڕی وایە کە سەرپێچی کردووە دژیشە بە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ . یان حوکمی کرد بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە لەبەر پێگەیی‌و دەشزانێ کە هەڵەیە ئەو کارەی دەروست نییە ئەوا لەو کاتەدا بی باوەڕ نابێت بە بێ باوەڕ بونێکی دەرکەر لە کۆمەڵی موسوڵمانان بەڵکو بێ باوەڕ بووە بە بێ باوەڕبوونی بچوك، بێ باوەڕی جگە لە بێ باوەڕی. هەروەکو عەبدوڵای کوڕی عەباس دەفەرموێت رەزای خوایان لێبێت: [1]. ئەوەش وادەکات کە بێ باوەڕیەکەی جگە بێباوەڕ بێت، هەرکەسێك کە حوکم بە جگە لەوە بکات کە خوا دایبەزاندووە لەبەر ئارەزوویەکی دەروونی نەك باوەڕی وابێت کە ئەوە دروستە یان باشترە لە حوکمی خوا یان وەکو حوکمی خوا وایە، بەڵکو تەنها ئەوەی پاڵی پێوەنا ئارەزووی بوو لەسەر ئەوە، یان چاوچنۆکی کردن لەبەر دەسکەوتنی ماڵێك یان بە

---

١اخرجه ابن جرير (٦/٣٠٦- ٣٠٧) و ابن ابي حاتم (١١٤٣/٤)، والحاكم (٣١٣/٢) وقال: (هذا حديث صحيح لاسناد ولم يخرجاه). و اقره الذهبي، و لهذا الاثر طرق كثيرة ثابتة عن ابن عباس و تلاميذته طاوس و عطاء و غيرهم انظرها تفسير ابن جرير، و قال شيخ الاسلام ابن تيمية رحمه الله بعد اثبات هذا الاثر عن ابن عباس و تلامذتة (وقد اتبعهم على ذلك احمد بن حنبل و غيره من ائمة السنة)الايمان ص ٢٤٤، ط المكتب الاسلامي.

دەستهێنانی پلەو پایەیەك یان حوکمی کرد بە پێچەوانەی حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لە پێناو ئەوەدا کە حوکمەکەی خوای گۆڕیەوە بەو حوکمە دەستکردە بە بێ ئەوە باوەڕی پێی ببێت، ئەوە بە (بێ باوەڕی کرداری) ناو دەبرێت. ئەوە بێ باوەڕی بچوکەو تاوانێکی گەورەشە لە تاوانە گەورەکانو زۆر مەترسیدارە. بەڵام حوکمی ئەوەی بەسەردا نادرێت کە لە کۆمەڵی موسوڵمانان دەرچووە، لەبەر ئەوەی بیرو باوەڕەکەی هەرماوە.

هەرکەسێك حوکمی کرد بە جگە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە لە ئەنجامی کۆششێکی هەڵە کە لە کۆش کرندا بە دەستی هێناوە توانای کۆششکردنی هەیەو واتە زانایە وە لە کارەکەیشیدا کە کردوویەتی ویستی پێچەوانەکردنی قوئانو سوننەت نەبوو، ئەو دەیەوێت حوکم بەوە بکات کە خوا دایبەزاندووە بەڵام سەرکەوتوو نەبوو بۆ راستەکە، ئەوە وەکو ئەوە وایە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((اذا اجتهد الحاكم فاصاب فله اجران فاذا اجتهد و اخطا فله اجر واحد))[1]

واتە: (ئەگەر دادوەر کۆششی کردو پێکای ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر کۆششی کردو بە هەڵەدا چوو یەك پاداشتی بۆ هەیە.

هەڵەکەی جێگەی لێخۆش بوونە لەبەر ئەوە بە ئەنقەست ئەو شتەی نەکردووە، وە ئەو سور بووە لەسەر ئەوە کە دادوەری بکات بە شەریعەت، وەکۆشاوە بۆ دەستکەوتنی حوکمی شەرعی، بەڵام سەرکەوتوونەبوو لە بەدستهێنانیدا، وە ئەوە پاداشت وەردەگرێت لەسەر کۆشش کردنیو نیەتەکەیو ویستەکەییو لێخۆش بوونی بۆ هەیە لەبەر ئەوەی ویستی ئەو ئەنجامدانی هەڵە نەبووە.

ئەمەش درێژەی ئەو کارو شتانەی کە لەم بابەتە گەورەیەدا هەیە کە کێشەی سەرەکی ئەم سەردەمەی ئێستایە.

---

١.اخرجه البخاري (٧٣٥٢)، ومسلم (١٧١٦)، من حديث عمر بن العاص رضي الله عنه.

لەو شتانەی کە پەیوەستە بەم باتەوە ئەوەیە کە دادوەری بەوەی کە خودا دایبەزاندووە ئەوەنییە کە هەندێ خەڵکی لێی تێدەگەن، ئەوانەی کە دەدرێنە پاڵ بانگەواز کە دادوەری کردنە لە کێشە دارایی‌و مافەکاندا بە تەنها وە داوای هیچ ناکەن تەنها ئەوە نەبێت داوەری بکات بەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە تەنها لە دادگاکانداو بەس بەڵێ ئەوە راستەو هەقە کە دادوەری بکات بەوەی خوا دایبەزاندووە لە کێشەکاندا کە روودەدات لە دادگاکاندا، کێشەکان‌و بەربەرەکانێکان چارەسەر بکرێت، لە نێوان خەڵکیدا بە جێبەجێ کردنی شەریعەت، بەڵام داوەری کردن بەوەی خوا دایبەزاندووە کورتی هەڵنەهێناوە بەس لەوەدا، بەڵکو پێویستە کە داوەری بکرێت بەوەی کە خوا دایبەزاندووە لە بیرو باوەڕەکاندا کە گرنگترین شتە، جا گرنگترین شت بیرو باوەڕە، وە خەڵکیش جیاوازن تێیدا، گومانی تێدا نییە کە دەبێت داوەری بەوە بکرێت کە خودا دایبەزاندووە لە نێوانیانداو بۆیان روون بکرێتەوە بیرو باوەڕی راست‌و دروست لە بیرو باوەڕی چەوت‌و پوچ، بەڵام کە بوترێ: واز لە خەڵکی بێنن لەسەر هەرچییەك هەن لە بیرو باوەڕو راویان مەنێن، هەرکەسەو بیرو باوەڕی خۆی هەیە، ئەوە دروست نییە قسەیەکی زۆر پوچ‌و بەتاڵە، وە هەرکەسێکیش رێگە بدا کە هەر مرۆڤەو خۆی بیرو باوەڕی خۆی هەڵبژێرێ کە دەیەوێ‌و خەڵکیش ئازادن لە بیرو باوەڕدا ئەوە بەو قسەیە هەڵدەگەڕێتەوە لە ئاینی ئیسلام. وە ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە بیرو باوەڕ بە پێی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت لە هەرسێ جۆرەکەی یەکتا پەرستیدا کە ئەوانیش (یەکتایەتی کردنی خوا لە پەروەردگاریەتیداو لە بەندایەتی‌و پەرستنداو لە ناو سیفەتە پیرۆزەکانیدا).

جا یەکتایەتی کردنی خوا لە بەندایەتی‌و پەرستندا پێویستە داوەری بەوە کە خوا دایبەزاندووە تیایدا بەوە دەبێت کە هەرچی پەرستن هەیە تەنها بۆ خوا ئەنجام بدرێت بە تاك‌و تەنها، پەرستنی جگە لەوە هاوبەش دانانی گەورەیەو دەرکەری ئەنجام

دەریەتی لە ئیسلام، پێویستە داوەری کردن بەوە، وە هەر ئەوەش بنچینەیە، وە پێغەمبەر ﷺ موعازی نەناردووە بۆ یەمەن تەنها لەبەر ئەوە نەبێتو پێی فەرموو لە کاتی ناردنیدا: ((فليكن اول ما تدعوهم اليه شهادة ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله))[1].

واتە: (با یەکەم شتێ کە تۆ بانگیان دەکەیت بۆ لای خوا ئەوە بێت کە گەواهی بدەن بە حەق کەهیچ خودایەك نیە شایەنی پەرستن بێت تەنها خوا نەبێت گەواهیش بدەن بەوەی کە محمد ﷺ نێرراوی خوایە.

( نەینارد بۆ ئەوەی کە کێشەکان چارەسەر بکات، بە تەنها بەڵکو بۆ ئەوەی نارد کە بانگەواز بۆلای ئەوبیرو باوەڕ بکات راستیشی بکاتەوە، ئەو هەڵانەی توشی بووە. ئەوەش ئەو کارەیە کە هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت، دەستیان پێکردووەو کە ئەویش دەستکردنە بە بیرو باوەڕ راست کردنەوەو باسکردنی. و دادوەریش دەکات لە سەر هەرکەسێ کە پێچەوانەی بیرو باوەڕی راستو دروست بکات، بەوەی بێ باوەڕو هاوبەش دانەرە، هەرکەسە جگە لە خوا بپەرستێ ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا سەر ببڕێو شت لە سەرخۆی پێویست بکات بۆ جگە لە خواو داوای فریاکەوتن لە مردووەکان بکات ئایا واز لەوە دەهێنرێتو داوەری ناکرێت لەسەری بەوەی کە خوا دایبەزاندووە.

وە ئەگەر کێشەی هەبوو لەگەڵ کەسێکدا لەسەر مەڕێك دەوترێت داوەریان بکەن بەوەی کە خوا دایبەزاندووە وازی لێبهێنن ولەسەر چ بیرو باوەڕێکە بێ هاوبەشدارنەریش بێت، ئەوە دروست نییە، ناگزنجێت تەنها بەوە نەبێت کە داد وەری بەوە بکرێت کە خوا دایبەزاندووە لە پێش هەموو شتێکدا لە بیرو باوەڕدا.

---

[1] اخرجه البخاري (١٤٥٨)، و مسلم (١٩) من حديث ابن عباس رضي الله عنهما.

وە هەروەها داوەری لە ناوە جوانەکانیو سیفەتە بەرزەکانی خوای گەورە داوەری دەکات لەسەر (جەهمییەکانو موعتەزیلەکانو ماتوریدییەکانو خەواریجییەکانو مورجیئەکان)بەوەی کە خوا دایبەزاندووە، وە ڕوونبکرێتەوە کە بیرو بۆچوونەکانیان وە هەرچی سەبارەت بە یەکتایی کردنی خوایە لە پەروەردگاریەتیدا هیچ کێشەو ناکۆکییەکی لەسەر نییە، بەڵام کە بوترێ واز لە خەڵکی بێنن لەسەر چ بیرو باوەڕێکن ئەوە کارێکی بەتاڵو نا پەسەندە، ئەوە بە پێچەوانەی هەموو بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێت بە گشتی پێغەمبەرمان محمد ﷺ بە تایبەت.

وە ناوە جوانەکانو سیفەتە بەرزەکان کێشەو ناکۆکی لەسەر دروست بووە لە نێوان کۆمەڵەکا ندا لە نێوان کۆمەڵی سوننەو کۆمەڵی جەهمییەکانو موعتەزیلەکانو ئەشعەریەکانو ماتوریدییەکان، گومانیشی تێدا نییە کە دەبێت ئەو ناکۆکییەی نێوان ئەم کۆمەڵانە چارەسەر بکرێت کە ڕووی داوە لە نێوانیاندا بەوە کە بگەڕێنرێتەوە بۆلای قورئانو دادوەری بەوە بکرێت کە خوای گەورە دایبەزاندووە، وە ڕوونیش بکرێتەوە کە کێ ڕاستەو کێ هەڵەیە، و خەڵکیش واز لێ ناهێنرێ بە بێ ڕوونکردنەوەی هەقو بە بێ داوەری نیوانیان و حوکمی خوای گەورەش گشتگیرە لە بیرو باوەڕو لە هەموو شتێکی تریشدا.و هەروەها نابێت بە بێ داوەری شەریعەت لە پەرستنو بەندایەتیکردنەکاندا، لەبەر ئەوەی چەندین پەرستن هەیە کە لەسەر قورئانو سوننەت بەڕێوە دەچێت، وە چەندان پەرستنیش هەیە کە داهێنراون تازەن هیچ بنەمایەکی لە قورئانو سوننەتدا نییە، ئەمەش داهێنراوەو پێویستە بەتاڵیەتیو پوچییەتی ڕوونبکرێتەوە، وە بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە بە شێوەیەکی فروان باسی کردووە فەرموویەتی: (من عمل عملا ليس علية امرنا فهو رد)[1] و قال ﷺ ((إيَّاكُم وَ مُحْدثاتِ الأمُورْ فإنَ كُلُ مُحْدَثٍ بِدْعَة و كُلَ بِدْعَةٍ ضَلالَةً))[2].

---

١ تقدم تخيرجه.

٢تقدم تخيرجه.

واتـە: (هەرکەسـێك کارێـك بکـات فـەرمانی ئێمـەی لەسـەر نـەبێت ئـەوە بـۆ خـۆی دەگەڕێتەوەو وەرنەگیراوە) وە فەرموویەتی: ( ئامان ئاگاداری شتە تازەکان بن چونکە هەموویان تازەیەك داهێنراوەو وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە)

گومانی تێدا نییە کە دەبێت داوەری خوا جێبەجێ بکرێت لە پەرستندا، وە هەرچـی لەگـەڵ قورئـانو سـوننەتدا یـەکی گرتـەوە ئـەوە راسـتو دروسـتە وە هەرچـییەکیش پێچەوانەی قوئانو سوننەت بوو ئەوە پوچەو بەتاڵەو دروسـتیش نییـە ئاسـانکاری لـەو کارەداو چاو لێ نوقاندن لێی، بوترێ واز لە خەڵکی بێنن راویان مەنێن.

دەڵێین: ئێمە کەس راونانێین خێرو چاکەمان دەوێت بۆ خەڵکی، وە دەمانـەوێت کـە بگەڕێنەوە بۆ سەر رێگەی راستو بۆلای هەق، وە هەر ئەوەش چاکترە بۆیان لە دونیاو لە دوارۆژدا، وە هەر ئەوەش کۆبوونەوەی راستو دروستە، بەڵام ئەگەر وازمان لێهێنان لەسەر ئەوەی کە لە داهێنراو هاوبەش دانانو پەکخستنی نـاو سـیفەتەکانی خـوا ئـەوە خەڵەتاندنی نەتەوەی ئیسلامە، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (الدين النـصيحة) قلنـا لمن يارسول الله قال (لله، و لكتابه، و لرسوله، وللائمة المسلمين و عامتهم)[١]

واتە: ( ئاین ئامۆژکارییە، وتمان بۆکێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموی: بۆ خـوا، ((واتـە ئـاین فێرمـان دەکـات کـە چـۆن خـوا بناسـینو بـی پەرسـتینو هاوبەشـی بـۆ دانەنێین، چونکە ئەگەر ئاین نەبێت ئەوا ئێمە ئەو شتانە ناناسین، و دەکەوینـە هەڵـەی گەورە گەورەوە.. وەرگێڕ)) بۆ زیاتر شارەزابوون دەتوانن تەماشای پـەرتوکی ((جـامع العلوم و الحكم))لاپەڕە (٢١٩- ٢٢٠) زانای پایە بەرز ئیبنو رەجەبی حەنبەلی بکـەن إن شاالله).

---

١اخرجه مسلم (٩٥)، و ابو داود، (٤٩٤٤)، من حديث ابي رقية تميم بن اوس الداري رضي الله عنه.

بۆ قورئانەكەی وە بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، وەبۆ پێشەوایانی موسوڵمانان وە بۆ ئەو خەڵكە گشتییە سادەیەی كە لەو شوێنەدا دەژین)

وە هەروەها خوای گەورە بە دادوەر دانان لە فەرمانكردن بە چاكەو ڕێگری كردن لە خراپە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە فەرمانی بە گوێڕایەڵی كردنی كردووەو قەدەغەو ڕێگری لەسەر پێچی كردووە، وە خەڵكیش وازی لێبهێنریێو قەدەغەی هیچیان لەسەر نەكرێت، وە فەرمانیان پێ نەكرێتو قەدەغەشیان نەكردرێت ئائەوە پەكخستی حوكمو فەرمانی خوای گەورەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع بقلبه وذلك اضعف الايمان)[1].

واتە: (هەركەسێك لە ئێوە خراپەیەك دەبینێ ئەوا بە دەست با بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتەوانی بیگۆڕێ ئەوە بە زمانی هەوڵی گۆڕانی بدات، ئەگەر نەیتوانی بە زمانیش ئەوا بە دڵ پێی ناخۆش بێت، ئەوە لاواز ترین باوەڕە كە یەكێ هەیبێت).

وە داوەریو بڕیاری خوا هەروەها دێت لەو كارانەی كە سەرپێچین كە ئەوانە نەهاوبەش دانانو نەبێ باوەڕییە، وە دەشێت فەرمانی خوای لەسە روون بكرێتەوە، وە كامەش گوێڕایەڵیو كامەش سەرپێچییە دەبێت روونی بكاتەوە، وە كامەش چاكەیەو كامەش خراپەیە، وە پەیوەستیش دەبێت بەوەوە، دەستی سەرپێچی كار دەگرێ تا كۆمەڵگە پارێزراو دەبێت لە تیاچوون، بەڵام ئەگەر كاری فەرمان بە چاكەو ڕێگری لە خراپە وازی لێهێنرا ئەوە هۆكارە بۆ تیاچوونی كۆمەڵگە بەگشتی چاكو خراپی خەڵكی ئەگەر خراپەیان بینی نەیانگۆڕی دوور نییە كە خوای گەورە سزای هەموویان بدات، بە سزایەك لای خۆیەوە، (خوای گەورە پەنامان بدات لە تیاچوونو ڕزگارمان بكات).

---

١اخرجه مسلم(٧٨)، الترمذي (٢١٧٢)، و النسائي (٥٠٠٨) و بان ماجة (١٢٧٥) من حديث ابي سعيدالخدري رضي الله عنه.

وە داوەری بەوەی كە خوا دایبەزاندووەو گشتییەو تایبەت نییە بە بابەتەكانی بەربەرەكانێ‌و كێشەكانی لە ماڵ‌و دارایدا بەس هەروەكو خەڵكی وا گومان دەبەن، بەڵام كاروباری بیروبڕوا وازی لێدێنن، هەموو كەسێ ئەوەی دەیەوێ هەڵیدەبژێرێ‌و دەشمێنێتەوە لەسەر ئەوەی كە دەیەوێت، ئەوە كارێكی گەورەو زۆر ترسناكە، جا داوەری بەحكومی خوا گشتگیرە بۆ هەموو ئەم شتانەو ئەوەی لەمانە زۆرترە و هەموو كارو بارێكی دەگرێتەوە.

وە پێویستە لەسەر فەرمانڕەوایان كە داوەری بەوە بكەن كە خوا دایبەزاندووە وە ئەوەش لە كارەكانیانە، وە هەروەها خەڵكیش پەیوەست بكەن بە حوكمی خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ ﴾[١]

واتە: (بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدا كە هەموو ئەمانەت‌و سپاردەیەك بدەنەوە دەست خاوەنەكەی‌و هەركات دادگای نێوان خەڵك دەكەن، بە دادگەرانەوە یەكسانی داوەری بكەن واتە بەلای هیچ كەسێكدا دامەبڕن، بەراستی خوای بە هەق بە جوانترین شێوەو بە شێوازێكی زۆر چاك ئامۆژگاریتان دەكات، كەوابوو ئێوە ئەو سپاردانەی لە لاتانە بیدەنەوە بە خاوەنەكانیان‌و هەموو كاتێكیش بە داد گەرانە بڕیار بدەن، بێگومان خوا هەمیشە بیسەرە بۆ هەموو شتێ‌و بینایە بۆ دیارو نادیار).

ئەم ئایەتە دەربارەی دەسەڵات داران وە لەبارەی ژێر دەستانەوە ئایەتی دوای ئەم ئایەتە راستەوخۆ كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ

---

[١] النساء: ٥٨

ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾[1]

واتە: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەر بن ﷺ ( لە هەمو كارو بارێكدا وە بەر فەرمانی كاربەدەستان‌و كارسازانی خۆتان بن، واتە بە قسەی ئەو كاربەدەست‌و زانایانە بكەن كە لە خۆتان بن، واتە لە چوار چێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن، ئینجا لە شتێكدا كێشەو ناكۆكیتان بوو جا بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ﷺ واتە بە تەنها قورئان‌و سوننەت حاكم‌و دادوەرتان بن، ئەو گێڕانەوەی كێشەو هەرایە بۆی لای قورئان‌و سوننەت جوانترو چاكترە بۆتان، چاكترین ڕەفتاریشە بۆ داهاتووتان). ئەمەش دەربارەی ژێر دەستان كە پێویستە لەسەریان، كە دادوەریان بەرنە لای قورئانەكەی خواو سونەتەكەی پێغەمبەر ﷺ، جا پێویستە لەسەر فەرمان ڕەوایان كە داوەری بە شەریعەتەكەی خوا بكەن، وە پێویستە لەسەر خەڵكی كە كێشەو ناكۆكییەكانیان لە هەموو كاروبارێكیان بگێڕنەوە بۆلای شەریعەتی خوا دروست نییە بیگێڕنەوە بۆلای تاغوت و یاسا دەستكردەكان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴿٦١﴾[2]

---

[1] النساء: ٥٩

[2] النساء: ٦٠ ـ ٦١

واتە: (ئەرێ ئەوانەتان دیوە وا دەڵێن باوەڕیان بەو بەرنامەو قورئانەیە دابەزێنراوە بۆتو بەو پەیامەش پێش تۆ دابەزێنراوە باوەڕ دەکەن، دە یانەوێ بۆ بڕینەوەی داواو کێشەکانیان بچنە لای تاغوتو بەرنامە شەیتانەییەکان، ؟! لە کاتێکدا فەرمانیان پێ درابوو بەو بەرنامە شەیتانیانە باوەڕ نەکەنو کار نەکەن، وە شەیتانیش دەیەوێ گومڕایان بکات، بە گومڕا کردنێکی یەکجار دوورو بێ سنور، بۆیە ئاوا سەر بۆ بەرنامە دونیاییەکان شۆڕ دەکەن کاتێکیش بەو دوو ڕوانە بگوترێ: وەرنە لای ئەم بەرنامەو شەریعەتە خوا دایبەزاندووە وەرنە لای ئەم پێغەمبەری خوایە ﷺ تا کێشەکانتان بۆ ببڕێنێتەوە، دەبینی دووڕووەکان بە توندنی ڕووت لێوەردەگێڕن قەتیش بەو بەرنامەو بڕیارەی تۆ ڕازی نابن).

وە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە کە زانراوە ئەوەیە کە کێشەیەك لە نێوان پیاوێ لە دووڕووەکان لەوانەی گومانیان دەبرد کە موسوڵمانانو پیاوێکی جولەکە، کابرای جولەکە وتی: کێشەکەمان دەبەینە لای محمد ﷺ وە لە کاتێکدا دەشیزانی کە محمد ﷺ بەرتیل وەناگرێ دوو ڕووەکە وتی نەخێر کێشەمان دەبەینە لای (کەعبی کوڕی ئەشرەفی) گەورەی جولەکە، لەبەر ئەوەی ئەو بەرتیل وەرئەگرێ، لەگەڵ ئەوەش وا گومانی دەبرد کە ئەم کابرایە ئیمان دارە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى الطَّٰغُوتِ﴾[1]

---

١ النساء: ٦٠

ماناکەی لە پێشەوە کردومانەتەوە ئەو تاغوتە کە کەعبی کوڕی ئەشرەف[1] بوو وە جگە لەویش کە داوەری بەوە دەکەن کە لە لایەن جگە لە خواوەیە، جا هەرکەسێ داوەری بکات بە هەرشتێ کە جگە لەوەیە کە لە لایەن خواوە دابەزیوەتە خوارەوە بە ئەنقەست ئەوە ئەو کەسە تاغوتە، تاغوتیش لە سەرکەشیو ستەمکارییەوە هاتووە کە ئەویش دەرچوونە لە هەقو راستی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴿٦١﴾﴾[2] تا ئەو شوێنەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ﴾[3]

واتە: (سوێند بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر ﷺ نابنە باوەڕدار تا بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ دەکەنە داوەر).

---

١ اخرجه ابن جرير (١٨٥/٥)و ابن ابي حاتم (٩٩٣/٣) بە ژمارة (٥٥٤٨)و (٥٥٤٩)من مراسيل الشعبي و السدي والمجاهد، وقد اخرجه الطبراني في المعجم الكبير (١٢٠٥٤) و ابن ابي حاتم في تفسيره (٥٥٤٧)و صححه الشيخ احمد شاكر في اختصار ابن كثير (٥٣٢/١): "و رجاله رجال الصحيح" عن ابن عباس رضي الله عنهما قال : "كان ابو برزة الاسلمي كاهنا قضي بين اليهود فيها يتنافورن فيه، تنافر اليه ناس من المسلمين فانزل الله عز وجل (الم تر الى اللذين يزعمون)الى قوله (ان ارادنا الا احسانا وتوفيقا) وهذا اصح من الاول شواهده فلا مانع من تعدد اسباب النزول للاية كما هو مقرر في اصول التفسير.

٢ النساء: ٦٠ – ٦١

٣ النساء: ٦٥

جا دەبێت پێغەمبەر ﷺ بکەنە داوەر تا لە ژیاندا ماوەو پاش خۆشی ئەوەی هێناویەتی لە قورئانو سونەت بکەنە داوەر لە داوای مردنی دوای ئەوە دەفەرموێت: ((هەمان ئایەت)).

واتە: (ئەوساش بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە هیچ تەنگیان دەست نەکەوێت لە دەرونیاندا وە بەچاکیش تەسلیمو مل کەچ ببن)

جا بۆیە پێویستەلەسەر فەرمانڕەوایانو ژێر دەستان کە داوەری بکەنو کێشەو گرفتەکانیشیان بگێڕنەوە بۆ لای شەرعەکەی خوای پاکو بێ گەردو بالاّ، وە هیچکات نەیگۆڕنەوە بە جگە لەو، وە فەرمانڕەوایش نەڵێت: ئێمە لە دەوڵەتە گەورەکان دەترسینو ئەو شتەش دەسەپێنن بە سەرماندا، وە هیچکات دروست نییە بۆیان چونکە ئەوان موسوڵمانن، پێویستە لەسەریان کە پابەندی ئیسلام بن، هەر لەلای ئەو دەوڵەتانەی هەیە لە کلتوری نێو دەوڵەتیو یاسا باوەکانی نێوانیان کە هیچ دەوڵەتێك دەست وەرنەداتە کاروباری دەوڵەتێکی تر لە کارو بارە رامیارییە ناوخۆییەکاندا، وە هەر بە بڕیارەکانی خۆیانە، وەهەرچی سەبارەت بە بڕیارو حوکمی خوایە ئەوەیە کە گوێڕایەڵی هیچ کەسێك ناکرێت لە سەرپێچی دروستکراو بەدیهێنەردا، بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە بۆلای رژێمو رێڕەوەکانیان دەبینین کە دروست نییە لایان دەوڵەتێ دەست وەرداتە رژێمو پەیڕەوی وڵاتێکی تر لە کارو باری ناوخۆیدا، جا چۆن ئەوانە دەڵێن: ئێمە سەپێنراوە بەسەرماندا؟ ئەوە هیچ دروست نییە بۆ فەرمان رەوای موسوڵمانان کە ملکەچی جگە لە حوکمی خوای پاكو بەرزو بێگەرد ببێت، خوای بەرزو بەڕێز بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ﴾[1]

---

[1] المائدة: ٤٩

واتە: (دیسان دەبێت هەر بەو بەرنامە لە ناو جولەکەو گاورو خەڵکانی تریشدا حوکمو بڕیار بدەیت کە خوا ناردوویەتی، نابێ شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان بکەوی‌و چەواشەت بکەن، لەو ڕێنمایانەی خوا بۆی ناردووی لا ڕێت نەکەن) ئەو گوتارە هەموو فەرمانڕەوایەك لە فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان دەگرێتەوە لە دوای پێغەمبەر ﷺ .

جا بابەتی داوەری بەوەی خوا دایبەزاندووە بابەتێکی گەورەیەو درێژە پێدان‌و فراوانی تێدایە هەروەك‌و ڕاڤەکارانی قورئان باسیان کردووە، حوکمی بێ باوەڕی نادرێ بەسەر هەر کەسێکدا کە داوەری بەوە نەکرد لە لایەن خواوە دابەزیوە، بەڵکو دەبێت بە فراوانی سەیر بکرێت لە نێوان کەسێکدا وادەیبینێ حوکمی جگە لە خوا باشترە لە حوکمی خوا، یان یەکسانە بە حوکمی خوا یان سەرپشکە لە وەرگرتنی‌و کار پێکردنی یان بە پێچەوانەوە، ئەوە حوکم دەدرێت بەسەریداو بەوەی کە بێ باوەڕەو لە کۆمەڵی موسوڵمانان چۆتە دەرەوە، بەڵام کەسێك وا دەبینێ کە حوکمی خوا پێویستە پەیوەست بوون پێوەیی‌و هەر ئەویش هەقە بەڵام سەرپێچی کرد لەبەر ئارەزوویەك یان بەرتیلێك یان چاوچنۆکییەکی دونیایی وایلێکرد، ئەوە حوکم دەدەرێت بەسەریدا بە (بێ باوەڕی جگە لە بێ باوەڕی) وە ئەوە لە سنور دەرچوونەو خوای گەورەش دەوفەموێت: ﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤٧ ﴾[1]

واتە: (ئەو کەسانەش بەو بەرنامەی خوا ناردویەتی بڕیارو حوکم نەدەن دیارە یاخی‌و ناپاك‌و لە سنور دەرچوون)

---

[1] المائدة: ٤٧

حوکم دەدرێت بەسەریدا بە لە سنور دەرچوو یان ئیمان لاوازی، ئەوەش هەڵوەشێنەرەوەی چوارەمە لە هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام، کە زانانی پایە بەرز محمد بن عبدالوهاب باسی کردووە رەحمەتی خوای لێبێ، بابەتێکی گەورەو گرنگ لە خۆ دەگرێت کە کێشەی ئەم سەردەمەی ئێستایە، داوا لە خوای بەرزو بەڕێز دەکەین کە یارمەتی کار بەدەستانی موسوڵمانان بدات بۆ کارکردن بەوەی کە خۆی دایبەزاندووە، یارمەتی سەپێچی کارانی ئەو کارەش بدات فەرمانڕەوایەتی بەوە بکەن خوا دایبەزاندووە، وە بەوەی بگەڕێنەوە بۆ هەقو راستی.




پرسیار: حوکمی کەسێ چییە کە دەڵێ: ئێمە شارەزاترین لە پێغەمبەرﷺ بە بەرژەوەندییەکانی بانگەواز؟

وەڵام: ئەوە قسەیەکی پوچو بێ باوەڕییە، ئەوەش نەزان دانانی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوە دەچێتە بەشی یەکەمی قسەکەی زانای پایە بەرز کە دەفەرموێ: (هەرکەسێ باوەڕی وابوو کە ڕێنموویی جگە لە پێغەمبەر ﷺ تەواو ترە لە ڕێنمویی ئەو، ئەوە بێ باوەڕە).

پرسیار: گوتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾[1]

واتە: (سوێندبێ بەپەروەردگارت ئەی پێغەمبەر ﷺ نا بنە باوەڕدار تا بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ نەکەنە داوەر).

پرسیار: نەهێشتنی باوەڕ لەم ئایەتەدا ئایا بەڵگە نییە لەسەر بێ باوەڕی بە هەردوو جۆرەکەیەوە بە بێ لێدەرکردن ئیتر باوەڕی وابێت یان باوەڕی وا نەبیت؟

وەڵام: دەگونجێت پۆزشێك هەبێت وە لەبنچینەدا وایە ئەوانە باوەڕ ناهێنن تا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان پێغەمبەر ﷺ نەکەنە داوەر، بەڵام دەشگونجێت چەند شتێك هەبێت کە بێ باوەڕییان لێ دور بخاتەوە هەروەکو ئەوەی زانایان درێژەیان پێداوە.

[1] النساء: ٦٥

# وانەی شەشەم لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەری پێنجەم

**زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت: ((هەركەسێك شتێكی پێناخۆشبێت لەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی با كردەوەشی پێبكات ئەوە بێ باوەڕە))**

## (ڕاڤە)

((هەركەسێك شتێكی پێناخۆشبێت یان ڕقی لێی بێتەوە لەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی با كردەوەشی پێبكات ئەوە بێ باوەڕە)) بەڵگەش فەرمودەی خوای گەورەیە كە دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٩﴾ ﴾[1] واتە: (ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە بەڕاستی ئەوان ڕقیان لەو پەیامە دەبووەوە خودا دایبەزاندووە جا خواش كارەكانیانی بێئاكام كردووە).

(حبوط) لە بنەڕەتدا بریتیە لە ئاوسان و باكردنی سكی ئاژەڵێك بەهۆی جۆرە گیایەكەوە كە دەیخوات سەرەنجام ئەیكوژێت و تیا ئەچێت هەر بەو شێوەیەش كاری بێبڕواكان زۆر گەورە ئەبێ تا خوای گەورە پوچەڵی ئەكاتەوەو سودی نامێنێت بۆیان))

واتە پوچی كردەوە، بەڵگە لەسەر ئەوەی كە ڕق لێبونی شتێك لەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام و كردەوەش پوچەڵ دەكاتەوە، وە ئەوەش كە بنچینەی باوەڕو پایەكانی: باوەڕبوونە بەخواو بە فریشتەكانی و پەرتووكەكانی و بە

---

[1] محمد: ٩

پەیام بەرەکانی و بە ڕۆژی دوای و قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕیەوە جا هەرکەسێ یەکێك لەوانە کەم بکاتەوە و باوەڕی پێی نەبێت ئەوە باوەڕدار نیە، وە مەبەستیش بەفەرمودەی خوای گەورە قورئان و سونەتیش کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی دەگرێتەوە.ئەوەی کە خوا دایبەزاندووە دوو بەشە:

**بەشی یەکەم**: قورئانە کە ئەویش سروشی یەکەمەو سەرچاوەی یەکەمە لەسەرچاوەکانی ئیسلام.

**بەشی دووەم**: سوننەتە کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی لەبەر ئەوەی ئەویش سروشە لەلایەن خوای بەرزو بەڕێزەوە، وەخوای بەرزو بەڕێز دەربارەی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾[1] واتە: (قسەو گوفتاری ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە هەواو ئارەزوی خۆیەوە نیە بەڵکو ئەوەی ڕایدەگەیەنێت وەحی و نیگای خواییە).

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ﴾[2]

واتە: (وە هەرچی پێغەمبەر ﷺ پێیدان وەری بگرن، هەر فەرمانێکی بەسەردا دان بەگوێی بکەن، وە قەدەغەی هەرشتێکیشی لێکردن مەیکەن و وازی لێبێنن).

جا سوننەت سروشی دووەمەو سەرچاوەی دووەمە لە سەرچاوەکانی ئیسلام.

جا خۆشەویستی خواو خۆشەویستی ئەوەی دایبەزاندووە گەورەترین جۆرەکانی پەرستنە، پاشان خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ وسوننەتەکەی جا خۆشەویستی خواو

[1] النجم: ٣ – ٤

[2] الحشر: ٧

خۆشەویستی پێغەمبەرە کەی ﷺ وا دەخوازن کە هەرچی لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ هاتوە خۆشت بوێت، وە ڕق لێبونەوە لەشتێك لەوەی کە لە لایەن خواوە یان لەلایەن پێغەمبەر ﷺ هاتبێت ڕق لێبونەوە لەخوا یان ڕق لێبونەوە لە پێغەمبەر ﷺ دەخوازێ کە ئەوەش هەڵگەڕانەوەو بێباوەڕیە بەرامبەر بە خوای بەرزو بەڕێز.

جا ئەوەی پێویستە لەسەر موسوڵمان ئەوەیە کە هەرچی لەلایەن خواو لە قورئان و هەرچیش لەلایەن پێغەمبەر ﷺ لەسوننەت هاتبێت خۆشت بوێت شوێن کەوتنی بۆ خۆشەویستەکەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ وە خۆشەویستی ئەو ئاینە جا ئەگەر رقی لەشتێك بوەوە لەوانە ئەوە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی باوەڕەکەی وە گوتەی ((با کردەوەشی پێبکات)) بەوە نابێتە باوەڕدار دوو ڕوەکان لەکاتێکدا ڕقیان لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺدەبووەوە، ڕقیان لە سروشتی دابەزیو دەبووەوەنەیان دەویست هەروەك و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ ﴾[1]

واتە: (کاتێکیش بەو دوو ڕوانە بگوترێت وەرنە لای ئەم بەرنامەو شەریعەتەی خوا دایبەزاندووە، وەرنە لای ئەم پەیامبەرەی خوا تا کێشەکانتان بۆ ببڕێنێتەوە، کەچی دوو ڕوەکان دەبینی بە توندی ڕوت لێ وەردەگێڕن و قەتیش بەو بەرنامەو بڕیارەی تۆ ڕازی نابن) بۆچی دەبنە ڕێگر ؟ لەبەرئەوەی ڕقیان لە قورئان و سوننەتە با کردەوەشی پێبکەن لەڕوکەشدا بەلام لە دڵەکانیاندا ڕقیان لێی دەبێتەوە و کردەوەکانیان لە ڕوکەشدا هیچ سودێك ناگەیەنێت لەبەرئەوەی ئەو کردەوە ڕوکەشانەیان بۆ خۆپاراستنیان وەکو قەڵغان بەکار دێنن، وەگەرنا ئەوانە لە بڕیاری

---

[1] النساء: ٦١

دەرونیاندا ڕقیان لە قورئـان و سـوننەتە وە لەبـەر ئـەوەش خـوا حـوکمی داوە بـە بـێ باوەڕییان وە ئەوانە لەبنەوەی ئاگری دۆزەخدان، لەگەڵ ئەوەی ئەوانـە کردەوەدەکـەن لە ڕوکەشدا بە قورئان و سونەت بەڵام لەبەرئەوەی لە دڵەکانـەوە ڕقیـان لێـی بـووەوە بونە بێ باوەڕ خراپترین بێبـاوەڕی و سزاکەشـیان خـراپترین سـزا، ئەوانـە لـە بنـەوەی ئاگری دۆزەخدان.

بەڵام ئەوانەی هەر لە بنەڕەتەوە بێ باوەڕن: ئەوانە لەبنەڕەتدا ڕقیان لەهەموو پەیامەکان و پەرتوکەکانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾﴾[1]

واتە: (هەرکات پێشیان بگوترێ گشت وەرن بۆلای ئـەو کتێبـەی خـوا ناردویـەتی و وەرن بەرەو فەرمانی پێغەمبەری ئەو ﷺ هەتا ڕێتان بۆ ڕون بێتەوە ئـەڵێن ئێمـە هـەر ئەو ئاینەمان بەسە کە لە باو باپیرانمانەوە دەستمان کەوتووە، وە هـەر تـەنها لـەویش پەیڕەوی ئەکەین، کە باو باپیرانیشیان هیچیان نەزانیوە و ڕێیان دەر نـەکردووە، ئـاخۆ هەر دوایان بکەون ).

ووتیـان بەسمانـە ئـەوەی کـە بـاو باپیرانمـانی لەسـەر بـووە لـە خـو نەریتـەکان و یاساکانی سەردەمی نەزانی، وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾﴾[2]

---

[1] المائدة: ١٠٤

[2] البقرة: ١٧٠

واتە: (هەر کە بە پەیڕەوانی شەیتان بوترێ، هەر پەیڕەوی قورئان و ئەو بەرنامەیە بکەن کە خوا ناردویەتی و هەرگیز بەقسەی شەیتان نەکەن، پاساو دێننەوەو دەڵێن: ئێمە هەر لەوە پەیڕەوی دەکەین کە باو باپیرانمان لەسەری بوونو پەیڕەویان کردووە، ئەگەرچی باو باپیرانیشیان هیچیان لە ڕاستەڕێ نەزانیبێ و ڕێنما نەبووبن ؟ ئەوان هەر شوێنیان دەکەون).

**جا ئەوانەی ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە لەلایەن خوا دابەزیوە دەبنە دوو دەستە**

دەستەی یەکەم: ئەوانەی هەر لەبنەڕەتدا بێ باوەڕن، وە ئەمەش قسەیان بووە.

دەستەی دووەم: ئەوانەی بانگەشەی ئیسلام دەکەن، بەلام ئەوان دوو ڕوون وە قسەی ئەم دەستەیە لە پێشەوە خرا پێش چاوو ڕون بوویەوە.

بەڵام باوەڕدارانی ڕاستەقینە: ئەوانە هەرشتێك لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بێت خۆشیان دەوێت، لەبەر ئەوەشە خوای گەورەلەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾[1]

واتە: (بەلام وتەو گوفتاری باوەڕدارەکانیش کاتێك بانگ دەکرێن بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆئەوەی لەنێوانیاندا داد وەری بکات هەرئەمەیە کە دەڵێن ئەوا بیستمان و گوێڕایەلیشین، ئائەوانە کە بۆ ڕەزامەندی خوا پەلەدەکەن سەرفرازی ڕاستەقینەی دونیاو قیامەتن).

---

[1] النور: ٥١

دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵین لەبەرئەوەی ئەوان خۆشیان دەوێت هەرچیەك لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوەبێت ﷺ وە هیچ تەنگیەکیش نابینن لەدەرونیاندا لە حوکمی خواو حوکمی پێغەمبەرەکەی ﷺ هەروەك خوا دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾[1]

واتە: (سوێندبێت بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر ﷺ نابنە باوەڕدار تا بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکانیان تۆ دەکەنە دادوەر، ئەوساش بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە هیچ تەنگیەکیان دەست ناکەوێ لەدەرونیاندا، وە بە چاکیش تەسلیم و ملکەچ ببن).

واتە هیچ تەنگیەك لە دەرونیان و دڵیاندا نابێت، هەربەوە واز ناهێنن کەوا خۆیان نیشان بدەن لە ڕوکەشدا مل کەچن بەڵکو لەناخ و ئاشکراشدا هەرمل کەچن، وە هەروەها دادوەری خواو دادوەری پێغەمبەری خوایان ﷺ خۆش دەوێت لە نهێنی و ئاشکراو ناخیشیاندا.

((پاشان نابینن لە دەرونیاندا هیچ تەنگیەك بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە و بە چاکیش تەسلیم و ملکەچ دەبن)) هیچ کاتێك ڕەخنە ناگرن لە حوکم و دادوەری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەبەر ئەوە ئەوان دەزانن کە ئەوە حەق و داد گەریە، وە دوارۆژەکەشی خۆش و دڵ خۆشیە ئەوانە هیچ شتێك پێش ناخەن بەسەر دادوەری خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ ئەگەر ئەو حوکمە پێچەوانەی هەواو ئارەزوو ویستەکانیشیان بێت، ئەو باوەڕ دارانە واز لە بۆچونەکانیان و ویستەکانیان دەهێنن

[1] النساء: ٦٥

حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ وەردەگرن لەبەر ئەوەی ئەوان دەزانن کە چەندەها خێرو چاکەی تێدایە بۆ ئێستاو داهاتویان، ئەوانە ئەو باوەڕ دارانەن کە ئەگەر حوکمی خواو پێغەمبەریان ﷺپێبگات، ئەوانە لەجیاتی قورئان و سونەت هیچ جێگرێکیان ناوێ جێیان بگرێتەوە، وە هیچ شتێکیش نادەن بەسەر قورئان و سوننەتدا هیچ سەرچاوەیەك یان هیچ حوکمێك، ئەمە سیفەتی باوەڕ دارانە، وە هەر لەبەر ئەوەشە دەیانبینی سوورن و دەست پێشخەرن بۆ فێربوونی قورئان و سوننەت و هەموو ئازار و نارەحەتیەکیش دەکێشن لەپێناویدا لەبەرئەوەی قورئان و سونەتیان خۆش دەوێت، دڵیان پەیوەستی قورئان و سوننەتەو خۆشیاندەوێت تامەزرۆی قورئان و سوننەتن زیاتر لەوەی تامەزرۆی خواردن و خواردنەوەن لەبەر ئەو هەموو خۆشەویستیەی کە لەدڵیاندایە بۆ قورئان و سونەتەکەی خواو سونەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێچەوانەی دوو ڕووەکانەوە کە ئەوان ڕادەکەن لە قورئان و سوننەت و فێربونیان، یان هەر قورئان بە زمانیان دەخوێننەوەو بەس وە هەڵدێن لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ۝٥﴾[1]

واتە: (کاتێ پێیان بگوترێ: وەرن بۆلای پەیامبەری خواو داوای لێبوردنتان بۆ بکات سەریان با ئەدەن و گاڵتەیان لێ دێ: وەدەیان بینی پشت هەڵدەکەن و خۆیان بەگەورە دەزانن بێنە لای پێغەمبەرﷺئەمە نیشانەیە لەسەر ئەوەی ئەوان ڕقیان لە قورئانەکەی خواو سونەتەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ).

---

[1] المنافقون: ٥

وە هــەروەك و باسمــانکرد هــیچ جیاوازیــەك نیــە لــە نێــوان قورئانەکــەی خــواو سونەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرئەوەی هەردووکیان هەر لای خواوەن، وە تــەنها ئەوانە جیاوازی دەخەنە نێوان قورئـان و سـونەتەوە کـە گـومڕان، ئەوانـەی کـە دەڵـێن جگــە لــە قورئــان هیــچیکە وەرنــاگرین لەبەرئــەوەی قورئــان لــەکاتی گواســتنەوەو گێڕانەوەیـدا پـێ دەچـێ و دەشـێ وگومـان هـەڵناگرێ بـە پێـچەوانەی سـوننەتەوە کـە لەزنجیرەی گێڕانەوەکەیدا گومان لای ئەوان دروسـت دەکـات و گومـان هـەڵگرە، بـەلاَم لەلای موسـوڵمانان بـەهیچ شـێوەیەك گومـان هـەڵگر نیـە، لەبەرئـەوەی لـە گێڕانـەوەی کەسـانێکی متمانـە پێکـراو جـێگیرە لـە قـسەو ڕاسـتگۆیەتیدا بـەهێز لەبەرکردنـدا، گواسـتویانەتەوە بەوپـەڕی ئەمانەتـەوە، موسـوڵمانان گومــان لــە فــەرمودەکانی پێغەمبەری خوا ناکەن ﷺ وە ئەو فەرمودانە لە لایەن خوای بەرزو بەرێزەوەیە، بـەلاَم خەڵکانی کۆمەڵی گومڕایی وە ئەوانەش لەدڵیاندا کـەموکورتی هەیـە وەکـو خـەواریج و موعتزیلە و پاشماوەی کۆمەڵەکانی تـریش، ئەوانـە هـەموویان گومانیـان لـە سـوننەتدا هەیە هەندێکیان گومانیـان لـەو فەرموودانەداهەیـە کەتـەنها کەسێك دەیگێڕێتـەوە، وە هەندێکیان لە هەموو سوننەت گومانیان هەیە وە هـیچ نـرخ و پێگەیـەکی بـۆ دانـانێن و دەڵـێن قورئـان بەسـە، هەنـدێکیان گومانیـان لـە هەنـدێك سـوننەتدا هەیـە دەڵـێن وەریناگرین مەگەر کۆمەڵێکی زۆر لە هـاوەلاَن فەرموودەکـە بگێڕنـەوە، وە هاوەڵـەکان کەکەسێك دەیگێڕێتەوە ڕەد دەکەنەوە دەڵێن ئەوە گومان دەگەیەنێت، بـەلاَم کۆمـەڵی هەق دەڵێن: هەر فەرموودەیەك جێگیربێت کەڕاسـتەو لەلایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ بێـت ئیتر کۆمەڵێ گێڕابێتیانەوە یان تاکەکەسێ ئەوە ڕاست و دڵنیایی دەگەیەنێ و بەڵگەیـە لە بیرو باوەڕەکان و پەرستنەکان و مامەڵەکاندا لەبەرئەوەی گومانیان تیادا نیە، بـەلاَم کۆمەڵی گومڕایان ئەوانە دەڵـێن کـە هەواڵـەکان کـە تاکـە کەسـێ گێڕابێتیـەوە ناکرێتـە

بەڵگە لە بیرو باوەڕەکاندا، لەبەرئەوەی گومان دەبەخشێ بەگومانی خۆیان وەبیرو باوەڕەکانیش لەسەر دڵنیایی بنیاد دەنریت .

وەئەوەی جیگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کەئەوانە بیر وباوەڕەکانیان لەسەر هەردو زانستی (الکلام والمنطق) بنیاد دەنێن ودەڵێن: ئەوانە دڵنیایی دەبەخشن، بەڵام کەلامی خوا دڵنیایی ناگەیەنێت لای ئەوان، وەسوننەت دڵنیایی ناگەیەنێت لای ئەوان ئەوە گومڕایو دوڕانە .

بەڵام کۆمەڵی سوننەتو حەق دەڵێن: ئەوەی ڕاستە لە پێغەمبەرەوەﷺ ئەوە دڵنیایی و زانست دەبەخشێ و دەکرێنە بەڵگە لەبیرو باوڕەکان و پەرستنەکان و مامەڵە کردنەکاندا هیچ جیاوازیەك نیە لەوەدا ئەمە ڕێگەی کۆمەڵی سوننەت و شوێنکەوتەن .

وە پوختەو ئەنجام ئەوەیە کە هەرکەسێك لە دڵیدا ڕقێك هەبێت بەرامبەر هەرشتێك کە لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ هاتبێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر دوو ڕووی ئەو کەسە وەلەسەر نەبوونی باوەڕی وە ئەگەر بانگەشی بوونی باوەڕیش بکات، وە ئەگەر کاریش بەم فەرموودانە بکات لە ڕووکەشدا، لەبەرئەوەی کە ڕقیلێیەتی لەدڵیەوە ئەوە هەڵوەشێنەرێکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، وە لەم ئایەتەشدا بەڵگەی ئەوەی تیادایە خوای پاك و بێگەرد و بالاّ دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٩﴾﴾[1]

واتە: (وە ئەوانەشی کە بێ باوەڕبوون خوا لەناویان دەبات و کارەکانیشیان پوچەڵ دەکاتەوە واتە پاداشتیان لەسەر ناداتەوە ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە بەڕاستی ئەوان

[1] محمد: ٨ – ٩

ڕقیان لەو پەیامە دەبووەوە خودا دای بەزاندووە جا خواش كارەكانیانی پوچەڵ كردەوەو سودی نابێت بۆیان).

وە لەكۆتای سورەتەكەدا دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾[1]

واتە: (ئەو تۆڵەیەشیان بەوجۆرە بەهۆی ئەوەوەیە كە بەڕاستی شوێنی شتێك كەوتوون خوا تورە دەكات وە لەوەش ڕقیان دەبووەوە كەدەبوە هۆی ڕەزامەندی و خۆشنوودی خوای گەورە، ئینجا خواش كار و كردەوەكانیانی پوچەڵ كردەوە).

ئەوە هۆكارەكەیەتی وە ئەوەش هەڵوەشێنەرێكە لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام كە مرۆڤ شتێكی پێناخۆشبێت بەوەی كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی .

وە گوتەی زانای پایە بەرز ((هەرشتێك)) بەواتای ئەوە كە پێویست نیە كە ڕقی لە هەموو ئەو شتانەبێت كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، بەڵام ئەگەر ڕقی لەشتێك بێتەوە لە سوننەت وەك هەندێك فەرمودەی ڕاستی جێگیرو چەسپاو لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە كردارەكانی پوچەڵ دەبێتەوەو ئیسلامەتیەكەشی هەڵدەوەشێتەوە .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئت به)) .

واتە ((هیچ كام لەئێوە باوەڕدار نین تا ئارەزوەكەی شوێن ئەوەدەكەوێت كە هێناومە)) وە فەرموودەكە پێشەوا نەوەوی بەڕاست و دروستی داناوە لە چل فەرموودەكەدا، وە هەندێك لە زانایانیش قسەیان لەسەر كردووە وەكو حافظ (إبن رحب)[2] ڕەحمەتی خوای لێبێت بەڵام ئەم ئایەتە شاهیدی بۆ دەدات و پاڵپشتیشی

---

١ محمد: ٢٨

٢ تماشای: جمع العلوم والحكم لابن رجب (٢/ ٣٩٣) ط مؤسسة الرسالة.

دەکات کە دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٢٨﴾ ﴾[1]

واتە: (ئەو تۆڵەیەشیان بەو جۆرە بەهۆی ئەوەوەیە کە بەڕاستی شوێنی شتێك کەوتوون خوا توڕەدەکات و لەوەش ڕقیان دەبووەوە کە دەبوە هۆی ڕەزامەندی و خۆشنوودی خوای گەورە، ئینجا خواش کار و کردەوەکانیانی پوچەڵ کردەوە).

هەواو ئارەزوەکانیان شوێن پێغەمبەر ﷺ نەکەوتبوو لەبەر ئەوەش خوای گەورە کردەوەکانیانی پوچەڵ کردنەوە، ئایەتەکە پاڵپشتە بۆ فەرموودەکەوە لەم کاتەی ئێستاماندا زۆرن ئەوانەی ڕقیان لە سوننەتە چەسپاوەکانە کەلە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە ئەگەر پێچەوانەی ئارەزوەکانیان بێت وە ئەوەی ئەوان حەزیان پێیەتی، وە لەوانە بابەتەکانی مامەڵەو کڕین و فرۆشتنە کەلەناو خەڵکیدا بلاو بوەتەوە لەم ڕۆژگارەدا، ئەگەر پێیان بڵێی، ئەوە سودە و خواو پێغەمبەری خوا ﷺ سودیان قەدەغە کردووە دەیانبینی کە ڕقێکی زۆرو بێزاریەك لەلایان دروست دەبێت بەرامبەر ئەوە، ئەگەر بەئاشکرا دەرینەبڕن کە هەندێکیان دەریشی دەبڕن، ڕق و بێزاریان لەوەیەو دەڵێن جیهان هەر هەمووی لەسەر ئەوەیە، ئەوە ئابوری جیهانیە، ئێوە پێچەوانەی جیهان دەکەن، ئائەمە هەڵگەڕانەوەیە لە ئاینی ئیسلام ئەگەر ئەو دەقانەی پێناخۆشبێت کە دەربارەی قەدەغەکردنی سودو قومارو گۆشتی ئاژەڵی سەربڕاو بۆ جگە لە خوا لەو شوێنانەی کە خەڵکی بەپیرۆزی دادەنێن نەك ئاینی ئیسلام، وە کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکان کە پێچەوانەی بەڵگەکانن، جائەگەر لە دەرونیدا پێناخۆشیەکی

---

[1] محمد: ٢٨

بینی سەبارەت بەقەدەغەکردنیان ئەوا خوای گەورە کردەوەکانیان پوچەڵ دەکاتەوە با لەڕوکەشیشدا کاری پێبکات، کارەکە زۆر مەترسیدارەو لەسەر موسوڵمانیش پێویستە کە دەرونی بپشکنێت و زمانی بپارێزێ و لەگەڵ ڕاستیشدا بسوڕێتەوە بۆ هەرکوێ سوڕایەوە، لەگەڵ هەواو ئارەزوویدا نەبێت لەهەرشوێنێکدابێت.

وە لەبارەی کارو باری ئافرەتانەوە: لەکاتێکدا کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەندان ڕێکخەری داناوە بۆ ئافرەت کە پێچەوانەی ئەوەیە کە ئافرەتەکانی نەتەوەکانی بێ باوەڕی و دور لە دینی لەسەرن، وای لێهاتوە کەزۆرێك لەوانەی کە بانگەشەی ئیسلام دەکەن دەڵێن موسوڵمانین ڕقیان لەو یاسا شەرعیانە دەبێتەوە کە پەیوەستە بە ئافرەتانەوە، وە لەوانە بانگکردنیان بۆ یەکسانیکردن لەنێوان ژن و پیاودا، لە میرات بردن و کارەکاندا و لەو شتانەشدا کە کردنیان لە تایبەت مەندی پیاوانە، وە هەرگیز نایانەوێ کە جیاوازی هەبێت لەنێوان ژن و پیاودا، لەبەرئەوەی ڕۆژئاوا ژن و پیاویان یەکسانکردووە یان ژنیان پێش خستووە بەسەر پیاواندا، ئەوانە دەیانەوێ بگەنەوە بە ڕۆژئاوای بێ باوەڕ، وە نایانەوێ کەجیاوازی هەبێت لە ئافرەتاندا لەوشتانەی کە تایبەتە بە ئافرەتان خۆیانەوە، وە نایانەوێت کە میراتەکەی نیوەی میراتی پیاوبێت. وە نایانەوێ کە خوێنەکەی نیوەی خوێنی پیاوبێت، وە نایانەوێت گەواهی دانی نیوەی ئەو گەواهی دانەبێت کە پیاو دەیدات هەروەکو چۆن لەشەرعی پاکراوەدا هاتووە، وە خوای گەورە خۆی ژن و پیاوی دروستکردووە، وە هەرخۆشی زاناترە بەوەی دەگونجێت وە شیاوە بۆ پیاوو ئافرەت .

وە لەو کارانەی تریش ئەو هەڵمەتە قێزەونەیە کە دەکرێتە سەر حیجاب و سەرکۆنەی دەکەن، وە بەبەڵگەی شەرعی حیجاب پێویستبووە لەسەر ئافرەت وە

ئەگەر بتوانن لاوازو لەناوی بەرن لەتێکۆشان ڕانەدەوەستان، بەڵام کەناتوانن ئەو کارەبکەن دەچن لێکدانەوەو ڕاڤەی وای بۆدەکەن کە ڕاڤەو شیکردنەوەی خۆی نیە وە بەگوێرەی مەبەستی خواو پێغەمبەری خوا نیە ﷺ ئایە ئەوە لەپێناخۆشبون نیە لەوەی کە خوا دایبەزاندوەتە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ ؟ ئەمە لەو شتانەیە کە ئێستا پەیدابووە لە کۆمەڵگەداو دەرکەوتوە لە نوسراوەکانیاندا لە گۆڤارەکانیان و مێزگردەکانیاندا، نایانەوەی کە جیاوازیبکەن لەنێوان ئەوەی خوا جیاوازی کردووە لەنێوانیاندا، خوای گەورە جیاوازی کردووە لەنێوان باوەڕداران و بێ باوەڕاندا، وە جیاوازی کردووە لەنێوان باوەڕداران و جولەکە و گاورەکاندا، وە ئەوان دەڵێن: جیاوازی نیە لە نێوان باوەڕداران و جولەکەو گاورەکاندا هەر هەموویان باوەڕدارن وە جولەکە و گاور خاوەن پەرتوکن و یاسای تایبەت بەخۆیان هەیە بەڵام یەکسان ناکرێن بە باوەڕ داران، وە ئاینی جولەکەو گاوریش یەکسان نیە بە ئاینی ئیسلام، ئاینی ئیسلام بەتەنها ڕاستە و دروستە، هەرگیز یەکسان نابن پێ ی ئاینی جولەکەو گاور ئەگەر چیش یاسای تایبەت بەخۆی هەیە جیا دەکرێنەوە لە بێ باوەڕانی تر پێ ی، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نیە کە ئاینی ئەوان یەکسان بکەین بە ئاینی ئیسلام، ((جا هەرکەسێ ئاینی جولەکەو گاور یەکسان بکات بە ئاینی ئسلام ئەوە گومانی تێدا نیە کە بێ باوەڕە)).

وە ئەوانە بە هیچ جۆرێك نایانەوێ ئەو ئایەتانە باسبکرێ کە لەبارەی دۆستایەتی و دوژمنایەتیەوە خوای گەورە لە قورئاندا دایبەزاندووە، وە هەروەها نایانەوێ کە باسی ئەو ئایەتانەبکرێ کەباس لە جولەکەو گاور دەکات و سەرکۆنەیان دەکات و نەفرینیان لێ دەکات و ڕێچکەو سەرشۆڕیەکانیان ڕون دەکاتەوە.

وە ئەو ئایەتانەی كە فەرمان بە ڕق لێبوونەوەی جولەكەو گاور دەكات نایانەوێ گوێیان لێبێت، ئایە ئائەوە ڕقلێبونەوە نیە بەرامبەر ئەوەی كە خو دایبەزاندووەتەسەر پێغەمبەرەكەی ﷺ ؟ ئەوە كارێكی زۆر توندە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾[1]

ماناكەی لەپێشەوە ڕون كراوەتەوە، وەئەوەی لەسەر موسوڵمان پێویستە ئەوەیە كە لەخوا بترسێ و سەرنەوی نەكات بۆ بێ باوەڕان و جولەكە و گاورەكان، لە ئاینی خوای بەرز و بەڕێزدا سەریان بۆ نەوی ناكات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ ﴾[2]

واتە: (ئاواتەخوازن كە تۆ نەرمی بكەیت لە ئاینەكەتدا دەربارەی بیرو باوەڕەكەت جا ئەوانیش ئەوكات نەرمیت لەگەڵ بكەن و ڕێك كەون واتە ئەگەر تۆ تۆزقاڵێك لێیان نزیك ببیتەوەو دەست لە بەرنامەكەت شل بكەیت ئەوانیش ئامادەن گوێڕایەڵ بن!).

وە هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَفَبِهَٰذَا الْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ ﴾[3]

واتە: (ئایە ئێوە هەربەم قورئانە باوەڕ ناكەن).

دروست نیە نەرمی نواندن و سەرشۆڕیكردن لە ئاینەكەی خوادا، بەڵام ئەگەر ئێمە مامەڵە لەگەڵ جولەكەو گاورو بێ باوەڕاندا بكەین بەگوێرەی ئەوەی هاتووە لە قورئانو سوننەتدا ئەوە دروستەو حەقە، بەڵام ئەگەر بێین یەكسانیان بكەین بە موسوڵمانان

[1] محمد: ٢٨

[2] القلم: ٩

[3] الواقعة: ٨١

ئـەوا ناهـەق و پوچـە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾[1]

واتـە: ( هـاوەڵانی دۆزەخ و هـاوەڵانی بەهەشـت یەكسان نـین لەتـەرازوی دادگـەری خوادا، هاوەڵانی بەهەشت براوەكانن ).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾[2]

واتە: (ئاخۆ ئەوانەی بڕوایان نیـە و گونـاە و تـاوانیش دەكـەن پێیـان وایـە كـە وەك ئەوانەیان دادەنێین، بڕوایان هێناوە و كارە چاكەكانیان ئەنجامداوە ؟ هـەرگیز شـتی وا نابێت، پێیان وایە ژیان و مردنیان یەكسانە ؟خراپـە ئـەو دادوەریـەی دەیكـەن، ئەگـەر پێیان وابێت كە هەردوو لایان یەكسان دەبێت).

هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾[3]

واتە: (ئایە دەكرێت ئەوانەی كە باوەڕیـان هێنـاوەو كـاری چـاكەیان كـردووە وەكـو بەدكاران و ئاژاوە گێڕان لە زەویدا دابنێین وەكو یەك حیسابیان بۆ بكـەین؟یاخۆ دەبـێ خەڵكانێكی پارێز كار، لە گوناهو تاوان وەك و خەڵكانی خراپكار دابنێین).

---

[1] الحشر: ٢٠

٢ الجاثية: ٢١

[3] ص: ٢٨

جا دروست نیە هەرگیز ئەوە، خوای بەرزو بەڕێز قورئانی دابەزاندووە بەجیاوازیكردن لەنێوان باوەڕدا رو بێ باوەڕ ئیتر ئەو بێ باوەڕە بت پەرست یان بێ دین یان گاور یان جولەكە بێت، جا بۆیە پێویستە هەر خەڵكەو لەشوێنی خۆیان دابنێین و لە ئەنجامدانی ئاینەكەی خوادا لۆمەی لۆمەكاران نامانترسێنێت، وە گومانی تێدا نیە كە خۆشەویستی قورئان و سوننەت لەباوەڕەوەیە پیاوێ لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بۆ هاوەڵانی خۆی دەكرد ئەم پیاوە لە هەموو ڕكاتێكدا سورەتی ((الأخلاص))ی دەخوێند ئەمەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باسكرد ئەویش پرسیاری لەبارەیەوە لێكرد پیاوەكە فەرمووی ((من ئەو سورەتەم خۆشدەوێت چونكە سیفەتی ڕەحمانی تێدایە)) پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو ((إن حُبْكَ لها أدخَلَكَ الجَنة)).

واتە ((خۆشەویستی تۆ بۆ ئەو سورەتە دەتخاتە بەهەشتەوە))

لە گێڕانەوەیەكی تردا ((أخبِروه أنَ لله يُحِبُ))[1]

واتە ((هەواڵی بدەنێ كە خوای گەورە خۆشی دەوێت )).

جا هەركەسێك قورئانی خۆشبوێت ئەوە باوەڕی هەیە و ئەوەش دەیباتە بەهەشتەوە، وە ئەو كەسەی قورئان یان سوننەتی ڕق لێیە لەبەر ئەوەی پێچەوانەی

---

١ هذا المذكور أعلاه مجموع حديثين:

الأول: عن عائشة رضى ألله عنها أن رجُلاً بَعَثَهَ رسول الله (ﷺ) على سريةٍ فذكرته وفيه : فقال للأ نها صفةَ الرحمن، وأنا أحب أنْ أقرأ بها، فقال النبى (ﷺ) ((أخبِروه أنَ لله يُحِبُ)) أخرجَهُ البخاري (٧٣٧٥)، ومسلم (٨١٣).

والثاني : عن انس أن رجُلاً مِن الآنصار كان يَؤمَهَمْ في مسجد قباء فذكرهُ، وَأنَهُ كان يقرأها في كُل ركعَةٍ وفيه : فقال إني أُحِبُها فقال (ﷺ) ((حُبُك إيها أدخَلَك الجنة)) أخرجه البخاري (٧٧٤) تعليقاً ووصله الترمذي (٢٩٠١) وقال ((هذا حديث حسن غريب صحيح)).وألله أعْلَمْ

هەواو ئارەزویەتی ئەوا کردوەکەی پوچ دەکاتەوە بەو ڕقەی، ئەگەر چیش قسە نەکات واتە دەری نەبڕیٚ، جا ئەگەر دەری ببڕێت و قسە نەکات و مل نەدات؟ئەوە گومانی تێدا نیە کە زۆر توند ترەوقورسترە .

وە هەروەها ئەوکەسەی کە ڕقی لە قورئان و سوننەتە لەبەرئەوەی پێچەوانەی ڕێبازەکەین ئەو کەسەی سەرمەشقیە تی پیٚ ی ناخۆشە بەڵگەی بۆ باسبکرێت لە قورئان و سونەت لەبەرئەوەی پێچەوانەی ڕێچکەکەین، وە ئەوکەسەی ڕێچکەو ڕێبازەکەی زیاتر خۆشدەوێت لە قورئان و سونەت، جا ئەگەر لەدڵیدا بەرامبەر بەوەی لە قورئان و سونەتدا هەیە دروست بووە ڕقیٚ، ئەوا بەڵگەیە لەسەر نەبوونی باوەڕ لەدڵەکەیدا و بەوەش کردەوەکەی پوچەڵ دەکاتەوە، لەبەرئەوەی مرۆڤی باوەڕدار هیچ شتێك پێشناخات بەسەر قورئان و سوننەتدا، هیچ کام لە ئارەزوو یان ڕێچکەو ڕێباز یان شوێنکەوتە پێشناخات بەسەر قورئان و سوننەتدا بەڵکو قورئانەکەی خواو سونەتەکەی پێغەمبەر ﷺ پێشدەخات بەسەر هەموو شتێکدا ئەگەرچی قورئان‌و سوننەت پێچەوانەی هەواو ئارەزوو ڕێچکەو ڕێباز و ڕێچکەی ئەوەی چاوی لێدەکات بێت، موسوڵمان هیچ شتێك وەك و قورئان و سونەت تەماشا ناکات و یەکسانی ناکات، پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی ((موسوڵمان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە بۆ هیچ کەسیٚ نیە واز لە سوننەت و ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ بێنێت لەدوای ئەوەی بۆی ڕون بۆتەوە بۆ قسەی هیچ کەسێك))[1]

وە عبدالله ی کوڕی عباس ڕەزای خوایان لێبێت بەهاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت دەفەرموێت ((دوور نیە و خەریکە بەرد ببارێتە خوارەوە بەسەرتاندا لە ئاسمانەوە،

---

١ذكره ابن القيم في إعلام الموقعين (٢\٢٨٢)

دەڵـێم پێتـان: پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت، وە ئێـوە دەڵـێن ئەبوبـەکر و عومـەر دەفەرموون ڕەزای خوایان لێبێت)) [(١)]

جا ئەگەر قسەی ئەبوبکر و عومەر ڕەزای خوایان لێبێت بەسـەر قـسەی پێغەمبـەری خوادا ﷺ وا بکات کە دوور نیە بەرد لە ئاسمانەوە دابارێ ئەی قسەی ئەوکەسە چۆن دەبێت کە ڕێبازوو ڕێچکەی فلان و فیـسار لـەناو خەڵکیـدا پێـشبخات بەسـەر قورئـان و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر پێچەوانەی ڕێـچکەی ئـەو یـان ڕێـچکەی مامۆسـتاکەی بێت ئەوا هەڵوێستێکی دوژمنکارانـەی دەبێـت بەرامبـەر قورئـان و سـوننەت و نایـەوێ. داوای پاراستن لەخوای گەورە دەکەین، ترس هەیە لەو کەسانە بێت کە خـوای گـەورە دەربارەیـــان دەفـــەرموێت: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ﴾ [٢]

واتە: (کاتێ ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی ئێمەشیان بەسـەر بخـوێنرێ لـە دەم و چـاوو دیمەنی بێ بڕوا کاندا کرژی و تاڵی و ئینکاری دەبینی).

بۆچی ؟لەبەر ئەوەی ئەوان ڕقیان لە ئایەتـەکانی خـوای بـەرزوو بـەڕێزە، ترسـناکی زۆر توندە لەو بارەوە.

ئـــەو هەڵوەشـــێنەرە ترســـناکیەکەی زۆر تونـــدە و شاراوەشـــە لـــە دڵەکانـــدا و لەدەرونەکاندا، لەسەر موسوڵمانە کە ئاگای لەدەروونی خۆیبێت و بیپشکنێ لەگەڵ ئەو

---

١أخرجَهُ أحمد في مُسْنَدِهِ (٣١٢١) بنحوه وصححةأحمد شاكر رحمه الله و أخرجَهُ الخطيب في الفقيه والمتَفقِه رقم (٣٧٩ و ٣٨٠)، وابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفصله رقم (٢٣٧٨) و إسناده صحيح بلفظ: ((أراهُمْ سيُهلكون، أقول : قال النبي (ﷺ) ويقولون : نهي أبوبكر و عمر)) وهذا لفظ الخطيب في الرقم الأول.

٢ الحج: ٧٢

هەڵوەشێنەرەدا بەراوردی بکات لەبەرئەوەی شتێکی لەوە تیادا نەبێت، یان ڕقی لەشتێبێت کە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بێت یان ئەگەر پێچەوانەیبێت لەبەر ئارەزووی دەرونی یان پێچەوانەی ڕێبازەکەی یان گروپەکەی یان پێشەواکەی بێت، وە ئەوکەسەی وابێت لەسەر مەترسیەکی گەورەیە.

لەوەوە ڕون بویەوە کە پێویستە لەسەر موسوڵمان کە بەرزی ڕابگرێت و ڕێزی بۆ دابنێ بۆ هەریەك لە قورئانەکەی خواو فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ وە هیچ شتێك لە بۆچونەکان و ڕێبازەکان بەسەریاندا پێش نەخات، وە ویست و مەبەستەکانیش پێش نەخات، ئەوە باوەڕبوون پێویستی دەکات کەوابێت کە قورئانەکەی خواو سونەتەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ خۆشبوێت، وە ڕقی لە هەرشتێکبێت کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێت، ئەمە نیشانەی باوەڕ و شوێن کەوتن و پەیڕەو کردنە، خوای پاك و بێگەرد قورئان و سوننەتی دابەزاندووە فەرمانی پێکردووین کەشوێنیان بکەوین و قەدەغەشی لێکردوین کە پێچەوانەیان بکەین، جا هەرکەسێ ڕزگاری و دواڕۆژی دەوێت پێویستە لەسەری دەست بە قورئان وسونەتەوە بگرێت، هەتا ئەگەر قورئان و سوننەت پێچەوانەی ئەوەشبێت کە دەیەوێت و ویستی لێیەتی، ئەوا لەو کاتەدا دواڕۆژێکی خۆش چاوەڕێتە، وە خوای بەرزو بەڕێز خاوەنی دانای و زانست ئەو شتەت لەسەر قەدەغە دەکات با تۆش ویستت لێی بێ و دڵت بەلایدا بچێت، بەڵام خوای گەورە زاناترە بە پاشەڕۆژ و پاشهاتەکان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ [١]

---

[١] البقرة: ٢١٦

واتە: (لەسەرتان جەنگ نوسراوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا بیکەن، دیارە جەنگیش شتێکی قورس و ناڕەحەتە و خۆشتان لێ نایە، دڵ و دەرون حەزی پێناکات چونکە کوشتن و بڕین، بەخت کردنی دارایی و بەجێ هێشتنی نیشتیمانی تێدایە بەلاَم ئەگەرچی ئاواشبێت هەر جیهاد هۆی سەرفرازیتانە، لەوانەشە لە شتێك حەزنەکەن و ناخۆشبێت لاتان بەلاَم خێرو چاکەی تێدابێت و بەخێریش گەڕێ ڕەنگە حەزتان لەهەندێ شت بێ و پێشتان خۆشبێت کەچی شەڕو خراپ بێت و ئاکامەکەی باش نەبێت).

شەڕکردنیان پێ ناخۆشە لەبەر ئەو ناڕەحەتی و برینداری و کوشتن و مەترسیەی تێیدایە، پێناخۆشبونێکی دەروونی نەك پێناخۆشبونێکی ئاینی، لەبەر ئەوەی دەرون برینداری و کوشتنی پێناخۆشە ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾[1]

واتە: (بێ گومان خوا خۆی دەزانێ چشتێ چاکەو چشتێ خراپە بەلاَم ئێوە نایزانن).

جا موسوڵمان دەزانێ کە ئەوەی خوا دادوەری کردووە و بڕیاری داوە یان ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوە ئەوە خێرو چاکەیە لە ئێستاو داهاتوشدا ئەگەرچیش بۆی دەرکەوت کە ناڕەحەتی تیادایە یان پێچەوانەیە بۆ ئازاری دەرونی، ئەو باوەڕی وایە کە خێرو چاکە لەوەدایە کە خوا فەرمویێتی یان پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمویێتی، وە هیچ شتێك پێش ناخات بەسەریاندا و بۆچونی خۆشی پێش ناخات، خوای گەورە

---

[1] البقرة: ٢١٦

دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝١﴾[١]

واتـە: (ئـەی ئـەو كەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە !پێـشی خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ مەكەون، لە هیچ كارێك لە كاری دین و دونیادا، كاتێك پرسیارێك لـە پێغەمبـەر ﷺ كرا ئێوە پێش ئەو وەلاّم مەدەنەوە، لـە ڕۆیـشتندا پـێش مەكـەون، لەخۆتانـەوە بڕیـار مـەدەن، لـەخوا بترسـن و لەسنورەكانی لامـەدەن چـونكە بەڕاسـتی خـوا بیـسەرە بـە وتەكانتان، زانایە بە ئیش و كارەكانتان).

وە عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەفـەرموێت ((ئـەی خەڵكینـە تۆمـەت بـاری بۆچـون بكەن لە ئایندا ئەگەر منتان بینیبایـە لـەڕۆژی (أبـي جنـدال)دا كـە ئەگـەر دروسـتبوایە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ ڕەت بكەمەوە ئەوا تێدەكۆشیم چەندێك بم توانیایـە بـەلاّم وازم لە بۆچونەكەی خـۆم هێنـا كـە حـەزم نـەدەكرد ئاشـتەوایی حودەیبیـە بكـرێ و شـوێن پێغەمبەر ﷺ كەوتم و فەرمانەكەیم وەرگرت )[٢]

وە چیرۆكەكە بەو شێوەیە كە پێغەمبەر ﷺ ڕێكەوت لەگـەڵ هاوبـەش دانەرانـدا لـە حودەیبیە دا بەوەی كە بگەڕێنەوە و عومرەكەی نەكات و سـاڵی ئاینـدە بێتـەوە، ئـەم ڕێكەوتنە لەسەر عومەر و جگە لـەویش لـە هـاوەلاّن قـورس بـوو ڕەزای خوایـان لێبێـت لەبەر ئەوەی وادیاربوو بۆیان كە ئەو كارە سەركەوتن بێت بۆ بێ باوەڕان و سەرشـۆڕی بێـت بـۆ موسـوڵمانان، ئـەوە لەسـەریان قورسـبوو جـا بۆیـە عومـەر قـسەی لەگـەڵ

١ الحجرات: ١

٢ أخرجه البخاري (٤١٨٩)، ومسلم (١٧٨٥) من قول سهل بن حنيف رضي الله عنه

ئەبوبەکردا کرد ئەبوبەکریش ڕەزای خوای لێ بێت پـێ ی فـەرموو ((ئـەوە پێغەمبـەری خوایە، دەست بەفەرمانەکەیەوە بگرە))[1]

ڕێك کەوتنەکە کراو بەخێریش تەواو بـوو بـۆ موسـوڵمانان و سەرشۆڕیشبوو بـۆ بـێ باوەڕان و خوای گەورەش ناوی لێنا سەرکوتن ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١﴾[2]

واتە: (بێگومان ئێمە بەهۆی پێکهاتنەکەی حودەیبیـەوە سـەرکەوتنێکی ئاشـکرامان بۆکردیت ئەی محمد ﷺ).

لەگەڵ ئەوەی کەعومەر ڕەزای خـوای لێبێـت ئـەوەی پێنـاخۆش بـوو لەبـەر ئـەوەی واگومانی برد کەلەوەدا سەرنەوی موسوڵمانانی تێدایەو سەرکەوتنە بۆبێباوەڕان، بـەڵام ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لێدا ئـەوە خێروچـاکەبوو، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ لەخۆیەوە هیچ قسەیەك ناکات بەڵکو کەدەیڵێت وەحی ونیگای خواییە.

جائـەوەی پێویـست ئەوەیـە کەهـەردەم قـسەی خـواو قـسەی پێغەمبـەر ﷺ پێشبخرێت، جالەخۆتـەوە ڕەخنـە مـەگرەو لەدەرونیـشتدا تـەنگی نـەبێت لەبارەیـەوە. بەڵام خوانەخواستە ئەگـەر ڕقـت لـەوەبوو کەلەلایـەن خـواو پێغەمبەرەوەیـە ﷺ ئـەوا ئەمە هەڵگەڕانەوەیە.

داوا لەخوادەکەین سەلامەتمان بکات .

---

[1] سبق تخريجه

[2] الفتح: ١



پرسیار: ئایە پێویستە کەسێك بە بێباوەڕ دابنرێت کەڕقی لەشتێك لەقورئانەکەی خوا یان سونەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بێت وڕق وکینەکەش بەئاشکرا دەربڕێت ؟

وەلام: ئەگەر ڕقەکەی دەرخست وتی من ڕقم لەوەیە کەلەلایەن خواوەیە یان پێغەمبەری خواوەﷺ هاتووە ئەوە گومان لەبێباوەڕ بونیدا نییە . بەلام ئەگەر نەزانراو تەنها لەدڵیدا قسەی کردو وتی من ڕقم لەم فەرموودەیە یان ڕقم لەم ئایەتە یان هاو شێوەی ئەوە، ئەوە پەنابەخوا بەڕاکشاوی بێباوەڕیەکەی دەرخستووە حوکمی ئەوەی بەسەردا دەدرێت کەلەزمانی خۆیەوە دەرچووە، بەلام ئەگەر قسەی نەکرد ئەوائێمە جگە لەڕوکەش هیچی دیمان بۆنیە وناخی دڵیش جگە لەخوای بەرزو بەڕێز کەسی دی نایزانێت .

پرسیار: هەندێ خەڵکی هەندێ کارەکانیان لەسەر قورس وگرانە هەڵدەستێ بەکردنیان لەگەڵ ناڕەحەتیدا، وەهەندێ جاریش دەرونیان شتێکی پیناخۆشە لەوەی کەخوادایبەزاندووە، وەکو هەستان لەخەو بۆنوێژی بەیانی وجگەلەویش، ئایە ئەویش دەژمێردرێت لەوەی کەڕقی لەشتێك بێت لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی ؟

وەلام: جیاوازی هەیە لەوەی کەمرۆڤ ڕقی لەوەبێت کەخوادایبەزاندووە لەگەڵ ئەوەی تووشی تەمبەڵی بوبێت لەهەستان بۆ شەونوێژ یان نوێژی بەیانی ئەوە بێ باوەڕنابێت بەتەمبەڵی، ئەوە سەرکۆنە دەکرێت لەسەرتەمبەڵیەکەی قورسی لەشی کەناتوانێت پەرستشەکان وەك خۆیو لەشوینی خۆیدا بەچاکی ئەنجام بدات، بەلام پێی ناوترێت ئەوە بێباوەڕە لەبەر ئەوەی ئەوە کارێکی سرشتییەو ناگەڕێتەوە بۆ باوەڕ، هەروەکو چۆن کاتی جیهادو شەڕکردن پێویست کرا قورسبوو لەسەریان، خوای

گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ﴾[1]

واتە: (لەسەرتان نوسراوە جەنگ کردن لەگەڵ بێباوەڕندا دیاریشە جەنگ کردن قورسە لەسەرتان وناخۆشەبۆتان).

ئەوە مانای ئەوە نیە کە ڕقیان لەوە بێت کە خوای گەورە پێویستی کردووە بەڵکو هەر خودی شەڕکردنیان پێ ناخۆشەو قورسە لەسەر دەرونی مرۆڤ ((وَهُوكُرْهٌ)) واتە شەڕکردن بەوەی کە تیایەتی لە نارەحەتی، گومانی تیا نیە کە سەرکۆنە دەکرێ لەسەر ئەوە بەلاّم ناگاتە ڕادەی بێ باوەڕی، تەمبەڵی لە نوێژدا بۆ وێنە یان شەو نوێژو یان لە هەندێ کاتدا تەمبەڵی لە نوێژی بەیانیاندا کە ئامادەیی نابێت بە هۆی قورسی لاشەی و تەمبەڵی خەوەوە، ئەوە کورتیەو کەمی باوەڕەکەیەتی بێگومان جۆرێکیشە لە جۆرەکانی دوو ڕوویی بەلاّم ناگاتە ڕادەی بێ باوەڕی، بەلاّم ئەگەر ڕقی لە نوێژ بوو وتی ئەم نوێژە چیەو بۆچی هەستین بە شەو بڕۆین و نوێژ بکەین؟ ئەوەیە کە بێ باوەڕ دەبێت، ئەگەر یاساو بڕیاری خوایی پێ ناخۆش بێت.

پرسیار: هەرکەسێ هەواڵێ لە هەواڵەکانی پێغەمبەرﷺ ڕەد بکاتەوە لە بەشەکانی بیرو باوەڕدا لەسەر ئەوەی کە بڵێ ئەوە لەو هەوالاّنەیە کە تاکە کەسێ گێڕاویەتەوە. ئایا ئەوە بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دادەنرێت؟

وەلاّم: ئەگەر زانی کە ئەو فەرمودەیە ڕاست و دروست لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووەو دەقێکیشە لە بابەتەکەدا هیچ ئەملاو ئەولا هەڵناگرێ، بەڵێ بە هەڵگەڕانەوە دادەنرێت لەبەرئەوەی هیچ بەهانەیەکی نیە.

---

١ البقرة: ٢١٦

بەڵام ئەگەر ڕاستیەتی و چەسپاوی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەزانی یان کە زانی ڕاست و دروستەو چەسپاوە بەڵام فەرمودەکە دەگونجێ بۆ جگە لەوەش بەکاربهێنرێ، وە دەقێکیش نیە لە بابەتەکەدا یان ماناکەی بە جۆرێکی دی لێکدایەوە، ئەوە لەو کاتەدا پۆزشی بۆ دەهێنرێتەوە بەوە فەرمودەکە هەڵدەگرێ مانای تریشی هەبێت و لێکدانەوەی تری بۆ کردووە .

پرسیار: هەرکەسێ کارێکی ڕێ پێدراو یان ئەوەی جیاوازی تیادا بێت ڕقی لێی بێ، ئایا دەچێتە ناو هەڵوەشێنەری پێنجەمەوە، واتە هەڵوەشێنەری پێنجەمی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت؟

وەڵام: ڕێگە پێدراو یان بونی جیاوازی لە لایەن زانایانەوە ئەوە بۆی بەهانەیە لە جیاوازیەکەدا ئەگەر بابەتەکە جیاوازی تێدا بێت کە ئەویش بریتی یە لە وەرگرتنی یەکێ لە ماناکانی یان یەکێ لە ڕێبازو مەزهەبەکان، ئەوە ئەگەر لە کۆشش کاران بێت یان لەوانە بێت کە بە دوای بەڵگەدا دەگەڕێت تا هەقی دەستکەوێت ئەوە بەهانەی بۆ دەهێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەبەرئەوەی ئەوە وەردەگرێت کە لە گەڵ هەواو ئارەزویدا دەگونجێت ئەوە بێگومان بە هەڵەدا چووەو تاوانباریش دەبێت لەسەری بەڵام ناگاتە ڕادەی بێ باوەڕی .

پرسیار: ئایا لە فەرمودەی خوای گەورەدا ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ۝٩ ﴾[1] واتە: (ئەوەش لەبەرئەوەی کە بەڕاستی ئەوان ڕقیان لەو پەیامە دەبوەوە خوا دایبەزاندووە، خوای گەورەش کارەکانیانی پوچەڵ کردەوە).

---

[1] محمد: ٩

بەڵگەیە لەسەر ڕق لێبونی هەندێ لەوەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، لەکاتێکدا بیستومانە کە کەسێ ئایەتەکە دادەبەزێنێتە سەر ڕق لێبونی هەموو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی یان بەڵگەیە لەسەر ڕق لێبونی هەموو ئەوەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، وای لێ دەکات کە هەڵوەشێنەرەکە لە هەموویدا بێت نەك لە هەندێکیدا ((واتە وا ڕاڤەی دەکات کە هەموو ئاینی پێ هەڵدەوەشێتەوە لەبەرئەوەی ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر هەموو واتە رقی لە هەمویەتی نەك لە هەندێکی ..وەرگێڕ)) .

وەڵام: بڕیارەکە هەمووی دەگرێتەوەو هەندێکیشی دەگرێتەوە، ئایە هەندێکیش هەر لەوە نیە کە خوا دایبەزاندووە ؟ هەر لەبەرئەوەشە زانایی بەڕێز دەربڕی بە وتەی: هەرکەسێ ڕقی لە شتێك بێت، نەیفەرموو هەرکەسێ ڕقی لەوە بێت خوا دایبەزاندووە، بەڵکو فەرموی: هەرکەسێ ڕقی لەشتێك بێت لەوەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، ئەوە هەندێکیش دەگرێتەوە، و هەمویشی دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی هەندێکیش خوا دایبەزاندووە هەروەکو هەمووش هەر خوا دایبەزاندووە، وە وشەی (ما) لە وتە گشتیەکانە.

پرسیار: حوکمی کەسێ چیە ڕقی لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بێت؟ ئایا بەشێکە لەم هەڵوەشێنەرە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام؟

وەڵام: بەڵێ، هەرکەسێ ڕقی لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر دووڕوویی، هیچ کەس ڕقی لە هاوەڵان نیە مەگەر دووڕووبێت، بەڵکو خوای گەورە بە بێ باوەڕ ناوی بردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ

﴿فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩﴾[1]

واتە: (محمد ﷺ ڕەوانەکراوو پەیامبەری خوایە پێیان خۆش بێت یان نا، ئەو کەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەو کەوتوون لە بەرانبەر بێ بڕواکاندا ئازاو بەهێزن، لە ناو خۆشیاندا میهرەبانو بەسۆزو دڵ نەرمن، دەیانبینیت هەردەم خەریکی ڕکوع و سوژدەن، واتە: زۆر خەریکی خواپەرستی و نوێژن، بەشەو شەو نوێژ ئەکەن و بە ڕۆژیشدا سوارچاکی مەیدانن، هەموو کات ئاواتیان بەدەست هێنانی فەزڵ و میهرەبانی خوایە، مەبەستیان ئەوەیە خوا لێیان ڕازی بێت، نیشانەیان لە شوێنەواری سوجدە بردنەکانیانەوە بۆ خوا لە ڕوخساریاندا دیارە، واتە: کرداریان شیرین و کاریان چاك و پیرۆزە، زمانیان پاك و دڵیان پاك و ڕەوشتیان بەرزە، ئەوە وەسفیانەو لە تەورات و ئینجیلیشدا وەکو کشتێ وایە کە لە سەرەتاوە وەچی دەرکردبێ، ئینجا وەچەکە بەهێزی کردبێ، ئینجا ئەستوریش بوبێ، ئەوسا لە بنجەکانیشی وەستابێ ئەوەندە زوو هەڵ بدات و گەشە بکات وەرزێرو کشتەوانەکان سەرسام بکات، واتە: بۆ یەکەم جار هاوەڵانیش لەسەرەتای کارەوە کزو لاوازبوون، پاشان وورده وورده زیادیان کردوو زۆرو بەهێز بوون و لەسەر پێی خۆیان وەستان، خوا ئاوا بە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ دەکاتو بۆئەوەی ڕقی کافرانی پێ هەڵسێنێ، خوا بەڵێنی بەو کەسانە داوە بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجام داوە، بە لێبوردنی تەواوو پاداشتێکی گەورە)

خوای گەورە هاوەڵانی هێنایە بوون تا ڕقی کافرانی پێ هەڵسێنێ، جا هەرکەسێ ڕقی لە هاوەڵان بێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر بێ باوەڕی و دوو ڕوویی، داوا لە خوا دەکەین سەلامەتمان بکات و بمانپارێزێ، وە خوای بەرزو بەڕێز باسی باوەڕداران

---

[1] الفتح: ٢٩

دەکات بەوەی بەسۆزن و دەپاڕێنەوە لە خوا بۆ ئەوانەی لە پێش خۆیانەوە ڕۆیشتوون‌و مردون، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾[1] واتە: (ئەوانەش لە دوای ئەوانەوە هاتوون، واتە: لە پاش کۆچکەران و یارمەتیدەرانەوە هاتوون، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەمان کە پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببە، وە هیچ بوغزو قینێك مەخەرە دڵمانەوە بەرانبەر بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە، ئەی پەروەدگاری ئێمە بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان).

ئەوە هەڵوێستی موسڵمانە بەرامبەر بە هاوەڵان کە داوای لێخۆشبونیان بۆ بکات و خوا لێیان ڕازی بێت و دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببە، وە بە باشە باسیان بکات.

پرسیار: ئەوانەی قسە لەبارەی زانایەکانمانەوە دەکەن و دەڵێن ئەوان زانان لە بواری ((خوێنی ئافرەتان و، زەیستانی واتە ئەو خوێنەی لە دوای لە دایك بونەوە لە ئافرەتان دێت)) وە دەڵێت جیاوازی مەخەنە نێوان گەنجەکانی نەتەوەوە، بەڵکو ئێمە یەکڕیزیمان دەوێت، ئایا ئەوە لە بێ باوەڕی دەژمێردرێت بەوەی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرەکەیﷺ ؟

وەلآم: ئەوە لە بێ باوەڕی نیە، بەلآم ئەوە لە پاشەملە باسکردن و کەوتنە باسکردنی ناموسی زانایانە، وە ئەوەش قەدەغەیە بێگومان، لەبەرئەوەی پاشەملە باسکردنێکە کە بە توندی قەدەغە کراوە لێی، وە پێویستە لە سەریان کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوای بەرزو بەڕێز، پاشانیش باسکردن لە بارەی زانایانەوە چ سودێك

---

[1] الحشر: ١٠

دەبەخشیٚ؟ هیچ نابەخشیٚ تەنها خراپە نەبێت، ناشرینیان دەکەن لای خەڵکی و ڕقیان لێیان دەبێت و متمانەیان لایان کەمدەکەنەوە، ئەی ئایا خەڵکی بۆ لای کیٚ بڕۆن ئەگەر نەگەڕێنەوە بۆ لای زانایان؟ بۆ کویٚ دەڕۆن؟ ئەوە مەترسیەکی گەورەیە .

وە لە وەشەوە ئەوە دروست دەبێت متمانە کەم ببێتەوە بە زانایان و لەکەدارکردنی پێگەیانە لای خەڵکی ئەوە کارێکە کە دروست نیە، وە ئەوەش مانای وایە کە خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ لای جگە لە زانایان و بەوەش شەڕو خراپە پەیدا دەبێت وە هەر ئەوەشە کە بانگەوازکارانی خراپ دەیانەویٚ ڕووبدات تا زانایان ڕێزیان نەمێنێت.

# وانەی حەوتەم لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەری شەشەم

**زانای پایەبەرز دەفەرموێت: هەركەسێ گاڵتە بكات بە شتێ لە ئاینی پێغەمبەرﷺ یان بە پاداشتی یان بە سزای بێ باوەڕە، وە بەڵگەش وتەی خوای گەورەیە ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ﴾** التوبة: ٦٥ - ٦٦

**واتە: (پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو بە ئایەتەكانی و بە پێغەمبەرەكەیﷺ گاڵتەتان دەكرد؟ ئیتر بێ سودە، هیچ بیانو پاساو مەهێننەوە، چونكە بە ڕاستی ئێوە بێ باوەڕبونە پاش باوەڕهێنانتان﴾.**

## ( ڕاڤە )

ڕەحمەتی خوا لە زانای پایەبەرز فەرموی: (شەشەم) واتە: هەڵوەشێنەری شەشەم لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام ((هەركەسێكە كە گاڵتە بكات بە شتێك لە ئاینی پێغەمبەرداﷺ یان پاداشتی یان سزای بێ باوەڕە))

وە بەڵگەی فەرمودەی خوایە ((پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو بە ئایەتەكانی و بە پێغەمبەرەكەیﷺ گاڵتەتان دەكرد؟ ئیتر بێ سودە هیچ بیانو مەهێننەوە، چونكە بە ڕاستی ئێوە بێ باوەڕبوونەوە پاش باوەڕهێنانتان)) ئەوە بەشێكی گەورەیە، وە

ئەوەی پێشوش ((هەركەسێ ڕقی لە شتێك بێت لەوەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی)) ڕقو پێناخۆش بوون لە كردەوەكانی دڵن، بەڵام گاڵتە كردن لە ووتەكانی زمانن.

وە ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەش لـە هۆكـاری دابەزینەكەیـدا هـاتووە[١] كـە كۆمـەڵێ لـە مسوڵمانان لە گەڵ پێغەمبەرداﷺ لە جیهاددا بوون، لە جەنگی تەبوكدا، كۆبونـەوە لـە شوێنێكدا یەكێ لەوان قسەی كردوو وتی: نەماندیووە وێنە ئەوانە، قورئان خوێنانە، كە هەمیشە بە شوێن سكیانەوە بن، وە زۆریش درۆزن بـن، وە زۆر ترسـنۆك بـن لـە كـاتی ڕوبەڕوبوونەوەدا، مەبەستیان پێغەمبـەروﷺ هاوەڵـەكانی بـوو ڕەزای خوایـان لێ بێـت. وە لەو شوێن و دانیشتنەدا گەنجێك لە ئەنصارەكان لـەوێ بـوو پێیـان دەوت ((عـەوفی كوڕی مالك)) بـەو پیـاوەی وت: درۆت كـرد، بـەڵام تـۆ بۆیـە وا دەڵێیـت دوو ڕویـت، وە دەبێت هەواڵ بدەمە پێغەمبەرﷺ، هەتا ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرﷺتـا هـەواڵی بـداتێ بەڵام بینی كە نیگاو سروش پێشی كەوتووەو دابەزیوەتـە سـەر پێغەمبـەرﷺ و خـوای بەرزو بەڕێز هەواڵی داوەتێ بـەوەی كـە ئەمانـە لـە دانیـشتنەكەدا وتویانـە، یـان یـەكێ لەوان وتویەتی و ئەوانی تریش ناڕەزاییان دەرنەبڕی و ڕێگرییان نەكرد، وە لـە كاتێكـدا كە ئەوە دابەزیە سەر پێغەمبەرﷺ و ئەو قسە ناشرینەی پێ گەیشت لە شـوێنی خـۆی هەستاو سوار ئاژەڵەكەی بـوو ڕۆیـشت، ئـەو پیـاوەی كـە قـسەی كردبـوو هـات بـۆ لای پێغەمبەرﷺ داوای لێبوردنی لێ دەكرد، دەیوت ئەی پێغەمبەر ﷺئێمـە تـەنها گاڵتـەو گەپمان دەكـرد، قـسەی سـواری ئاژەڵمـان دەكـرد تـا ڕێگـەی پـێ بـبڕین ((واتـە چۆن ئەوانەی بەسەر ئاژەڵەكانەوە دەڕۆن بە ڕێگادا بۆ ئەوەی بێتاقەت نـەبن قـسەی خـۆش دەكەن تا ڕێگەكە تەواو بكەن ئێمەش هەر وامـان كـردووە .. وەرگێـڕ))، وە پێغەمبـەر

---

٢- سبق تخریجە

ﷺلایشی نەدەكرد بە لایەوە لە كاتێكدا كە پیاوەكە خۆی بە ڕەشوەی حوشترەكەیەوە هەڵواسیبوو پێغەمبەرﷺ بە سواری حوشترەكەیەوە دەڕۆیشت و ئەو پیاوەش بە ڕەشوەكەوە خۆی هەڵواسیبوو دەكشا بە دوایدا، وە پێغەمبەریش ﷺ لای نەدەكردەوە بە لایداو لەو ئایەتە زیاتریشی نەدەخوێند ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾[1] فەرمودەی خوای بەرزو بەڕێز ( لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ) ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەوان باوەڕدار بوون و دووڕوونەبون، وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی هەركەسێ گاڵتە بە خواو یان بە پێغەمبەرەكەیﷺبكات یان بەوەی لای خواو پێغەمبەرەكەیەوەﷺگاڵتە بكات ئەوە بێ باوەڕ دەبێت لە دوای ئەوەی باوەڕی هێناوە هەڵدەگەڕێتەوە لە ئاینی ئیسلام، ئەوە شوێن بەڵگەیە لە ئایەتەكەدا، ئەگەر لە پێش قسەكەیاندا ئەوانە دوو ڕوبوونایە نەیدەفەرموو ((بە ڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوونەوە پاش ئەوەی باوەڕتان هێنابوو)) لەبەرئەوەی دووڕووەكان هەر لە بنەڕەتدا باوەڕدار نەبوون و بە باوەڕداریش ناونەنراون، بەڵكو هەر بە دووڕوو ناونراون، وە بێگومان خوای بەرزو بەڕێز لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ﴾[2]

واتە: (خۆ لە واقیعیشدا قسەی بێ باوەڕی و خوانەناسیان گوتبوو دوای ڕاگەیاندنی موسوڵمان بونیشیان دیسان گەڕابونەوە سەر بێباوەڕی و خۆیان بێ باوەڕ كردبووەوە).

---

[1] التوبة: ٦٥ – ٦٦

[2] التوبة: ٧٤

نەیفـــەرموو دوای باوەڕهێنانیـــان بـــەڵکو فـــەرموی دوای موســـوڵمان بونیـــان وە ئیسلامیش ماناکەی: ڕاگەیانـدنی چـونە نـاو ئیـسلامە بـا ڕاسـتیش نـەکات لـە دڵیـەوە. دەگونجێت بێ بـاوەڕ بێـت لـە ناخیـەوە بـا واش دەربخـات مـسوڵمان بـووە، وە ئـەوە دووڕوویـە، وە ئایەتەکـەش ئـەوەی تیـادا نیـە کـە ئەوانـە بـێ باوەڕبونـەوە دوای باوەڕهێنانیان، بەڵکو تیایەتی (وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ) بـێ بـاوەڕ بوونـەوە دوای ئـەوەی بوونە مسوڵمانو مسوڵمان بوونیـان ڕاگەیانـد، جـا جیـاوازی هەیـە لـە نێـوان مـسوڵمان بوونی ڕوت و باوەڕهێناندا.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر چەندین شتی گەورە:

یەکـەم: کـە پێویـستە خـوای گـەورە ڕێـزو گـەورەیی و ڕێزگرتنـی بـۆ دابنرێـت، وە هەرکەسێکیش لە گەورەیی و ڕێزی خوای گەورە کەم بکاتەوە ئەوە بـێ بـاوەڕ دەبێـت هەروەکو چۆن جولەکە وتیان ﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلْ يَدَاهُ﴾[1]

واتــە: (فەنعاســی جولەکــەی نــەفام و نــەزان وتــی: خــوا دەســتی زنجیـر کـراوەو بەستراوە، بۆیە وا ڕژدو چـروکەو ڕزق و ڕۆزی بـە بەنـدەکانی خـۆی نـادا!) وە گوتیـان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾[2] واتە: (خوا هەژارەو ئێمە داراو دەوڵەمەندین).

وە وێنەی گوتەی گاورەکان کە وتیان: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَۚ﴾[3]

واتە: (خوا خۆی عیسای کوڕی مەریەمەو لەودا جێی بۆتەوە).

---

١ المائدة: ٦٤

٢ آل عمران: ١٨١

٣ المائدة: ١٧

ئەوە کەمو کورتیە بۆ خوای گەورەو بێ باوەڕیشە بە خوای گەورەی بەرزو بەڕێز.

دووەم: بە کەم دانانی پێغەمبەرﷺ بە هەمان شێوە بێ باوەڕیە لەبەرئەوەی خوای بەرزو بەڕێز فەرمانی بە گەورە دانان و بەرز ڕاگرتن و ڕێز بۆ دانانی کردووە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰۚ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾﴾[1]

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێش خواو پێغەمبەری خواﷺ مەکەون، لە هیچ کارێ لە کاری دین و دونیادا، لە خوا بترسن و لە سنورەکانی لامەدەن، چونکە بەڕاستی خوا بیسەرە بە وتەکانتان، زانایە بە ئیش و کارەکانتان، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کات لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ گفتوگۆتان کرد، دەنگتان بەسەر دەنگیا بەرز مەکەنەوە، بە چ ئەندازەیەك دەنگی ئێوەی دەگاتێ دەبێ هەر ئەوەندە دەنگ بەرز بکەنەوەو قسەی بەرزو بێ پەردە مەکەن لە ڕویدا وەکو چۆن لەگەڵ یەکتردا بە دەنگی بەرزو ڕووبەڕوو قسە دەکەن و دەنگ بەرز دەکەنەوە، وە بە ناوی خۆیەوە وەك بڵێین محمدﷺ نابێ بانگی لێ بکەن بەڵکو بە نازناوەکانی بانگی لێ بکەن

---

١ الحجرات: ١ - ٥

وە... ...بێت ((یاأیها النبی، یا أبا القاسم)) نەوەك بەو هۆیەوە کردەوەکانتان بەتاڵو پووچەڵ ببنەوە و بەخۆیشتان نەزانن، بێگومان ئەوانەی لە کۆڕی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەنگیان هێواش دەکەنەوە ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە دڵی زاخاو داون بۆ پارێزگاری و خۆپاراستن لە هەموو کارێکی نارەواو خراپ، لێبوردن و پاداشتێکی گەورەشیان لە بەهەشتدا بۆ هەیە بە ڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی هۆدەکان حوجرەکانەوە بە ناوی خۆتەوە((ئەی محمد ! ئەی محمد))بانگت دەکەن ئەوانە زۆربەیان تێناگەن و ڕێزو پلەی تۆ نازانن ئەگەرنا وایان نەدەکرد، خۆ ئەگەر ئارامیان بگرتایەو لە دوورەوە بانگیان نەکردیتایە تا تۆ دەردەچوی بۆلایان چاکترو باشتربوو بۆیان لە ئاینەکەیاندا وە خوایش خوایەکی گوناهپۆشی میهرەبانە).

وە هەروەها خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿لَّا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضًا﴾[1] واتە: (ئەی مسوڵمانەکان: بانگ کردن لە پێغەمبەرﷺ وەك بانگکردن لە خۆتان دامەنێن یاخود بە ناوی خۆیەوە بانگی لێ مەکەن، وەك ئێوە لە یەکتری بانگ ئەکەن)، بەڵکو بەو بڵێن ((یا رسول الله، یا نبی الله)) وە پێغەمبەرﷺ بە پەیامەکەی بانگ دەکرێت، ئەی پەیامبەری خوا، ئەی هەواڵدەری خوا، ناوترێ ئەی محمد بە ناوی خۆی بەڵکو گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرێت و بانگدەکرێت بە پەیامبەرو هەواڵدەر وەکو گەورەییەك بۆیﷺ، وە لەبەرئەمەشە خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵ دەکات بە ناوی پەیامبەرو هەواڵدەرەوە، ئەی پەیامبەر ئەی هەواڵدەر، وە هەرگیز بە ناوی خۆیەوە بانگی نەکردووە جگە لەو شوێنانەی کە هەواڵ دانە نەك بانگکردن،

---

١ النور: ٦٣

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾[1]

واتە: (موحەمەد ﷺ باوکی هیچ پیاوێکتان نییە نە زەیدوونە کەسی دیکەتان) ئـەو هەوڵدانـە لـەبارەی شـتێکەوە: (وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ) واتـە (بـەڵکو ئـەو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە)

وە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُوا۟ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾[2]

واتە: (ئەوانەش کە بڕوایان هێنـابوو و کـارە چاکەکانیان کردبـوو بڕوایـان هێنـا بـە قورئـــان کـــە بـــۆ موحەمـــەد ﷺ دابـــەزێنراوە وە ئەوەشـــە ئـــەو هەقـــە لەلایـــەن پەروەردگاریانەوە هاتووە و کراوە بە بەرنامەی ژیانیان).

ئەوە لەڕووی هەوڵدانـەوە، بـەڵام لـە ئاخاوتنـدا گفتوگـۆی پێغەمبـەری ﷺ بـەناوی هەواڵدەر پەیامبەرەوە بردووە هیچکات مەڵێ موحەمەد ﷺ فەرمووی، بـەڵکو دەڵێیـت پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرموێت، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ ﴾[3] ئەوانـــەی باوەڕیـــان پێهێنـــاوە واتـــە بـــە پێغەمبـــەر ﷺ ﴿وَنَصَرُوهُ ﴾[4] واتــە: بـە گـەورەو بـەرزیان دانـا، ئـەو وشـەی بـەکاردەهێنرێت و مەبەستیش لێی بەبەرز دانان و ڕێزگرتنە، وە بەکاریش دەهێنرێت مەبەست لێی ئەدەب

---

١ الأحزاب: ٤٠
٢ محمد: ٢
٣ الأعراف: ١٥٧
٤ الأعراف: ١٥٧

دانانە وێنەی فێری ئەدەب کردنی کەسێ کە هەڵەی کردووە، بەس ئەوە مەبەست نییە لە بەکارهێنانی (تعزیر) لە مافی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەڵکو مەبەست لێی بە بەرز دانان و ڕێزگرتنە .

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ ﴾[1]

واتە: (تا ئێوە بە خواو بە پێغەمبەرانی سەلامی خوایان لێبێت باوەڕ بهێنن کۆمەکی بکەن واتە کۆمەکی لە ئاینەکەی بکەن و بەمەزنی بگرن واتە بەڕێزداری دابنێن وە بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و یادی بکەن و بە پاك و خاوێنی رایگرن)

وتەی (وتعزروه و وتوفروه ) ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، (وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ) ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خوای پاك و بێگەرد و بەرز، ئەوەش پێویستە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ .

**سێ یەم**: مافی قورئان لەسەرمان ئەوەیە کە پێویستە ڕێزی لێبگرین و بەگەورەی دابنێین، لەبەرئەوەی قسەی خوای بەرزو بەڕێزە، وە گەورەیی قسەی خواش لەسەر هەموو قسەکانە وەکو گەورەی خوای گەورە وایە بەسەر دروستکراوەکانییەوە، لەبەرئەوەی لە قسەی خوایە، وەقسەی خواش سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوای پاك و بێگەرد و بەرز، جائەوەی پێویستە ڕێزگرتنی پەرتوکی خوایە و بەگەورە دانانییەتی و ڕێزگرتنییەتی .

چوارەم: کە پێویستە ڕێزی ئاینی ئیسلام بگیرێت، وە بەکەم دانەنرێ، یان ڕەخنە لەشتێکی بگرێ، لەبەرئەوەی ئاینی خواو شەرعەکەیەتی، جا دروست نییە، بۆهیچ

[1] الفتح: ٩

کەسێ کە ڕەخنە لەو ئاینە بگرێت یان بەکەمی بزانێ یان قسەی تیابکات بە قسەیەك کە کەمدانان و گاڵتەکردن و تەشقەڵە بازی تێدابێت، جائەوە پێویستە بەرامبەر خوای بەرزو بەڕێز و پێغەمبەرەکەی ﷺ و بەرامبەر ئاینی ئیسلام جێبەجێ بکرێت.

پێنجەم: کەپێویستە ڕێز لەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ بگیرێ و بەمەزن و گەورە دابنرێ و ڕێزی لێبگیرێ لەبەرئەوەی قسەی پێغەمبەرە ﷺ وە ئەوقسەیەش نیگایە لەلایەن خوای بەرزوو بەڕێزەوە، وەکو دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾[1]

واتە: (ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیڵێ لەهەواو ئارەزووی خۆیەوە نییە بەڵکو تەنها سروش و نیگای خواییە).

جا پێویستە ڕێز لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بگیرێ و دروست نیە ڕەخنەی لێبگیرێو گاڵتە بەشتێکی بکرێ وە هەرکەسێکیش ئەوەبکات کە ڕەخنەو گاڵتەکردنە ئەوە هەڵگەڕاوەتەوە لە ئیسلام .

شەشەم: ڕێزگرتنی زانایان لەبەرئەوەی میرات گری پێغەمبەرن ﷺ، وە خوای گەورەش پلەو پایەیانی بەرز کردۆتەوە و پێگەیانی بەرز کردۆتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ﴾[2]

واتە: (خوا ئەوکەسانەتان باوەڕیان هێناوە بەرز دەکاتەوەو ئەوانەش زانستیان پێدراوە پلە گەلێ بەسەر باوەڕدارەکاندا بەرزدەکاتەوە چونکە ڕێز و شەرە فمەندی لای خوا تەنها بەباوەڕو زانستەوەیە).

---

[1] النجم: ٣ – ٤

[2] المجادلة: ١١

ئەوانە پەنا بەخوا کەوتونەتە ئەم تاوانەوە، ئەو پیاوە خراپە قسەی کردوو وتی: نەمان بینیوە وێنەی ئەم قورئان خوێنانە مەبەستی بە قورئان خوێنەکانی دەوری پێغەمبەری خواﷺ بووە وە هاوەڵەکانیشی بوو، وە لەو کاتەدا وتەی (قورئان خوێنەکان) زانایانی دەگرتەوە، لەبەرئەوەی لەوکاتەدا ئەوکەسەی قورئانی دەخوێندەوە زاناش بوو، بەلاّم لەم سەردەمە دوایەدا دەگونجێت کەسێ قورئان خوێنێ لەهەمان کاتیشدا هیچ لەواتاکانی قورئانە کەی کە دەیخوێنێت، وە لێیشی تێناگات بەڵکو بەس بەتەنها دەیخوێنێتەوە، لەبەرئەوەی لە نیشانەکانی ڕۆژی دوای ئەوەیە کە قورئان خوێن زۆر دەبێت بەلاّم شەرع زانان کەم دەبێت، بەلاّم لەسەردەمی یەکەمدا قورئان خوێنان لەهەمانکاتیشدا شەرع زانان بوون، جا وتەی کابرا کەوتی: نەمان بینیوە وێنەی قورئان خوێنەکانمان واتە زاناکان وە ئەوانیش پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی ڕەزای خوایان لێبێت بوو .

وە ئەوەی لەوەوە وەردەگیرێت ئەوەیە کەهەرکەسێ لەڕێزی زانایان کەمدەکاتەوە لەبەر زانستەکەیان لەهەرکاتێکدا ئەوە دەچێتەناو واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە لەبەر ئەوەی ئەوە وتی: نەمانبینیوە قورئان خوێنەکانمان، قورئان خوێنەکان: زاناکان بوون. وە ئەوەش زانایان لەهەموو کاتێکدا ئەو مانایەی لێوەردەگرین، وە زانایانیش ڕێزوو گەورەیی خۆیانیان هەیە لەبەرئەوەی ئەوان هەڵگری پەرتوکی خواو سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ، وە زانست هەڵدەگرن و فێری دەبن و دەیگەیەنن بەخەڵکی، جا بۆیە ڕێزگرتنیان پێویستە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( فضل العالم على العابد كفضل القمر على سائر الكواكب))[1]

---

[1] أخرجه أحمد (٥/١٩٦)وأبو داود (٣٦٤١)، والترمذي (٢٦٨٢)، وابن ماجه (٢٢٣)، والخطيب البغداي في الفقية والمتفقه (٥٩)، والبغوي في شرح السنة (١٢٩) من حديث أبي درداء رضي الله عنه وقال الحافظ في الفتح (١ / ١٩٣) له شواهد يتقوى بها.

واتە: ( گەورەیی زانا بەسەر خواپەرستەوە وەكو گەورەی مانگ وایە بەسەر هەموو هەسارەكانەوە) (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەڕۆشناییە زۆرەكەی مانگ بووە لەشەوی چواردەدا .. وەرگێڕ)

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((وإن العالم يستغفر له كل شي حتى الحيتان في البحر ))[1]

واتە: (كەسی زانا هەموو شتێ داوای لێخۆشبوونی بۆدەكات تەنانەت نەهەنگ لەدەریادا داوای لێخۆشبوونی بۆدەكات لەلای خودا ) . جا زاناش سەنگێكی خۆی هەیە، مەبەستیش بەزانایەكە كەزانابێت بەشەرعی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾[2]

واتە: (بەڕاستی لەبەندەكانی خودا هەر زاناكانن لەخوا ئەترسن و سەری نەوازشی بۆ دائەنەوێنن چونكە هەر ئەوانن دەزانن ئەو زاتە چ خاوەن دەسەلاَتێكە).

جا زانایان هەرئەوانەن خاوەن ترسن لەخوا لەبەرئەوەی ئەوان خوادەناسن بەڕاست ناسینێك، هەرئەوانە ڕێزی دەگرن و بەگەورەی دەزانن و لێی دەترسن، وە هەركاتێك مرۆڤ زانستی زیادبكات ترس لەخواشی زیاد دەكات، جابۆیە ڕێز لە زانایان بگیرێ و بەگەورەی دابنرێن، وەهەركەسێ بەكەمیان بزانێ ئەوا دەچێتە نێو واتای ئەم ئایەتەوە: ﴿قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾﴾[3]

واتە: (ئایە ئێوە بەخوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ گاڵتەتان كرد).

---

[1] تقدم تخريجه .

[2] فاطر: ٢٨

[3] التوبة: ٦٥

**حەوتەم:** ڕێزگرتنی هەموو موسوڵمان تاك و کۆیان .

**هەشتەم:** جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەی کە لە تەنها دانیشتنەکەدا قسەی کرد خوای گەورە حوکم و بڕیارەکەی گشتگیر کردو فەرموی: ﴿ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ٦٥ ﴾[1]

گاڵتە کردنەکەی دایە پاڵ هەموویان بۆچی؟لەبەرئەوەی نەبونە ڕێگر لەو کارە بۆیە حوکمەکە هەمویانی گرتەوە، لەبەرئەوەی لەکاتێکدا بێدەنگ بوون لەسەر خراپە بوونە هاوبەش لەگەڵ خراپەکاردا، وە لەبەر ئەوەش بوو لەو کاتەدا ئەو گەنجە ڕازی نەبوو بەوکارە یان بێتاوان دەرچوو لەو تاوانەدا و خوای گەورەش ڕاستگۆی دابەزاند لە پەرتوکەکەیدا، بەڵام ئەوانە ڕێگر نەبوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوکەسەی ئامادەی دانیشتنەکانی بێ باوەڕی و گاڵتەکردن دەبێت کەنیایدا گاڵتە بەئاین و بە پێغەمبەر ﷺ و بەهاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت بەزانایان دەکەن حوکمەکە ئەویش دەگرێتەوە.

خوای پاك و بێگەرد و بڵند دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾[2]

واتە: (هەر کە ئەو هاوبەش دانەرانەت بینی خەریکن لەبارەی ئایەت و نیشانەکانی ئێمەوە خراپ دەدوێن و گاڵتە دەکەن ڕویان لێ وەرچەرخێنە و خێرا هەستە و جێیان بهێڵە تا قسەکانیان ئەگۆڕن و واز لەو گاڵتە و مەسخەرە دێنن، ئەگەر شەیتان ئەم

---

[1] التوبة: ٦٥
[2] الأنعام: ٦٨

ئامۆژگاریەشی لەبیر بردیەوە لەگەڵیان دانیشتیت جادوای ئەوە، هەر کەبیرت هاتەوە ئیتر دوای ئەوە نابێ لەگەڵ ئەو خەڵکە ستەمکارە دانیشی، بەڵکو دەبێت زوو جێیان بهێڵی).

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾[1]

واتە: (خۆ بەڕاستی خوای گەورە لەم قورئانەدا بەئێوەی ڕاگەیاندوو کە هەرکات زانیتان و بیستان ئایەتەکانی خوا کەسانێك باوەڕیان پێناکەن و گاڵتەیان پێدەکەن، هەتا ئەوباسە دەگۆڕن و دەچنە سەر قسەیەکی ترو واز لەو کارەیان دێنن، ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن، ئەگینا ئێوەش لە گوناه و تاواندا وەك ئەوان دەبن، دیارە خوای گەورەش لەڕۆژی قیامەت دا گشت دوو ڕوو بێ باوەڕەکان لە دۆزەخدا کۆ دەکاتەوە، هەروەك ئەوان لەدونیادا قسەیان یەك بوو بۆ دژایەتی موسوڵمانان).

جا ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕێگری ناکات لە جنێودان بەخوا یان پێغەمبەر ﷺ و بەهاوەڵان یان جنێوی دا بەئاین یان جنێوی دا بەزانایان ئەوە وەکو جنێو دەرەکە وایە هەردووکیان وەکو یەکن لەبەرئەوەی خوای گەورە گاڵتە کردنەکەی دایە پاڵ کۆمەڵەکە لەگەڵ ئەوەی کەتەنها یەکێکیان بوو کە ئەو قسە ناشیرینانەی کرد وەك لە ئایەتەکەی سورەتی تەوبەدا ڕوون بوویەوە.

---

[1] النساء: ١٤٠

جا ئـەم ئایەتـە چـەندین پەنـدوو ئامۆژگـاری و بڕیـار و حـوکمی گـەورەی تێدایـە. پێویستە موسوڵمان لێی وردبێتەوە و بەدوا گەڕان و لێکۆڵینەوەی بۆ بکات لەبەرئەوەی نەکەوێتـە شـتێ لەوانـەی ئاگـاداری لەبارەیـەوە دراوە، ئەمانـەش چـەند کـارێکن لـەم ڕۆژگـارەدا لـەناو خەڵکـدا زۆرن، جاگاڵتـەکردن بـەئاین وبـەزانایان، گاڵتـە کـردن بەسـوننەتو قورئـان زۆرە، وە دەڵـێن قورئـان و سـوننەت بەکـەڵکی ئێـستا نایـەت و ناگونجێـت بـۆ ئـەم سـەردەمە، وە سـوننەت ناکرێتـە بەڵگـە لەبەرئـەوەی خـەڵکی گێڕاویانەتەوە هەروەکو چۆن هەواڵی تاك ناکرێتە بەڵگە و بە بەڵگە ناهێنرێتـەوە، وە جگە لەوەش لە قسە گەلێکی خراپ و پیس .

وەهەروەها لەوانەی دەنوسرێت لە ڕۆژنامەکاندا، وە پەخش دەکرێت یان بڵاو دەکرێتەوە لە هۆکارەکانی بڵاو کردنەوەو ڕاگەیاندندا لە بەکەم دانانی ئاینی ئیسلام و دەست درێژی کردنە سەری شتێکی زۆرە، ئەگەر ئەوە لە بێباوەڕانەوەبوایە ئەوە کارێکی تربوو لەبەر ئەوەی لەدوای بێباوەڕیەوە گوناهی تر نییەو بێ باوەڕی گەورەترینی گوناهەکان، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەوە لەکەسێکەوە ڕوو دەدات خۆی داوەتە پاڵ ئیسلام و دەڵێ موسوڵمانم و بانگەشەی بونی زانست دەکات و دەڵێت زانام، ئەوە حوکمە شەرعیەکان بەکەم دەزانێ و ئایەت و نیشانەکانی خوا بەڵگە شەرعیەکان بەکەم دەزانێ و دەڵێت ئەوانە گومان بەخشن و زانست و زانین ناگەیەنن. وە هاوشێوەی ئەوە لە قسە و وتەکانی خراپ و ناشیرین، یان قسەکردن لەبارەی زانایانەوە کەوتنە گیانیان و باسکردنی ناموسیان، وە دەڵێن ئەو زانایانە بەس زانان لە بواری خوێنی مانگانەو خوێنی دوای منداڵبوندا، وە ئەوانە زانای سوڵتانەکانن و خزمەتکاری دەسەڵات دارانن و سەرشۆڕکەرن وسەری موسوڵمانان نەوی دەکەن، وە هاوشێوەی ئەو قسە ناشیرینانە کە دوبارەی دەکەنەوە و دەینوسن و شاراوە نییە، وە

هەموو ئەوانە دەچنە ژێر واتای ئەو ئایەتە پیرۆزەوە، وە لەسەر خاوەنەكەی لەو هەڕەشەی كە خوای گەورە لەو ئایەتەدا باسی كردووە، وە خوای گەورە باسی كردووە كە بێ باوەڕان مەسخەرە دەكەن بە ئیمان داران و بەكەمیان دادەنێت وەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ ﴾[1]

واتە: (بێ گومـان ئەوانـەی بـەدكاربوون لـە دونیـادا پـێ دەكـەنن بەوانـەی بڕوایـان هێنابوو * وە كـاتێ بەلایانـدا تێدەپـەڕین سـرتە سـرتیان دەكـرد و چاویان لەیـەكتری دادەگـرت بەمەبەسـتی ئـازاردانی دڵ و دەروونـی بـڕوا دارەكـان * وە كـاتێكیش كـە دەگەڕانەوە بۆلای خێزان وماڵەوەیان بەخۆشی بردن بو بە گاڵتە كردنەكـەیان بـە بـڕوا دارەكان دەگەڕێنەوە * وە كـاتێ بـڕوا دارەكانیـان دەبینـی ئـەیان وت: بەڕاسـتی ئـەو كۆمەڵە بڕوا دارانە سەر لێشێواو گومڕان).

باوەڕداران وا باسدەكەن كـە گـومڕان، وە باسـی ئـەم ئاینـەش وادەكـەن كـە ئـاینی گومڕایە تیە، دەڵێن ئەو ئاینە ڕێگرە لەبەردەم شارسـتانییەتیداو پێشكەوتن و ژیاریـدا وە وێنەی ئەو قسانەو ئەوەش كە ئەو ئاینە ناگونجێنن بۆ ئەم سەردەمە .

وە هەروەها گاڵتە بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەكەن و دەڵێن توێكڵ و توێژاڵە وەك (ڕیش بەردانەوە و سمێڵ كورت كردنەوە) وە بە بـاوەڕداران دەڵـێن ئەوانـە خۆیـان بـە توێكڵـەوە خـەریك كـردووە، وە بـەكارهێنانی سـیواك لـە توێكڵـە، وە ڕێگـری لـە

[1] المطففين: ٢٩ – ٣٢

درێژکردنەوەی پۆشاك لە توێکڵە، وەدەڵێن واز لە خەڵك بێنن چی دەپۆشن با بیپۆشن. وە ڕوتی ئافرەت لە تەواو کاریەکانە و پۆشاکی داپۆشەری ئافرەتانیش ئەویش توێکڵە. کەواتە چی مایەوە ؟ئاین هەمووی بوە توێکڵ !! بەڵکو ئەوان دەڵێن کە هاوبەش دانان بۆخوا و گۆڕ پەرستی لە کارە سادە و ئاسانەکانە، ئەمە بیر و باوەڕیانە و ئازادن لە بیرو باوەڕی خۆیاندا، وە ئەوە لەڕێزگرتنی بۆچونی بەرامبەرە، ئەوانە کۆششکەرن و لێیان توڕە مەبن ڕێگریان مەکەن، هەموو ئەوانە دەوترێ ئێستا، وە ئەوەش گومانی تێدا نییە کە دژایەتی کردنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ وە بەکەم دانانی قورئانەکەی خوا و سوننەتەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ جا ئەگەر قورئان توێکڵی هێنابێت و سوننەت توێکڵبێت ئەی چی ماوەتەوە ؟

وە دەڵێن: بێ دینی مل نەدان و باوەڕ نەکردنە بە دروستکار کە خوایە .

لە وەڵامیاندا پێیان دەڵێین: هاوبەش دانان و پەرستنی جگە خوا ئایە لە گەورە ترین بێ دینی نییە؟ بەڵکو توند ترین بێ دینییە، ئەو کەسەی جنێو بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان دەدات ئەوە بێ دینی نییە، وە کەسێ جنێو بە هاوەڵان دەدات و دایکمان عائیشە ڕەزای خوای لێبێت بەکەم دەزانێ و بەوە تۆمەت باری بکات کە خوای گەورە بەدووری گرتووە لێی ئەوە بەکەم دانانە بۆ پێغەمبەر ﷺ و تۆمەت بارکردنییەتی. بەوەی کە لەناو خێزانەکەیدا خراپە هەیە و ئەویش ڕازی بووە بەو خراپەیە، داوا لەخوا دەکەین کە بمان پارێزێ، وە پەنا بەخوا کە خوا ژنێکی خراپی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ هەڵبژاردووە، وە ئائەوە بەکەم دانانی خواو پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە کە پێغەمبەر ﷺ ڕازی بووە پێی و ئەو خراپە کار بووە ئەوە بێ باوەڕیەکی ئاشکرایە لەوانەوە دەردەچێت پەنا بەخوا.

وە هەروەها ئەوانەی کە هاوەڵان بەکەم دەزانن ڕەزای خوایان لێبێت خوای گەورە بەدرۆ دەخەوە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەزۆر ئایەت دا ستایشی هاوەڵانی کردووە، وەکو دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾[1]

واتە: (لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان و چاک پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان، وە ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەردرەخت و کۆشکەکانییدا ڕوبار گەلێ دەچێت).

ئەو کۆچکەر و پشتیوانانە ئەوانە هاوەڵان بوون ڕەزای خوایان لێبێت، وە ئەوان دەڵێن هاوەڵان لەدوای پێغەمبەر ﷺ بێ باوەڕ بونەوە و کەسیان لەسەر ئاینی ئیسلام نەماوە جگە لە چواریان، ئەوە هیچ نییە تەنها بەدرۆ خستنەوەی خوای بەرزوو بەڕێزە کەدەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ﴾[2]

واتە: (محمد ﷺ پەیام بەروو ڕەوانەکراوی خوایە پێیان خۆشبێت یان نا، وە ئەو کەسانەشی لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەو کەوتوون لەبەرامبەر بێ بڕواکاندا ئازاو بەهێزن، لەناو خۆشیاندا بەسۆز و میهرەبان و دڵنەرمن دەیانبینیت هەردەم خەریکی ڕکوع و سوژدەن واتە زۆر خەریکی خواپەرستی و نوێژن بەشەودا شەونوێژ دەکەن و بەرۆژدا سوارچاکی مەیدان، هەموو کات ئاواتیان بەدەست هێنانی میهرەبانی خودایە، نیشانەیان لەشوێنەواری سوجدە بردنەکانیانەوە بۆ خوا لەڕوخسارياندا دیارە).

---

[1] التوبة: ١٠٠

[2] الفتح: ٢٩

ئەوان دەڵێن هاوەڵان بێ باوەڕن، پاك و بێگەردی بۆ خوا! بەخراپە باسی کەسێ دەکەن کەخوا ستایشی کردوون وە کەسێ بە بێ باوەڕ دادەنێن کەخوای گەورە سوپاس و ستایشی کردوون.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ [1]

واتە: (ئەو خەیرو دەسکەوتەیە بۆ ئەو هەژارە دورە وڵات و کۆچ کردوانەیە لەخانو سامانی خۆیان دەرکران لەلای مەککەیەکانەوە تا بەڵکو وردە وردە ژیانیان ڕاست بکرێتەوە و بگاتەوە ئاستی ئاسای خۆی پاش ئەوەی کە بت پەرستە مەککەییەکان هەڵیان فراندن ناچاریان کردن بە کۆچککردن داوای چاکەو ڕەزامەندی لەخوا دەکەن بۆیە نەیانتوانی لە مەککەدا بژین ئەگینا لەگەڵیاندا خۆیان دەسازاند، وە یارمەتی خولو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدەن بۆیە کۆچیان کرد ئا ئەوانە ڕاستگۆکان لەباوەڕو جیهادیاندا).

ئەوانە کۆچکەرانن پاشان لەبارەی پشتیوانانەوە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ [2]

واتە: (ئەو کەسانەی نیشتەجێی (دار الهجرة) و (دار الإيمان) ببون واتە پشتیوانان لەپێش کۆچی کۆچ کەریەکان، کۆچکەرەکانیان خۆشدەوێت و بەشێك لەدارای

---

[1] الحشر: ٨

[2] الحشر: ٩

خۆیانیان ئەدەنێ و دڵخۆشیان دەکەن و هیچ شتێکیان لەدڵدا نییە سەبارەت بەوەی بە کۆچ کەریەکان درا لە فەیئی بەنی نەزیر چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو هەموو دەسکەوتە تەنها بەشی سێ کەسیانیدا، لەگەڵ ئەوەشدا کەسێك نەبوو پێی ناخۆشبێت، وە ئیساری کۆچکەریەکان دەکەن بەسەر خۆیاندا لەسەروەت و ساماندا، ئەگەرچی خۆشیان نیازیان پێی هەبێت و هەژاربن، واتە بەخشینەکەیان لەبەر دەوڵەمەندیان نییە، بەڵکو سروشتی ئیمان و باوەڕیان بەرزەو هەرکەسێ لە سیفەتی رژدی دەرونی بپارێزرێ، واتە هەرکەسێ خوا بیپارێزێ لە چروکی دەرونی جا ئەوانەن براوەکان).

ئەوانە پشتیوانەکان و ئەمەش سیفەتیان پاشان فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾[1]

واتە: (ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتون، واتە لەپاش کۆچ کەران و یارمەتی دەرانەوە هاتوون دەڵێن: ئەی پەروەردگارەکەمان لە ئێمە و لەو برایانەی پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببەو هیچ بوغزو قینێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانە باوەڕیان هێناوە ئەی پەروەردگاری ئێمە بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان ).

بەڵام ئەگەر ئەوەی لەدوای ئەوانەوە بێت بڵێت پەروەردگار نەفرین بکە لە ئەبو بەکر و عومەر، وە نەفرین بکە لە عائیشەی دایکی باوەڕداران نەفرین لە فلان و فلان بکە لەهاوەڵان ڕەزای خوا لە هاوەڵان بێت، حوکمی ئەو کەسانە چییە لای خوای

---

[1] الحشر: ١٠

گەورە ؟!داوا لەخوا دەكەین بمان پارێزێت، بەڵام پێویستە لەسەر گەنجی موسوڵمان كە ئاگاداری ئەم شتانەبن و نەخەڵەتێن بەم بانگەشانە و بەم گومڕایەتیە و چەواشە كاریانە، وە هەركەسێ بڵێ كە موسوڵمانە ئەوە موسوڵمانە با شتی واشی لێ بوەشێتەوە كە ئیسلامەتیەكەی هەڵ بوەشێتەوەو جیاوازی ناكەن لەنێوان خەڵكیدا. ئێمەش دەڵێین ئێمە جیاوازی ناكەین لەنێوان چاكەكاندا و پاكە كاندا بەڵكو جیاوازی دەكەین لەنێوان پاك و پیسدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.[١]

واتە: (بڵێ: پیس و پاك، چاك و خراپ، حەرام وحەلاڵ، وەك یەك نین لای خو ئەگەرچی زۆرایی ماڵەپیس و خراپەكەش سەرسامت بكات، چونكە ماڵ و سامانێكی حەلاڵ و كەم زۆر باشترە لەماڵێكی زۆری حەرام، جا كەوایە هەمووتان هەر لەخو بترسن، ئەی خاوەن عاقڵ و ژیری !تا بەشكو لە دونیاو لە قیامەتدا بەختیار وسەر فرازبن).

جا ئێمە هەرگیز جیاوازی ناكەین لەنێوان موسوڵماناندا ئەوە دوورە لە كاری موسوڵمانەوە، بەڵكو ئێمەی موسوڵمان جیاوازی دەكەین لەنێوان پاك و پیسدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾[٢]

[١] المائدة: ١٠٠

[٢] الأنفال: ٣٧

واتە: (بۆ ئەوەی خوای کار دروست پیس و پاك لێك هەڵاوێری، موسوڵمان و کافر لێك جیابکاتەوە، وە مرۆڤی پیس و ناپاك خوانەناس و بێ دین لەسەر یەك هەڵبێ جا هەمویان لە دۆزەخدا کۆبکاتەوە بێ بەخت و زەرەر مەندی ڕاستەقینە هەر ئەوانن).

جا خوای بەرزوو بەڕێز جیاوازی کرد لەنێوان پاك و پیسدا، ئەوکەسەی جیاوازی ناکات لەنێوان پاك و پیسدا، یان ئەوەیە ژیری نییە تا بتوانێت جیاوازیان بکات و لێکیان جیابکاتەوە، یان ئەوەیە کەهەر باوەڕی نییە بۆیە جیاوازی ناکات لەنێوانیاندا، هەموو خەڵك لای ئەو یەکسانن و باوەڕی نییە تا بەهۆی باوەڕەکەیەوە جیاوازی بکات لەنێوان باوەڕداروو دووڕودا، وە لەنێوان بێ باوەڕ و موسوڵماندا و بێ دین و بێ بڕوا، جیاوازی نییە لای ئەو لەنێوان خەڵکیدا، ئەوەیان عەقڵی خراپ بووە یان ئەوکەسە بیرو باوەڕی خراپەو تێکچووە پەنا بەخوا، جا بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمان ئەمشتانە بزانێ و لەم ئایەتە وردبێتەوە: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾[1]

واتە: (پێیان بڵێ ئایە گاڵتەتان بەخوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە ؟واتە هەروتەیەکی کوفر و ناشیرین و ناقۆلا لەدەم دەرچێت بێ گومان مرۆڤ بێ باوەڕ دەبێت، برۆ بیانوی بێ جێ مەهێننەوە چونکە پاش ئەوەی باوەڕتانهێنا بێ باوەڕ بوونەوە).

پۆزش لەکەسێ وەرناگیرێ گاڵتە بەخواو پێغەمبەرەکە بکات ﷺ، وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێ جنێوبدات بەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ ی بێ بڕوا دەبێت .

---

[1] التوبة: ٦٥ – ٦٦

## زانایان باسیانكردووە گاڵتەكردن دابەش دەبێت بۆ دوو بەش

(گاڵتەكردنێكی ڕاشكاو بەووتن، وە گاڵتەكردن بەئاماژە)

وە گاڵتەكردن بەئاماژە وەك ئەوەی لێوی درێژبكات بەگاڵتە كردنەوە یان چاوی بۆ درێژبكات بەگاڵتە كردنەوە یان بە ئاماژە هێمای بۆدەكات كەبەكەمدانانو گاڵتەكردن دەبەخشێ، ئائەوە بەكەم دانان و گاڵتەكردن لەقەڵەم دەدرێت ئەگەرچیش قسەنەكات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾﴾[1]

واتە: (بێ گومان ئەوانەی بەدكاربوون لە دونیادا پێ دەكەنین بەوانەی بڕوایان هێنابوو * وە كاتێ بەلایاندا تێدەپەڕین سرتە سرتیان دەكرد و چاویان لەیەكتری دادەگرت بەمەبەستی ئازاردانی دڵ و دەروونی بڕوا دارەكان).

وە لەسەر موسوڵمانە كە ئاگاداری ئەم كارانە بێ و لەقسەی خراپ بەدووربێت، جا بەتایبەتی قسەكردن لەكاروباری شەرع و كۆمەڵی شەرع و زانایان، وە لەسەریەتی كە زمانی بپارێزێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾﴾[2]

واتە: (هەروتەیەكی لەدەم دەرچێت، فریشتەی چاودێری ئامادە لەلایەتی دەینوسێ).

وە هیچ كاتێك هەق لەبەتاڵ و پوچەڵ ناناسێو و نایزانێ مەگەر فێری زانستی بەسود بێت، وە بێگومان خوای گەورە جیاكەرەوەی دابەزاندووە كە قورئانە بۆ

---

[1] المطففين: ٢٩ – ٣٠

[2] ق: ١٨

جیاکردنەوەی هەق لە بەتاڵ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴾[١]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە !ئەگەر لەخوا بترسن و پارێزگاری بڕیارەکانی بکەن نورێکتان دەداتێ بتوانن چاك و خراپ لێك جیابکەنەوە و ڕێتان بۆ ڕون بکاتەوە).

خوای گەورە ڕوناکیەك دەخاتە دڵەکانتانەوە کە بەهۆیەوە بتوانن هەق لە بەتاڵی پێ جیابکەنەوە، جا قورئان جیاکەرەوەیەو جوداکاریە کەخوای گەورە دەیکاتە دڵی باوەڕدارەوە، هەروەها جیاکەرەوەیە هەق و ناهەقی پێ لەیەك جیابکاتەوە، جا بەهۆی ئەوەوە هیچ شتێکی لەهەق و ناهەق لێ تێکەڵ نابێ، وە پڕو پاگەندە و بانگەشەی گومڕاکاری و گومانە ڕازاوەکان کاریگەری لەسەر نییە، بەڵام ئەوە پێویستی بە بایەخدان و فێربوونە، وە پێویستی بە ئاگاداربوونە لە دوو ڕوەکان و بێ باوەڕەکان کە خۆیان خنیوەتە ناو ڕیزی موسوڵمانان، کە ئاگاداربێت ئامادەی دانیشتن و کۆڕەکانیان نەبێت وە ئەگەر ئامادەشبوو ئامادەیی تێدابێت بۆ بەرپەرچ دانەوەیان و ڕێگری قسەکانیان بکات و ڕەدی گومانەکانیان بداتەوە.

**نۆیەم:** ئایەتە پیرۆزەکە بەهەمان شێوە دەربارەی گاڵتەکارانە – بابەتێکی زۆر وردە ئەویش ئەوەیە کە هەرکەسێ جنێوبدات بەخوا یان پێغەمبەرەکەی ﷺ یان بەقورئانەکەی یان بەسوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوا پێ ی بێباوەڕ دەبێت ئیتر بەڕاستی بێت یان بەگاڵتەی بێت یان بۆ پێکەنین وابڵێت لەبەرئەوەی کارێکە کە

[١] الأنفال: ٢٩

گاڵتەکردن و پێکەنینی تیادانییە، جابۆیە دروست نییە گاڵتەکردن و بۆ خۆشی وتن لەو کارەدا، جا هەرکەسێ جنێو بدات بەخوا یان بە پێغەمبەر ﷺ یان بەقورئان یان بەهاوەڵان یان بەوانەی شوێنیان کەوتون لەخاوەن زانست وزانایان، ئەوە هەمان هەڕەشەی توند دەیگرێتەوە با بۆخۆشی بیڵێ لەبەر ئەوەی ئەوانەی ئایەتەکە لەبارەیانەوە دابەزی و وتیان: ﴿إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾[1]

واتە: (بەڕاستمان نەبووە بەڵکو تەنها گاڵتەو گەپمان دەکرد)

خوای گەورە بەهانەکەیانی وەرنەگرت و بەڵکو فەرموی: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾[2]

واتە: (پێیان بڵێ ئایە گاڵتەتان بەخوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی کردووە ؟واتە هەروتەیەکی کوفر و ناشیرین و ناقۆڵا لەدەم دەرچێت بێ گومان مرۆڤ بێ باوەڕ دەبێت، برۆ بیانوی بێ جێ مەهێننەوە چونکە پاش ئەوەی باوەڕتانهێنا بێ باوەڕ بوونەوە).

خوای گەورەکە بڕیارەکەی هەڵواسی بەتەنها گاڵتەکردنێکی ڕووت، جا گاڵتەکردن بەخواو پێغەمبەرەکەیﷺ، وە گاڵتەکردنیش بە ئایەتەکان یاری کردن و گاڵتەکردنی تیادا نییە، پێویستە ڕێزگرتنی ئەمشتانە و گاڵتە نەکردن پێیان و بەخۆشیەوە و بۆکوڕ پێ خۆش نەکردن نەبێت باسکردنیان تاپێیان پێکەنن.

---

[1] التوبة: ٦٥
[2] التوبة: ٦٥ - ٦٦

**دەیەم:** هەروەها ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەبێ باوەڕ دەبێت با نەشزانێ کە ئەوە بێ باوەڕییە، لەبەر ئەوەی کە ئەوانە نەیانزانی کەئەوە بێ باوەڕییە، ئەوانە خاوەنی باوەڕبوون وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ ﴾

واتە: (بێ گومان بێ باوەڕ بوونەوە لەدوای ئەوەی باوەڕتانهێنابوو) نەیانزانی کە بێ باوەڕییە خوا بەهانەی بۆ نەهێنانەوە بەوە، جا بۆیە بێ باوەڕ دەبێت با ئەوکەسەش نەزانێ کە جنێودان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئایەت و نیشانەکانی بێ باوەڕییە، ئەی چۆن ئەگەر کەسێ زانابێت؟کارەکە قورستر و توند ترە، ئەمە بابەتێکی گرنگە و کە هیچ جیاوازیەك نییە لەنێوان کەسێ بەڕاستی بێت یان گاڵتە بکات، وە لە نێوان نەزان و زانادا .

داوا لەخوا دەکەین کە ئیسلام و موسوڵمانان سەربخات وە دوژمنانی ئاین سەرشۆڕ بکات، وە سەلام و درودی خوا لەسەر پێغەمبەر موحەمەدﷺ و لەسەر هاوەڵانی هەمویان بێت.



پرسیار: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾ [١]

ئایە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا نییە کە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی کە کردار یان گفتار لەئیسلام دەردەچێت وە بەرپەرچدانەوەی مورجیئەی تێدا نییە؟

وەڵام: بەڵێ بێ گومان لە ئایەتەکەدا بەر پەرچ دانەوەی مورجیئەی تیادایە ئەوانەی کەدەڵێن کە بێ باوەڕ نابێت مەگەر لەکاتێکدا بەدڵی باوەڕی وابێت، وە ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەڕەهای بێ باوەڕ دەبێت ئیتر باوەڕی وابێت یان باوەڕی وانەبێت لەدڵیدا، وە کەسی گاڵتەکار لە دڵیدا باوەڕی بە گاڵتەکردن نییە و تەنها بەزمان دەیڵێ وە لەگەڵ ئەوەشدا خوای پاك و بێگەرد بەبێ باوەڕی داناوە، وەکو دەفەرموێت (بێ گومان بێ باوەڕ بوونە وە لەپاش ئەوەی باوەڕتان هێنابوو).

پرسیار: کەمترین گاڵتەکردن کامەیە کەخاوەنەکەی پێی بێ باوەڕدەبێت؟

وەڵام: کەمی نییە، کەمەکەی زۆرە پەنابەخوا هەموو ئەوەی کە گاڵتەکردن بێت بێ باوەڕییە: تەنانەت ئاماژە بەلێو ودەست و چاو، هەموو ئەوانە بە گاڵتەکردن دادەنرێت با قسەش نەکات.

پرسیار: ئایە لە فەرمایشتی خوای گەورەدا ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ﴾ مەبەستی ئەوەیە (ئایەتەکانی قورئان) یان هەموو نیشانەو بەڵگە گەردونییەکان ؟ مەبەستی لێی کامەیە؟

---

[١] التوبة: ٦٥ - ٦٦

وەلآم: نیشانە و بەڵگە گەردونییەکان هەن و بوونیان هەیە وە هیچ کەسێ گاڵتەیان پێ ناکات لەبەر ئەوەی شاخەکان و دارەکان و ڕووبارەکان دەبینی و بواری بەدرۆ خستنەوەی تیادا نییە لەبەرئەوەی جیهانێکی بینراوە، بەڵکو مەبەستی ئایەتەکە ئایەتە قورئانییە خوێنراوەکانە، وە مەبەستی نیگای دابەزێنراوە کە ئەمیش قورئان و سوننەتە .

پرسیار: بەشەکانی گاڵتەکردن کامانەن؟ وە ڕێکخەر کامەیە لە گاڵتەکردن بەزانایان؟

وەلآم: بەزۆری ئاشکرا لەسەر ئەوەیە کەسێ گاڵتە دەکات بە زانایان، ئەوانە گاڵتەدەکەن بەزانایان لەبەر ئەوەی زانستەکەیان هەڵگرتووە نەك لەبەر خودی خۆیان گاڵتەیان پێکەن، جا دەڵێ فلان شەلە یان کوێرە یان ئەوەیە لە لاشەیدا، ئەگەرچی ئەوە دروست نییە لە ماف و حەقی هەموو موسوڵمانێکدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ﴾ [1]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە !با هیچ کەلە پیاوێکتان گاڵتەو مەسخەرە بە کۆمەڵە پیاوێکی ترتان نەکات، لەوانەیە گاڵتە پێکراوەکان لای خوا لە گاڵتە چییەکان چاکتربن، وە هەروەها بەکۆمەڵە ژنێ لەژنانیش گاڵتە بە کۆمەڵە ژنانی تر نەکەن چونکە لەوانەیە ژنە گاڵتە پێکراوەکان لای خوا لە ژنە گاڵتە چییەکان باشتربن).

ئەو کەسە گاڵتەی بەزانایان نەکردووە تەنها لەبەر زانستەکەیان نەبێت.

---

[1] الحجرات: ١١

پرسیار: ئایە گاڵتەکردن بە پێغەمبەر ﷺ یەکسانە لەڕوی بڕیاردانەوە بەگاڵتـەکردن بەزانایان ؟

وەلاّم: گاڵتەکردن بە پێغەمبەر ﷺ توندترە بێ گومان، وە گاڵتەکردن بـەزانایانیش شتێکی خراپە لەبەرئەوەی ئەوان میراتگری پێغەمبـەرانن سـەلامی خوایـان لێبێـت، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((العلماء ورثة الأنبياء))[1]

واتە (زانایان میراتگری پێغەمبەرانن) سەلامی خوایان لێبێت.

جا کەسێ گاڵتە بەزانایان دەکات ئەوانەی میراتگری پێغەمبـەرانن سـەلامی خوایـان لێبێت بەدڵنیای یەوە گاڵتە دەکـات بـە پێغەمبـەران سـەلامی خوایـان لێبێـت لەڕێگـەی شوێنکەوتنیان لەبانگەواز و گەیاندنی ئاینی خوا بەخەڵکی، بۆچی گاڵتەیان پێ دەکـات ؟تەنها لەبەرئەوەی زانستیان بە میرات وەرگرتووە و هەڵیان گرتووە (واتە: گاڵتەکردنی ئەوان بەزانایان لەبەر خودی زاناکان نییە بەڵکو ڕقیـان لـە ئاینەکەیانـە و زانستەکەش لەهەمان ئاینە بۆیە ڕقیان لە هەڵگرانی ئاینەکەیە کە زانایانن ئەگەر ئەو زانایانـە واز لـە زاستەکە بێنن و بچن بۆلای ئەوان وە پەیڕەوی لەوان بکەن دەیانخەنە سەرچـاویان بـێ گومان و ڕێزیان دەگرن و پلەو پایەی دونیایان دەدەنێ .. وەرگێڕ) .

پرسیار: حوکمی کەسێ چییە کە گاڵتە دەکات بەئاین بۆ ئەوەی خەڵکی پێ بهێنێتە پێکەنین؟

وەلاّم: حوکمەکەی ئەوەیە کە بێ باوەڕە، ئـیتر بەڕاسـتی بێـت یـان بەگاڵتـەی بێـت کەگاڵتە بەئاین دەکات، یان خەڵکی دەهێنێتە پێکەنین بەگاڵتەکردنی بەئاین ئـەوە بـێ باوەڕ دەبێت لەدوای باوەڕ هێنانی، وە ئاین جێگەی گاڵتەپێکردن و مەسخەرە پێکردن نییە.

---

[1] جزء من حديث تقدم تخريجه .

# وانەی هەشتەم لەڕاڤەی هەڵوەشێنەری حەوتەم

**زانای پایە بەرز موحەمەدی كوڕی عبدالوهاب فەرمویەتی هەڵوەشێنەری حەوتەم: جادووە لەوانەش ژن‌و پیاو لە یەك كردن‌و ژن‌و پیاو لە لای یەك خۆشەویست كردن، جا هەركەسێك بیكات یان رازی بێت پێی بێ باوەڕە، بەڵگەش فەرمایشی خوای گەورەیە دەفەرموێت:** ﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾ البقرة: ١٠٢ **واتە: (وە لە هەمانكاتدا هەركەسێكیان فێری جادوو ئەكرد لەسەرەتاوە پێیان دەگوت: ئەم كارەی ئێمە تەنها بۆتاقیكردنەوەو فێربوونی جیاكردنەوەی موعجیزەو جادووەو لەلایەن خواوە نێردراوین، كەوابووئاگاداربەو خۆت بێباوەڕ مەكەو فێری جادوو نەبیت)**.

## ( ڕاڤە )

جادوو لە زمانەوانیدا: بریتییە لە شتێكی شاراوەو نهێنی، وە لەبەر ئەوە زانایان دەڵێن: جادوو ئەوەیە كە كەشاراوەو نادیارە هۆی شاراوەیی‌و نادیاریەكەی نەزانرێت.

وە لەوەش كە ئەو مانای هەبێت، بەرە بەیانە كە كۆتای شەوە، لەبەر ئەوە ڕۆژ بە نهێنی دەردەكەوێت لە یەكەمجاردا داپۆشراوە بە تاریكی شەو پاشان وردە وردە دەردەكەوێت تا جوان سپی دەبێت‌و ڕۆشن دەبێتەوە، وە ناسراوە بە (سَحَر) لەبەر شاراوەیی [1].

جادوو لە شەرعدا دابەش دەبێت بۆ دوو بەش، ئەوانیش:

١-جادووی راستەقینە.

٢-جادووی خەیاڵی.

جا ئەوەی كە راستە قینەیە لە جادوو: بریتیە لە كارێك كە كاریگەری لەسەر لاشەكان یان دڵەكان دروست دەكات، بە نەخۆش خستنیان یان بە مردن، یان كاریگەری لەسەر ئەندێشەو بیر دەكات بەوەی وا لە مرۆڤ دەكات خەیاڵی پێ دەكات كە كارێكی كردووەو لە هەمان كاتیشدا نەیكردووە.

یان كاریگەری لە دڵ دەكات‌و قین‌و ركە بەرایەتی تێدا دروست دەكات، یان خۆشەویستی ناسروشتی تیا دروست دەكات، ئا ئەو خۆشەویست كردنی ژن‌و پیاو و لە یەك كردنیانە، بەوەی سۆزێ لە مرۆڤدا دروست دەكات‌و خۆشەویستییەكی نا سروشتی بۆ هەندێك شت یان هەندێك كەس روو دەدات تیایدا، یان رق لێبوونی ئەو شتە یان لای ناشیرین‌و ڕقاوی دەكات، وەكو ئەوەی جیاوازی بخاتە نێوان پیاو ژنەكەی، یان یەكێكیان بكاتە خۆشەویستی ئەوی تریان وە ناسراوە بە (التوَلة).

---

١ تەماشای: فتح المجید لاپەڕە ٢٩٥ بكە چاپی: الافتاء .

(**التولَة**): بریتییە لە جۆرێك لە جادوو بۆ دروست كردنی خۆشەویستی یان بە پێچەوانەوە، ڕق دروست كردن لە نێوان ژن و پیاودا.

وە هەروەها جۆری دووەم لە جادوو چاو بەستكردنە: كە كاریگەری لە چاوەكان و بینینەكان دەكات شتی وا دەبینی كە پێچەوانەی ئەوەیە كە شتەكە خۆی لەسەریەتی.

جا لەوەی جۆری یەكەم ئەوەیە كە لە سورەتی (الفلق) دا هاتووە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ۝٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥﴾[1] واتە: (ئەی محمد ﷺ بڵێ: پەنا دەبەمە بەر پەروەردگاری سپیایی بەرەبەیان، ئەو خوایەی كە پەردەی نەبوونی لەت كردووەو بونەوەری لێدەرهێنا لە شەڕی خراپەی هەرچی كە دروستی كردووە، هەرشتێ خراپەی لێ بووەشێتەوە وە لە شەڕو خراپەو زیانی تاریكی شەو كە دادێت و هەموو شتێك دادەپۆشێ بەژێریەوەو تروسكایی لێ دەبڕێ و دەبێتە شەوە زەنگ وە لە شەڕو خراپەو زیانی ئەو كەسانەی كە جادوو دەكەن و فوو دەكەن بە گرێدا، چاو بەستكردنی موسوڵمانان و فێڵ و تەڵەكە كردن لێیان، ئێجگار كارێكی دزێو نالەبارو بەدو خراپە وە لەشەڕو خراپەو زیانی هەر حەسودێك كاتێ حەسودی و ئیرەیی دەباو هەمیشەو هەر خەریكی زیان گەیاندنە بە موسوڵمانان). ئەوە جادووی راستە قینەیە.

وە (**النفاثات**)كۆی (**نفاثة**)یە كە بریتییە لە گرێدان بە پەت و فوكردن پیایدا، وە مەبەستی ئەوە زیان گەیاندنە بە جادوو لێكراوەكە، وە لەوە ئەوەیە كەلە پێغەمبەر ﷺ روویدا، لە كاتێكدا (لوبەیدی كوڕی ئەعصەمی جولەكە) جادووی لێكرد، پێغەمبەر ﷺ وای لێهاتبوو كە وای دەزانی شتێكی كردووە لە هەمان كاتێدا نەیكردبوو،

---

[1] الفلق: ١ – ٥

كاریگەر بوو بە جادووەكە لەبەر ئەوەی پیغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێت مرۆڤن. ئەوەی توشی مرۆڤەكان دەبێت توشی ئەوانیش دەبێت، وە ئەوەش جۆرێكە لە نەخۆشییەكانو نەخۆش دەكەون، وە ئەوەی دوچاری مرۆڤ دەبێت ئەوانیش دووچاری دەبن.وە لەو شتەش جادوەو چونكە نەخۆشییە، خوای پەروەردگار دوو فریشتەی نارد بۆلای پێغەمبەر ﷺ بەو سورەتی فەلەقەوە چارەسەریان دەكرد، لە لایدا وەستانو یكێكیان وتی: ئەم پیاوە چییەتی؟ ئەوی تریان وتی: نەخۆشە، واتە جادووی لێكراوە. وتی كێ نەخۆشی خستووە؟ واتە كێ جادووی لێكردووە– وتی (لەبیدی كوڕی ئەعصەم لە بەنی زورەیق) لەشانەدا لە قژی تازە پێگەیشتنی خۆی لە ناو دارخورما لە ناو بیری (زەروان): بیرێك بوو لە ناو مەدینە لە ناو باخی جولەكەكان خۆیاندا، جا جوبرەئیل سەرلامی خوای لێبێت پاڕایەوە بۆیو بەم سورەتە﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ١﴾[1] چارەسەری بوو، پێغەمبەر ﷺ هەستا هەر وەك چۆن سەرلەنوێ چاك بوویەوە، جادووەكەی لێ رۆیشت، پاشان فەرمانی بە چەند پیاوێك كرد كە بڕۆن بۆلای ئەم بیرە ئەوانیش رۆیشتن جادووەكەیان لێ دەرهێنا كردیانەوەو بەتاڵیان كردەوە، وە بە پێغەمبەریانﷺ ووت: ئەی نایكوژین؟ پێغەمبەریش ﷺ (خوای گەورە چارەسەری منی كردوو شفای دام بێ گومان، حەزناكەم شەڕو ئاژاوە لە موسوڵمان بكەمەوە توشی ناڕەحەتیان بكەم)[2].

پێغەمبەر ﷺ وازی لەو پیاوە جادو گەرە هێناو لەبەر روونەدانی ئاژاوە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە شیاوی كوشتن بوو، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ نەیفەرموو دروست نییە بكوژرێ، یان شایەنی كوشتن نییە، بەڵكو فەرمووی: "حەزناكەم دەرگای شەڕو ئاژاوە لەسەر خەڵك بكەمەوە" واتە ئاژاوە دروست كردن، لەبەر ئەوەی ئەو كاتە

١ الفلق: ١

٢ اخرجه البخاري (٥٧٦٥) و مسلم (٢١٨٩) من حديث عائشة رضي الله عنها.

جولەکەکان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پەیمانیان هەبوو، ئەگەر بوایە پێغەمبەر ﷺ بیکوشتایە ئەوان شەڕو ئاژاوەو خراپەیەکی زۆر روویدەدا، وە گومانی تێدا نییە کە (دور خستنەوەی خراپەکاری لەبەر ترە لە دەستخستنی بەرژەوەندی ) لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ وازی لێهێنا، لەبەر ئەوە مەبەستەکە هاتە جێ کە ئەویش چارە سەرکردنی بوو ﷺ، ئەوە لەو جۆری جادووی راستەقینەبوو، کە کاریگەری هەیە لەسەر ئەو کەسەی کە لێی دەکرێت.

**وە هەرچی جادوی خەیاڵییە:** بریتیە لە جادوو کردن لە چاوەکان وە ئەوەش لە هەمان جۆرو چەشنە کە فیرعەون لەگەڵ موسادا سەلامی خوای لێبێت کردی، لە کاتێکدا کە هەموو جادوو گەرانی کۆکردەوە تا بەرامبەر موساو دەرئاساکانی لەگەڵیدا بووەستن، ئەو جادووگەرانە جادوی خەیالاویان کرد، لەبەر ئەوەی خوای بەرزو بەرێز فەرموویەتی: ﴿ قَالَ أَلْقُواْ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ ﴾[1]

واتە: (جا کە ئامێری جادووەکەی خۆیان هاویشت خەڵکەکەیان چەواشەو چاو بەست کردوو پێیان وابوو ئەو شتانە ئەوان هەڵیان داوە هەموو مارن) نەیفەرموو جادوویان لەخەڵك کرد بەڵکو فەرمووی (جادوویان لە چاوەکانی خەڵك کرد) وە هەروەها دەفورموێت: ﴿وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ﴾[2] واتە: ( بۆیە ترسانو ترسێکی بەتین کەوتە دڵیانەوە لە راستیدا لە پێش چاو ئەوانەوە جادوویەکی زۆر گەورەو مەزنیان نواند چونکە هەرکەسێك دەیبینی دەهاتە لەرزو دەترسا).

[1] الأعراف: ١١٦

[2] الأعراف: ١١٦

وە هەروەها خوای پاکو بێگەرد لە سورەتی (طه) دەفەمەوێت: ﴿قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾﴾[1] واتە: (جا پەتو گوریسو گۆچانەکانیان هەڵدایە گۆڕەپانی جادووەکەوە، ئەوەندە سەرسوڕ هێنەر بوو موسا وا گومانی برد کە جادووەکەیانو پەتەکانو گۆچانەکانیان دەجوڵێنەوەو دێنو دەچن وەکو کارێکی گەورە)

واتە موسا وایدەزانی کە جادووەکەیان کە گۆچانو گوریسەکانە دەڕواتو دەجوڵێتەوەو ڕێدەکات، ئەویش لە ڕاستیدا نەدوجولایەوەو نەدەڕۆیشت لە خودی گۆچانو گوریسەکاندا بەڵکو دەیانجولاندنەوە بەهۆی ئەو جیوەی کە کردبویان بەسەریاندو خستوبیانە ناو ئەو جیوەوە، هەروەکو لە ئایەتێکی تردا( جادوویان لە چاوەکانی خەڵکی کرد) ئەوە جادووی خەیاڵییەو هیچ ڕاستییەکی نییە، بە تەنها ڕۆیشتنی کاریگەریەکان لەسەر شتەکان دەگەڕێنێتەوە سەر بارە ئاساییەکەی خۆیان، وە لەبەر ئەوەشە جادوگەر دێت بۆلای هەندێك خەڵكو مێرو قالۆنچەو ئاژەڵی بچوك دێنێتو جادووی بەسەردا دەکاتو وای لێدێت وەکو مەڕی گەورەی لێدێت پاشان دوای کەمێك دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئاسایی خۆی،

وە لەوانەش ئەوەیە کەتەڵەکەبازانو گیرفان بڕەکان دەیکەنو دێن بۆلای هەندێ خەڵکی وەکو پەڕەی ئاسایی دێننو جادوو دەکەن لەسەریان.

وادەزانن کە پارەیە و لەبەرامبەریدا ئەو جادوو گەرانە بەو پارە ساختانە ماڵ و دارای خەڵك دەبەن بۆخۆیان، یان دێن بۆشوێنی پارە گۆڕینەوەو بەو پارە ساختەیەی

---

[1] طه: ٦٦

لایانە پارەی تر دەبەن بۆخۆیان (بۆنمونـە پـارەی سپی دەكـەن بـە دۆلار لەبەرچـاوی كابرای دوكاندا و لەبەرامبەریدا دینار یان تمەن یان هەردراوێكی دی دەبـەن بۆخۆیـان.. وەرگێڕ) پاشان لەدوای ئەوەی كەجادوو گەرەكە دەڕوات هەموو ئەوشتانە دەگەڕێنەوە بۆ باری ئاسایی خۆیان، كۆمـەڵێك پـارە كـە نرخیـان نیـە ئـەوە شـتێكی زانـراوە و زۆر ڕوودەدات لەلایـەن گیرفـان بـڕان و تەڵكەبازانـەوە ئەوانـەی كـەماڵ و دارای خـەڵكی بەهەوانتە و بەتاڵ دەبەن بۆخۆیان.

جا بەهەردوو جۆرەكەیەوە كۆنـە لـەناو مرۆڤایەتیـدا، خـوای گـەورە باسـی كـردووە لەناو گەلەكەی فیرعەون چۆندەكرێت، لەكاتێكدا كەموسا هات و سەلامی خـوای لێبێـت كە پەیامی پـەروەردگاری پێبـوو، وە چـەندین مـوعجیزەی پێبـوو كەبەڵگـەبوو لەسـەر ڕاسـتیەتی كـە گۆچـانێك دەبـوو بـەمار، وە دەسـتی كـەدەیكردە نـاو سـنگی لـەژێر پۆشـاكەكەیەوە سـپیایەك دەردەچـوو بـەبێ هـیچ دەردوو نەخۆشـیەك، ئەمـە موعجیزەبـوون لەلایـەن خـواوە هـیچ دەسـتێكی دروسـتكراوی مرۆڤـی تیـادا نـەبوو، لەبەرئـەوەی ئـەو موعجیزانـە لەلایـەن خـواوەن دەستێوەردانی مرۆڤـی تێـدا نیـە وە هەروەها مرۆڤەكان ناتوانن شتێ وا بكەن و بهێنن و بیكـەن لەوێنـەی ئـەو لەبەرئـەوەی لەلایە خـوای بـەرزو بـەڕێزە، وە پێغەمبـەر ﷺ نـاتوانێ كـەكاری لـەتوانا بـەدەربكات، بـەڵكو ئـەوە لـەلای خـوای بـەرزوو بەڕێزەوەیـە، ئـەوە كـەوادەكات كەلەسـەر دەسـتی پێغەمبەرەكەیەوە ڕوبدات وەك ڕاستگۆییەك بۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾[1]

---

[1] العنكبوت: ٥٠

واتە: (وتیان: جابۆ ڕاستی خۆی بۆ لەلایەن پەروەردگاریەوە چەند بەڵگەیەكی بۆدانەبەزێنراوە وەكو وشترەكەی صالح و داردەستەكەی موسا، تۆش پێیان بڵێ: هەموو بەڵگەو نیشانەكان هەرلای خوان و بەدەستی ئەون، من هیچ شتێكم بەدەست نیە).

جا پێغەمبەر ﷺ ناتوانێ كە بەڵگە و نیشانەیە بێنێ مەگەر ئەوە بێنێ كە خوا پێی ببەخشێ لەكارە لەتوانا بەدەرەكان واتە لە موعجیزەكان.

بەڵام جادوو ئەوە كرداری مرۆڤە و پیشەیەكە كەخەڵكی فێری دەبێت و تەكنیكی تیادا بەكار دەهێنن، وە ئەوەش لەكردەوەی شەیتانەكانە لەمرۆڤ و پەریەكان، وەموعجیزەنیە بەڵكو كاری لەتوانا بەدەری شەیتانیە، مرۆڤ دەتوانێت بیكات یان فێری بێت، بەڵام موعجیزە هیچ كەس ناتوانێت بیهێنەتەدی تەنها خوانەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِّن رَّبِّهِ ۖ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾﴾[1] واتە: (ووتیان: جابۆ ڕاستی خۆی بۆ لەلایەن پەروەردگاریەوە چەند بەڵگەیەكی بۆدانەبەزێنراوە وەكو وشترەكەی صالح ﷺ و داردەستەكەی موسا ﷺ، تۆش پێیان بڵێ: هەموو بەڵگەو نیشانكان هەرلای خوان و بەدەستی ئەون، من هیچ شتێكم بەدەست نیە وە من هەر بێدار كەرەوە و ترسێنەرێكی ئاشكرام).

جا ئایەت و نیشانەكان لەلایەن خوای بەرزوو بەڕێزن لەتوانای پێغەمبەردا ﷺ نیە كەبتوانێ بیكات و بیهێنێ، بەڵام جادوو لەتوانای مرۆڤدایە كەفێری بێت و دروستی بكات، موعجیزە هەق و ڕاستە بەڵام جادوو درۆ و پوچەڵە.

---

١ العنكبوت: ٥٠

وەلەبەرئەوەش بوو کاتێك کەمووسا ﷺ هات بەبەڵگەکان و موعجیزەکان بۆلای خەڵکی وتیان ئەوە جادووە وە موساش جادووگەرە وە فیرعەون وتی: ﴿ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ ﴾[1]

واتە: (جابەدڵنیای ئێمەش لەوێنەی ئەوی تۆ، جادوویەکت بۆدێنین).

هەموو جادوگەرانیان کۆکردەوە بۆ بەرامبەر کێ لەگەڵ موسادا و بەڵێنی رۆژێکیاندا بۆ ئەوکارە، وە خەڵکیان کۆکردەوە تابیبینن ئەوەی کە ڕودەدات لەنێوان موسا و جادووگەراندا، وە ئایە جادووگەران سەردەکەون بەسەر موسادا، یان موسا سەردەکەوێ بەسەر جادووگەراندا ؟وە ئەوەش لەئاسانکاری خوابوو بۆ دەرکەوتنی ڕاستی و سەرخستنی پێغەمبەرەکەی موسا ﷺ، کۆبونەوە و داوایان لەموساکرد کە ئەو یەکەم جار هەڵیبدات موساش پێی وتن، ئێوە هەڵیبدەن، ئەوانیش ئەوەی کەپێیان بوو لەجادووی گەورەو مەزن هەڵیانداو خەڵکیان بەو گوریس و گۆچانە ترساند و تۆقاند، هەتا موساش ﷺ لەو جادوە مەزنانە ترسا، خوای گەورەش باسی دەکات و دەفەرموێت: ﴿ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا ﴾[2]

واتە: (جا لەبەرئەوە موسا کە ئەوەی دیت لەدڵی خۆیدا کەمێك ترسا کە خەڵکەکە پاش ئەوکارەیە شوێنی نەکەون و بەکارەکەی ئەویش بڵێن جادوو * ئێمەش لەو کاتە ناسکەدا نیگامان بۆ کردوو وتمان: هیچ مەترسە !بەڕاستی هەرتۆ لەسەرتری * ئەوەی

[1] طه: ٥٨
[2] طه: ٦٧ – ٦٩

له ی ڕاستتدایه (گۆچانەكە) بیهاوێژه جا هەرچی ئەوانە كردویانە قوت ئەدا و ئەیپێچێتەوە).

ئەو گۆچانەی كەبەدەستیەوەبوو هاوێشتی، مارێكی گەورەی لێدەرچوو ترساندنی و هەرچی جادوو هەبوو لەدۆڵەكەدا دایان نابوو هەرهەمووی قوتدا، وە لەخۆشیان ترسان جادوو گەرەكان كەخۆشیان هەڵلوشێت، پاشان موسا ﷺ، گرتی و گەڕایەوە بۆ باری ئاساییەكەی خۆی و بووە بەگۆچان، لەوكاتەدا جادوو گەرەكان زانیان ئەوەی بەموسایە لەجادوو نییە، وەزانیشیان ئەوە لەكاری مرۆڤ نیە و ناتوانێ شتی وا دروست بكات، بەڵكو ئەوە تەنها لەلایەن خواوەیە، جابۆیە باوەڕیان هێناو گەڕانەوە بۆلای خوا و چونە كوڕنوشەوە بۆی خوای بەرزوو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿ وَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾[1]

واتە: (جادوو گەرانی فیرعەونیش گشت باوەڕیان هێنا و سوجدەیان برد. كەئەوەیان لەموسادی *وتیان وا باوەڕمان بە پەروەردگارەكەی جیهان هێنا *كە پەروەردگاری موسا و هارونیشە).

خوای گەورە فیرعەونی دەرخست بۆخەڵك لەوا هەڵوێست و دیمەنێكی گەورەدا، جا خوای گەورە فیرعەون و گەلەكەی دەرخست و ئەوەی كەپێیانبوو پووچی كردەوە و موعجیزەی خوای پەروەردگاری دەركەوت كە هیچ دەستێكی مرۆڤی تیانیە، لەوكاتەدا هێزوو خۆبەگەورە زانین و سەركەشی خۆی نواند و هەڕەشەیەكی توندی لەجادوو گەران كرد بەزەبروو زەنگی و هێزوو تواناى، بەڵام پاشان چی ؟ جادووگەران وتیان:

---

[1] الأعراف: ١٢٠ – ١٢٢

﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ٧٢ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ٧٣﴾[1]

واتە: (ساتۆ هەر بڕیار دەدەیت بەرامبەرمان بیدە، یان هەرچیت لەدەست دێ درێغی مەكە بەڕاستی تۆ هەر لەم ژیانی دونیایەدا دەستت دەڕواو دەسەڵات هەیە و كارێكت پێ دەكرێت * بێگومان ئێمە بڕوامان بەپەروەردگاری خۆمان هێنا تالەگوناهەكانمان خۆش ببێ، وە لەوجادوو گەرەیە تۆ سەپاندت بەسەرماندا ببورێ، وە خوا لەهەموو كەسێ چاكترو بەبە قاترە، بەڵام تۆ خۆت و دەوڵەتە كەت دوایتان دێت).

فیرعەون هەڕەشەی توندی لێكردن كە بیانكوژێ و هەڵیان واسێ بەقەدی دار خورماكاندا بەڵام ئەوان ئارامیانگرت و وتیان: ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ١٢٦﴾[2]

واتە: (ئەی پەروەردگارمان ئارامیمان بەسەردا بارێنەو بەموسوڵما نیش بمان مرێنە).

ئاكام هەر بۆ باوەڕداران بوو واتە بۆ پێغەمبەری خوا موسا ﷺ و بۆ باوەڕدارانیش ئەوەی لەگەڵیان بوون و ئارامیانگرت، هەق و ڕاستی سەركەوت و پوچەڵ بویەوە ئەوانەی ئەوان دەیانكرد، وە ڕون بویەوە كە موعجیزەكانی ئەوان لەگەڵ پێغەمبەراندان

[1] طه: ٧٢ – ٧٣
[2] الأعراف: ١٢٦

سەلامی خوایان لێ بێت ئەوانەی تەنها دروستکراوی خوان و خۆی بەدیان دەهێنێ و هیچ کەسێ لە مرۆڤەکان هەرکەسێ بێت لەتوانایدا نیە کە ئەو کارانە بکات وە فریشتەکانیش بەهەمان شێوە ناتوانن شتێ لەوانە بهێننە کایەوە، بەڵکو ئەوانە تەنها دروستکراوەکانی خوان و دەستکردی ئەون .

ئائەوە جیاوازی نێوان موعجیزەی پێغەمبەران و جادووە، جا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جادوو زۆر کۆنە لەناو مرۆڤایەتیدا، لەسەردەمی فیرعەون وەکو خوای گەورە لەقورئاندا باسی کردووە، وە دەشگونجێت لەپێش ئەوکاتەشدا هەبووبێت وە بێگومان جادوو مایەوە لەنێوان نەوەکانی ئیسرائیل دا، جالەبەرئەوە لەسەردەمی سولەیمان ﷺ کە پێغەمبەرێکی دەسەڵات دار بوو لەپێغەمبەرەکانی نەوەی یەعقوب ﷺ و پاشاکانیان، خوای گەورە پەری و جنۆکەی زەبەلاح و شەیتانەکانی بۆ ژێربار کردبوو. کەبەفەرمانی سولەیمان ﷺ کاریان دەکرد و گوێڕایەڵی بوون، لەبەرئەوەی خوای گەورە دەسەڵاتێکی دابویە کە بەهیچ کەسێکی نەدابوو لە جیهانەکاندا، لەکاتێکدا کە پرسیاری لە پەروەردگاری کردو ووتی: ﴿وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾[1] واتە: (پەروەرگارم دەسەلاتێکی وام پێ ببەخشە کەلەدوای من گیری هیچ کەسێك نەکەوێت، تابێتە موعجیزە و نیشانەی پەیام بەرێتیم)

وە لەو شتانەیە کە خوای گەورە جنۆکە گەورە زەبەلاحەکانی بۆ ژێربار کردبوو وەکو دەفەرموێت: ﴿ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ﴿٣٨﴾ ﴾[2]

---

[1] ص: ٣٥

[2] ص: ٣٧ – ٣٨

واتە (هەموو وەستا بەنایەك وژێر دەریایەك لەشەیتانەکانمان بۆ کەوی و ڕامکرد، تا هەندێکیان لەوشکانیدا بینا سازی بۆ بکەن و هەندێکیشیان سەرقاڵی بنی دەریاکان بن * وە هەندێکی تریشیان پێکەوە کۆت و زنجیر کرابوون، چونکە زیان بەخش بوون وە گوێڕایەڵ نەبوون بەڵێ ڕام و کەوی کردنی جنۆکە بۆ ئیش و کار و تەوق و زنجیر کردنی هەندێکیشیان، بۆخوای گەورە کارێکی زۆر سادە و ئاساییە).

سولەیمان ﷺ ڕەفتاری لەگەڵیاندا دەکردوو ئەوانیش کارە گەورە و مەزنەکانیان بۆدەکرد هەروەك و خوای گەورە باسی کردووە، پاشان لەدوای ئەوەی کە سولەیمان مردﷺ شەیتانەکان هاتن و وتیان: سولەیمان ﷺ نەیدەتوانی شەیتانەکان کەوی و ژێربار بخات تەنها بەجادوو نەبێت، ئەوە جنۆکە و شەیتانەکانی بەکار دەهێنا بەو جادوو دەیکرد، درۆیانکرد بەدەم سولەیمانەوە، وە خوای گەورەش سولەیمانی بەدوور گرت لەوە لەبەرئەوەی جادوو بێ باوەڕیەو شیاو نیە بۆ پێغەمبەری خوا سولەیمان ﷺ: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ ﴾[1]

واتە: (هەندێ لەنەوەکانی یەعقوبﷺ کەوتنە شوێنی ئەو جادووە، شەیتانەکانی سەردەمی پاشایەتی و دەسەلاتی سولەیمانﷺ دایان هێناو دەیان خوێند، واتە: کەوتنە شوێنی ئەو فرو فێلانەی دەربارەی حوکومەتەکەی سولەیمانﷺ دەیانکرد، خۆ ئاشکراشە سولەیمانﷺ بێ باوەڕ و جادوو گەر نەبوو ئەویش جادوو گەری دانەهێنا وەك ئەوان دەڵێن).

[1] البقرة: ١٠٢

واتە سولەیمانﷺ جادوو گەری نەکردووە و خوای گەورەش جادوو گەری بەبێ باوەڕ ناوبرد، فەرموی: ﴿وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾﴾[١]

واتە: (بەڵکو شەیتانەکان جادوو یان داهێنا و بێ بڕوا بوون و لەسنور دەرچوون وخەڵکیشیان فێری جادوو ئەکرد، هەروەها کەوتنە شوێنی ئەو زانیاری و زانستەی هاتبوویە سەر ئەو دوو فریشتەیە (هاروت و ماروت) لە بابلی عێراقدا، لەهەمان کاتدا هەرکەسێکیان فێری جادوو ئەکرد لەسەرەتاوە پێیان دەگوت: ئەم کارەی ئێمە تەنها بۆ تاقیکردنەوە و فێربونی جیاکردنەوەی موعجیزە و جادووە لەلایەن خواوە نێردراوین کەوابوو ئاگاداربە خۆ بێ باوەڕ مەکە و فێری جادوو نەبیت، بەڵام هەندێکیان هەر کۆڵیان نەدا تا لەو دوو فریشتە وە فێری ئەمەبوون کەبتوانن بەجادوو ژن و مێرد لێك بکەنەوە، بەبڕیاری خوا نەبوایە ئەو جادوو گەرانە توانایان نەبوو زیانێك بەهیچ کەسێ

[١] البقرة: ١٠٢ – ١٠٣

بگەیەنن، هەر فێری شتێ ئەبوون کەزیانیان لێ بداو هیچ قازانج و سودێکی نەبێ بۆیان، کە ئەو کارە ناپەسەندەشیان دەکرد وەنەبێ لەڕووی نەزانیشەوەبێت بەڵکو ئەو جولەکانە باش دەشیانزانی ئەوکەسەی کڕیاری جادوو گەر بێ، لەڕۆژی دوایدا هیچ کەڵك و سودێکی پێ ناگاو لەبەهرەی خوا بێ بەشە * خۆئەگەر ئەو جولەکانە بڕوایان بەبەرنامەکەی خوا هەبوایە وەکو پێویست وە لەسزایش پارێزیان کردبا دەیانزانی کە پاداشتێك لەلای خوایە باشترە بۆیان لەو قازانجە دونیاییەی چاوەڕوانیان ئەکرد ئەگەر بیانزانیایە و زانستی ژیرانەیان بخستایەتەکار).

لەم ئایەتەدا ڕون کردنەوەی ئەوەی تێدایە کەجادوو لەکرداری شەیتانەکانە وە شیاویش نیە بۆ سولەیمان ﷺ، پێغەمبەری خوایە و کوڕی پێغەمبەری خوایە، بەڵام ئەوە لەدرۆو دەلەسەکانی جولەکەکانە کەشەیتانەکان بۆیان هاویشتوون، هەر لەبەرئەوەشە کەدانەر کردویەتیە بەڵگە لەسەرئەوەی کەجادوو بێ باوەڕییە.وە لەسەرئەوەش کەیەکێکە لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام لەچەندین شوێندا:

<u>یەکەم</u>: فەرمایشتی (وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ) واتە: جادووی نەکردووە لەبەرئەوەی جادوویێ باوەڕییە و گونجاو شیاویش نیە بۆ پێغەمبەری خوا.

<u>دووەم</u>: فەرمایشی (لَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەفێربوونی جادوو بێ بڕواییە، وە ئەوە لەفێرکردنی شەیتانەکانەو، وە بەشێك نیە لەفێربوون و زانستەکانی پێغەمبەراندا سەلامی خوای لێ بێت.

<u>سێ یەم</u>: فەرمایشی (مَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ) واتە دوو فریشتەکە (حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ) واتە فێری جادوو مەبن چونکە بێ باوەڕ دەبن، جا هەرکەسێ فێری جادوو ببێ بێ باوەڕە.

چوارەم: فەرمایشی خوای گەورە (وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ) بەڵكو ئەوە لەماف وهەقی بێ باوەڕاندایە لەبەرئەوە بێ باوەڕ هیچ بەشێكی نیە لەدوارۆژدا واتە لە بەهەشت دا.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جادوو بێ باوەڕییە و ڕێگرە لەچونە ناو بەهەشت.

پێنجەم: فەرمایشتی خوای گەورە (وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُواْ واتَّقَوْاْ) ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جادوو باوەڕ و پارێزگاری ناهێڵێ .

ئەمە هەموو شوێنەكانە لەئایەتەكاندا بەڵگەیە لەسەرئەوەی كەفێربوونی جادوو فێركردنی بێ باوەڕییە، وە هەركەسێ باوەڕ بگۆڕێ بە بێ باوەڕی ئەوە بێ باوەڕە، وە كە هیچ بەشێكی بۆنیە لەبەهەشتدا واتە ناچێتە بەهەشتەوە، وە كە هەركەسێ فێری جادوو بێت باوەڕەكەی نامێنێت

( وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُواْ واتَّقَوْاْ ) بەڵگەیە لەسەرئەوەی كە جادوو باوەڕ ناهێڵێ و هەڵوەشێنەرێكە لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلامیش ئەمە ڕووی بەڵگە هێنانەوەكەی زانای پایەبەرز محمد بن عبدالوهابە بەم ئایەتانە .

بەلاَم دەگونجێ كە بڵێی: چۆن فریشتەكان جادوو یان فێر دەكرد فێركردنی جادووش بێ باوەڕیە ؟

دەڵێین: ئەوە تاقی كردنەوەیە لەلایەن خواوە تاقی كردنەوەیشە بۆ مرۆڤ كە كێ باوەڕ دەهێنێ و كێش بێ باوەڕ دەبێ ؟

ئەوانە دوو فریشتەبوون خوای گەورە دایبەزاندن بۆ فێركردنی جادوو لەپێناو تاقی كردنەوەی خەڵكیدا كە كێ باوەڕ دەهێنێ و كێش بێ باوەڕ دەبێت ؟ وە لەبەرئەوە

هیچ کەسێکیان لەخەڵکی فێر نەدەکرد (هەتا دەیانگوت: ئەم کارەی ئێمە تەنها بۆ تاقی کردنەوەو فێربونی جیاکردنەوەی موعیجزەو جادووە لەلایەن خواوە نێردراون کەوابوو ئاگادار بەوخۆت بێ باوەڕ مەکە فێری جادوو نەبێت)

ئەوانە ئامۆژگاری فێرخوازیان دەکرد بەوەی واز لە فێربوونی جادوو بهێنێ، وەڕونیان دەکردەوە کە ئەوە بێ باوەڕییە، ئەوانە خەڵکیان فێر نەدەکردو بێ دەنگ بن بەڵکو ئامۆژگاریان دەکرد بەوەی ئەوە بێ باوەڕییە جا ئەگەر بە ویستی خۆی هەڵی بژێرێ بێ باوەڕ دەبێت، خوای گەورە دوو فریشتەکە وای لێکرد کە خەڵکیان فێری جادوو دەکرد لەپێناو تاقیکردنەوەی خەڵکی نەك لەبەرئەوەی کەجادوو قەیناکەو ڕێگە پێدراوە، بەڵکو لەپێناو ئەوەی کەڕونی بکەنەوە کێ بێ باوەڕ دەبێ و کێ باوەڕ دێنێ و کێ ئامۆژگاری وەردەگرێ .

لەوەوە زانیمان کەجادوو فێربونی و فێرکردنی هەردوو کیان بێ باوەڕییە.

زانای پایەبەرز فەرموی (یان ڕازی بێت پێی) ئەگەر فێری نەبێت و نەیکات بەڵام ڕازی بێت پێی و ڕێگری نەکات ئەوە بەهەمان شێوە بێ باوەڕدەبێت بەتەنیا ڕازی بوون پێی، لەبەرئەوە هەرکەسێك ڕازی بێت بەبێ باوەڕی ئەوە بێ گومان بێ باوەڕە، جا کەسی باوەڕداریش ڕازی نابێت بە بێ باوەڕی.

***کەواتە جادوو بێ باوەڕییە***: فێربوون و فێرکردنی و کارپێکردنی و ڕازی بوون پێی، هەموو ئەوشتانە، ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەپێویستە ڕێگری کردنی جادوو جادوو گەران وە لادانیان و نەهێشتنیان لەکۆمەڵگەدا لەبەرئەوەی شەڕو خراپەی تیادا بڵاو نەکەنەوە هەر لەبەر ئەوەشە چەندین فەرمودە لەو بارەیەوە هاتووە

بەفەرمانکردن بەکوشتنی جادوو گەر پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((حد الساحر ضربه بالسيف))[١]

واتە (سزای جادوو گەر کوشتنیەتی بەشمشێر) هاوەڵان کرداریان بەوە کردووە جادوو گەرانیان کوشتووە .

وە عومەر ڕەزای خوای لێبێت فەرمانی نوسی بۆ کارگەرانی کە هەموو جادوو گەرێك لەژن و پیاو بکوژن [٢].

وە دایکی باوەڕ داران (حفصەی کچی عومەر) فەرمانی کرد بە کوشتنی کەنیزەکێ کە هی خۆی بوو جادوی لێ کردبوو [٣].

وە جندوبی کوڕی کعب کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو ﷺ جادوو گەرێکی کوشت بە ئامادەبونی یەکێ لە دەسەڵات دارانی (بەنی ئومەییە) لەکاتێکدا کە هاتوو بینی جادوو گەرێك یاری دەکات لەلای فەرمان ڕەواکە، خەڵکی دەخەڵەتێنێ بەوەی کەسێ دەکوژێو پاشان زیندوی دەکاتەوە، سەری دەپەڕاندوو پاشان چاکی دەکردەوە – لەڕوی جادووی خەیاڵیەوە – ئەو جادوو گەرە هیچی نەکردووە تەنها خەڵکی

---

١ أخرجه الترمذي (١٤٦٠)، والطبراني في الكبير (١٦٦٥)، والدار قطني (٣/١١٤) والحاكم (٤/٣٦٠) من حديث جندب رضي لله عنه .وهو ضعيف مرفوعاً صحيح موقوفاً على جندب قال الترمذي : (والصحيح عن جندب موقوفاً)

٢ أخرجه أحمد (١٦٥٧) و أبو داود (٣٠٤٣) وقال العلامة سليمان بن عبدالله في تيسير العزيز الحميد (٣٩٥) : (إسناده حسن)

٣ أخرجه عبدالله إبن الأمام أحمد في مسائله عن أبيه (١٥٤٣) والبيهقي في الكرى (١٦٩٦٧) و صححه و شيخ الأسلام محمد بن عبدالوهاب في (كتاب التوحيد)

خەڵەتاندووە، جا جوندوبی كوڕی كەعب لێی نزیك بویەوە هەتا بەشمشێر لێی داو سەری پەڕاند و فەرموی (ئەگەر ڕاست دەكات با خۆی زیندوو بكاتەوە) [١].

وە لەبەر ئەوەیە كە پێشەوا ئەحمد ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت: دروستە كوشتنی جادوو گەروو بەڕاستی هاتووە لە سێ لەهاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ كە ئەوانیش (عومەر و حەفصەو و جوندوبی كوڕی كەعب)ن ڕەزای خوایان لێبێت.

وە ئەگەر كەسی جادوو گەر وا دەریشی بخات كە تەوبەی كردووە و گەڕاوەتەوە ئەوە لێی وەرناگیرێ، بەڵكو سزای لەسەر جێ بەجێ دەكرێت، لەبەر ئەوەی متمانە ناكرێت بە تەوبەكەی لەبەرئەوەی بێ باوەڕە، دەگونجێت وا دەریبخات كە تەوبەی كردووە و لەدڵیدا هەر جادوو هەیە دەكوژرێ بەهەرحاڵ با ڕاستگۆش بێت لەتەوبەكەیدا لەنێوان خۆی و خوادا، خوای بەرزوو بەڕێز تەوبەكەی وەردەگرێت، بەلأم ئێمە سزای جادووی بەسەردا جێ بەجێ دەكەین و دەیكوژین بەهەرحاڵ تەوبە بكات یان نەیكات بەوەش پوچەڵێتی جادوومان بۆ دەردەكەوێت و ئەوە بێ باوەڕی گەورەیە لەڕیزی موسوڵمان دەردەچێت بەئەنجامدانی و هەڵگەڕانەوەشە لەئاینی ئیسلام و لە هەڵوەشێنەرەكانی ئیسلامیشە، وە سزای خاوەنەكەشی كوشتنە لەهەموو بارو دۆخێكدا لەبەرئەوەی كۆمەڵگەكان خراپ و بێ كەڵك دەكات و دوژمنایەتی و ڕق وكینە و خراپەكاری لەنێوان خەڵكدا بڵاو دەكاتەوە، وە هەر لەوەشە دەزانین ئەوەی كەدەكرێت لەڕووی (یاری سێرك)وەكو ناوی دەنێن یان لەڕووی (یاریە پاڵوانیەكانەوە)

---

١ أخرجة البخاري في التاريخ الكبير (٢ / ٢٢٢)، و البيهقي في الكبرى (١٦٩٧٠) و (١٨٧) و صححه شيخ الأسلام محمد بن عبدالوهاب في كتاب التوحيد وقال العلامة سليمان في تيسير (ص ٣٩٦) عن هذه القصة (ولها طرق كثيرة).

دێنن جادووگەر لە ئاهەنگەكان و سەیرانگاكادا وە لەكاتی گەشت و گوزاردا تا كاری سەیر و سەرنج ڕاكێش ئەنجام بدات ئائەوە جادوی ڕاشكاوە با بەجگە لەناوی خۆیەوە ناوی بنێین، وە هەر بەهەمان شێوە بەوەدا دەزانن كە دروست نیە ڕێگە دانان و دان پیانانی جادوو لەكۆمەڵگەی ئیسلامدا بەهیچ شێوەیەك، دەگونجێ كەبوترێ ئەوانە چارەسەری نەخۆشیەكانە دەكەن و ناوی دەنێن (چارەسەری خۆماڵی) ئەوە جادووە. ناوی دەنێن بەناوی چارەسەر و چارەسەر دەكەن لەهەمان كاتدا ئەوانە جادوو گەرو نەزانن و ناویان دەنێن (زاناكان و شێخەكان) بەلاّم ئەوانە جادوو گەرن، وە خەڵكی ئاسایی باوەڕیان وایەئەوانە پزیشكن و زانان.

وە هەروەها دروست نیە بەكارهێنانی جادوو بەناوی یاریە پاڵەوانیەتیەكان یان (سێرك) یان هاوشێوەی ئەوە، وەك ئەوەی كە سەیارە بەقژی ڕادەكێشێت، یان ئەو كەسەی سەیارە دەڕوات بەسەریداو هیچیشی لێناكات، یان بەشیش و سیخ چاوی پێ بریندار دەكات و دەیكات بەناو چاویدا و هیچ زیانی لێنادات یان خۆی زامدار دەكات بەچەقۆ یان لەبەرچاوی خەڵكیدا ئاگر دەخوات ئائەوانە هەمووی درۆزن و بەشێكن لە جادووی خەیاڵی جا دروست نیە كردن و ڕازی بوون پێی وە دروست نیە ئەوكەسانە بهێنرێن تا ئەو جۆرە كارانە بكەن لەبەردەم موسوڵماناندا، لەبەرئەوەی خراپە كاریەكی ئاشكرایە پێویستە ڕێگری بكرێت و نەهێڵرێت و وڵاتی موسوڵمانانی لێ پاك بكرێتەوە.

بابەتێك: لە حوكمی هەڵوەشاندنەوەی جادوولەجادوو لێكراو گومانی تێدا نیە كە جادوو دوو چاری مرۆڤ دەبێت و نەخۆشیە پێویستی بەچارەسەر هەیە، وە خوای بەرزو بەڕێز هیچ دەردێكی نەناردۆتە خوارەوە ئیلا چارەسەریشی بۆناردۆتە خوارەوە، جابەچی چارەسەری جادوو لێكراو بكەین ؟چارەسەری دەكەین

بەچارەسەری شەرعی وە پێغەمبەر ﷺ چارەسەركراوە بەخوێندنی دوعای شەرعی بەسەریدا، جیبریل چارەسەریكرد بەخوێندنی سورەتی فەلەق، جا چارەسەری نەخۆشەكە دەكرێت بەخوێندنی دوعاكان و دەرمانە شەرعیەكان، ئەوە قەیناكە، لەبەرئەوەی هەڵوەشاندنەوەی جادوو لەجادوو لێكراو بەوەی خوای بەرزوو بەڕێز بەشەرعی داناوە، وە خوای گەورە هیچ دەردێكی نەناردوە لەگەڵیشیدا دەرمان و چارەسەری بۆناردووە.

بەڵام چارەسەری جادوو بە جادووی هاو وێنەی خۆی دروست نیە، وەچارەسەرە بەوەی خوا قەدەغەی كردووە، بەڵكو چارەسەر كردنە بەبێ باوەڕی، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((تداووا ولا تداووا بحرام))[1]

واتە (خۆتان چارەسەر بكەن وە خۆتان بەشتی حەرام چارەسەر مەكەن) وە جادوو لە گەورەترین قەدەغە كراوەكان جا چۆن جادوو لێكراوی پێ چارەسەر بكەین، وە عبدللای كوڕی مسعود دەفەرموێت: ((إن الله لم يجعل شفاءكم فيما حرم عليكم))[2]

واتە(خوای گەورە چارەسەرتانی لەوەدا دانەناوە كە قەدەغەی كردووە لەسەرتان)

وە جادوو لە توند ترین قەدەغە كراوەكانە جا بۆیە دروست نیە كە جادوو لێكراوی پێ چارەسەر بكەین، بەڵام چارەسەری جادوو لێكراو دەكەین بەوەی چارەسەری هەموو نەخۆشیەكانی پێ دەكەین بە خوێندنی قورئان و خوێندنی دوعاكان و پەنا گرتنە شەرعیەكان وەكو هەردوو سورەتی (ناس و فەلەق)و دەرمانە ڕێگە دراوەكان،

---

١ أخرجه أبوداود (٣٨٧٤) .من حديث أبى درداء رضي الله عنه .

٢ أخرجه البخاري تعليقاً (١٠ / ٨١ – فتح) وقد ذكر الحافظ إبن حجر هناك من وصله لأسانيد قال عنها: صحيحة.

ئابەوە چارەسەری جادوو لێکراوی پێدەکرێت، جا هەرچی دەوترێ بە پێچەوانەی ئەوەوە بەدروستی هەڵوەشاندنەوەی جادوو بە جادوو هاوشێوەی خۆی قسەیەکی بەتاڵ و پووچ ڕەد کراوەیە، دروست نیە وەرگرتنی و بەگوێ کردنی، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی بەڵگە شەرعیەکانە لەقورئان و سونەتی پێغەمبەر ﷺ وە ئەوەی پێویستە پاك کردنەوەی کۆمەڵگا موسوڵمانەکانە لە جادوو گەران و کارو کردەوەکانیان و کەناتوانن بمێننەوە لەوڵاتداو لەنێوان خەڵکیدا تا جادوو بڵاو بکەنەوە لەنێوان خەڵکیدا. وە پێویستە دژایەتی کردنیان و نەهێڵانیان، وە هەرکەسێ زانرا کە کاری جادوو گەریەتی دەکات، ئەوە دەدرێتە دادگا تاپاداشتی شەرعی کردەوەکەی وەرگرێ. تاخەڵکی و بەندەکانی خوا و وڵاتیش لەدەستیان بحەوێتەوە و دڵنیابن لەخۆیان. دروست نیە بواریان بۆ بکەینەوە و پێشیان بخەین و ڕێزیان لێبگرین و بەرگریان لێ بکەین و بڵێین: وازیان لێ بێنن با خەڵکی چارەسەر بکەن، ئەوە جادوو دێنن وە بەکاری دەهێنن و بەوەش خراپەکەمان خراپتر کرد و جادووەکەشمان زیاتر ڕەواج پێداو زیادی کرد.




پرسیار: حوکمی هەڵوەشاندنەوەی جادوو بەجادووی هاو وێنەی خۆی چیە؟ یان ڕۆیشتن بۆلای ئەوە ؟وە لەوە دەچێت کە ئەوە درابێتە پاڵ دانپیانانی زانای پایەبەرز (إبن باز) وە کەئەوە هەبێت لە پەرتوکە کانی فیقهداو لای شوێن کەوتوانی پێشەوا ئەحمەد (الحنابلة)؟

وەلاَم: هەرچی سەبارەت بەدانە پاڵی ئەو قسەیە بۆلای زانای پایەبەرز (إبن باز) درۆیەکی ڕاشکا و ڕوونە لەبەرئەوەی خودی ئەو زانایە (إبن باز) فەتوای داوە بەقەدەغەکردنی جادوو، وە دروستیش نیە چارەسەرکردنی پێی و نامەیەکیشی هەیە کەناملیکەیەکە بەناوی (إقامة البراهن في الرد على المشعوذين والسحرة والدَّجالين)

(تێبینی – ئەم پەرتوکە بەنرخە ئێستا بەزمانی کوردی هەیە لە پەرتوک گەکاندا خوێندنەوەی بەسودە بۆ خۆپاراستن لێیان .. وەرگێڕ)

ئەم پەرتوکە هەیە لەوەلاَمدانەوەکانیدا و لەفەتواکانیدا ڕەحمەتی خوای لێبێت، وە سەبارەت بەو قسەیەی کە دروستە هەڵوەشاندنەوەی جادوو بەجادووی هاو وێنەی خۆی، درۆیە بەدەم زانای پایەبەرزەوە کراوە، بەلاَم بەوەی هەندێ لەزانایانی سەردەمی کۆن وایان وتووە، ئەوە هەموو لە قسەکانی وەردەگیرێ و ڕەدیش دەکرێتەوە، جا دروستنیە قسەی فەتوا دەران وەریگرێ لەکاتێکدا پێچەوانەی قورئانو سوننەتە و ناشبێتە بەڵگە ئەو جۆرە قسانە، بەڵکو بەڵگە ئەوەیە کە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگیرابێت یان کۆدەنگی موسوڵمان (واتە زانایانی موسوڵمانان لەسەردەمێکدا).

پرسیار: هەندێ دەڵێن لەچارەسەرکردنی جادووی ڕەشی ئەوەی لەژن و پیاو دەکرێ بۆ جیا کردنەوەیان ئەوەیە کە پیاوەکە یەك جار تەڵاقی ژنەکەی بدات، پاشان جادووەکە هەڵ دەوەشێتەوە بەئیزنی خوا، پاشان پیاوەکە دوای ئەوە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆلای خۆی، ئایە ئەو کارە ڕێدراو دروستە ؟ وە ئایە لە شەرعدا شتی و هەیە ؟ وە بەچی بەڕێزتان ئامۆژگاری دەکەن ؟

وەڵام: زانایان شتی وایان نەوتوە من پێی بزانم، وە ئەم قسەیەش ڕاست نیە. چارەسەری جادوو بەتەڵاقدان نابێت، هەڵوەشاندنەوەی جادوو بەچارەسەری شەرعی دەبێت نەك بەتەڵاقدان، وە خوای بەرزوو بەڕێز ڕقی لە تەڵاقەو پێی ناخۆشە، بەدەر لەوەی ئەگەر پێویستی وا داوایکرد لەنەگونجانی پێکەوە ژیانی نێوان ژن و مێردایەتی یان لەنێوان یەکدا ڕێك نەدەکەوتن، بەڵام لەپێناوی چارەسەردا تەڵاقی بدات ئەوا هیچ کەسێ لە زانست و زانایان نازانم شتی وای وتبێ.

پرسیار: ئەگەر جادوو یەکم بینی، ئایە هەڵی دەوەشێنمەوە بەسوتاندن یان بەدڕاندن و لەتو پەت کردن ؟

وەڵام: ئەگەر جادوو یەکت بینی بیکەرەوە ئیتر بەسوتاندنی بێ بەئاگر یان بەدڕاندنی و لەت و کوت کردنی، گرنگ ئەوەیە کەنەیهێڵیتەوە .

پرسیار: باس دەکرێت لە هەندێ ولاتدا کە کەسێ هەڵدەستێ لەناو کۆمەڵێ لەخەڵکدا کاری کاریگەرە وهەژێنەرە نمایش دەکات وەکو ئەوەی شمشێرێ یان چەقۆیە دەکات بەسکیدا بەبێ ئەوەی کاری تێبکات وە هیچی لێبێت، وە جگە لەوەش لەجۆرە کردارێ کەبەڕاست دانانرێ ڕوودانی لەژیانی ئاسایی خەڵکدا، ئایە حوکمی شەرع چیە دەربارەی ئەم کردارانە ؟

وەڵام: ئەوە جادووگەرە و درۆزنە، وە ئەو کردارەیش لەجۆری جادووی خەیاڵیە ئەوە هەر لە ڕەگەزوو وێنەی ئەوەیە کە خوای گەورە دەربارەی جادوو گەرانی

فیرعەون باسی کردووە و دەفەرموێت: ﴿ قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ ﴾[١]

واتە: (جا پەت و گوریس و گۆچانەکانیان هەڵدایە گۆڕەپانی جادووە کەوە ئەوەندە سەرسوڕهێنەربوو موسا وا گومانی برد لەجادووە کەیان، پەتەکان و گۆچانەکانیان دەجوڵێنەوە و دێن و دەچن وەکو مارێکی گەورە).

وە هەروەها لە فەرمایشتی خوای گەورەدا: ﴿ قَالَ أَلْقُوا فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ ﴾[٢]

واتە: (جاکە ئامێری جادوەکەی خۆیانیان هاویشت، خەڵکەکەیان چەواشە و چاوبەست کرد و پێیان وابوو ئەوشتانەی ئەوان هەڵیانداون هەموو مارن بۆیە ترسان و ترسێکی بەتین کەوتە دڵیانەوە).

ئەوان شتێ بەکار دەهێنن کە ناسراوە بە فێڵی بەکارهێنانی جوڵە و فێڵ کردنە لەخەڵکی و پێچەوانەی ڕاستیە یان ئەوان جۆری فێڵی شاراوە دەکەن کەوا دەردەکەوێ بۆ خەڵکی هەروەك ڕاستی بێت وایە، وە ئەوە درۆیە بەوەی کەوا دەردەخات بۆ خەڵکی کەخۆی دەپێکێ یان کەسێ دەکوژێ پاشان دەیگێڕنەوە بۆ بارەکەی خۆی پێش ئەوەی وای لێبێت، وە لەڕاستیشدا هیچ شتێ لەو کارە ڕوی نەداوە، یان وا پیشانی خەڵکی دەدات کە دەچێتە ناو ئاگرەوە و زیانیشی پێ ناگەیەنێ، لەکاتێکدا ئەو نەچوەتە ناویەوە، بەڵکو فێڵێکی شاراوەی کردووە کە خەڵکی وا گومان دەبات کەڕاستیە، وە بەهیچ جۆرێ دروست نیە ڕێ بدرێ بەوانەبەکردن و

---

[١] طه: ٦٦

[٢] الأعراف: ١١٦

بڵاوكردنەوەی ئەو كارە بەتاڵە و درۆ كردن لەگەڵ موسوڵماناندا بە كردنی ئەو فێڵە پوچەڵانە، لەبەرئەوەی ئەوە كاریگەری لەسەر خەڵكی سادە دەبێت وە لەلای هەندێ لە فەرمانڕەواكانی بەنی ئومەییە پیاوێك هەبوو ئەو یاریانەی دەكرد مرۆڤێكی سەربڕی پاشان سەرەكەی گەڕاندەوە شوێنەكەی خۆی و وەك خۆی لێكردەوە، ئامادەبوان سەرسام بوون بەوكارە ئینجا (جندب الخير الأزدي) ڕەزای خوای لێبێت هاتوو كوشتیو فەرموی: ئەگەر ڕاست دەكات با خۆی زیندوو بكاتەوە [1]، دروست نیە بۆ موسوڵمان كە ئامادەی ئەو درۆ و دەلەسەو جادوو گەریە بێت یان بەڕاستی دابنێت، بەڵكو پێویستە بەدرۆی بخاتەوە، وە پێویستە لەسەر كاربەدەستانی موسوڵمان كەڕێگیری بكەن و بیان كەن بە پەند بۆ ئەوانەی ئەو كارە دەكەن و تەمێیان كەن، با ناویشی بنێن یاریو هونەر! ! هەرگیز ناوەكان ڕاستیەكان ناگۆڕن وە قەدەكراویش ڕەواو ڕێگەدراو ناكەن بەوێنەی ئەوەی وا دەری دەخات بۆ خەڵكی كە بەقژی سەیارە ڕادەكێشێت یان لەژێر تایەی سەیارەدا دەخەوێ و دەڕوات بەسەریدا یان جگە لەوانەش لەجۆرەكانی درۆو فێڵ و جادوو .

پرسیار: ئایە ئەوانەی كە دێن بۆ یاریەكانی پاڵەوانیەتی كە پشتیان بەستووە بە جادوو، بێ باوەڕ دەبن لەكاتێكدا ڕازی نەبوون پێی ؟

وەڵام: ئەگەر ڕازی نەبن پێی ئەوا بێگومان كارێكی قەدەغەكراویان ئەنجام داوە و پێی تاوانبار دەبن، بەڵام ئەگەر ڕازی بن پێی و دەشزانن ئەوانە كە جادووە ئەوا لەو كاتەدا بێ باوەڕ دەبن.

پرسیار: پێش ئەوەی هیدایەت وەرگرم و بەردەوام بم لەسەر كردنی نوێژەكان لەكاتەكانی خۆیدا و خوێندنی قورئانی پیرۆز ڕۆیشتم بۆلای یەكێ لەو ئافرەتە جادوو گەران داوای لێكردم كە مریشكێ بخنكێنم تا نێوانمان دروست بكات و پەیوەستم بكات

[1] سيرأعلام النبلاء للذهب (٣ / ١٧٦ - ١٧٧) .

بە مێردەکەمەوە لەبەرئەوەی بە بەردەوامی کێشەمان لەنێواندا هەبوو، منیش بۆ ئەوەی کارەکەم بۆ بکات مریشکەکەم خنکاند بەدەستی خۆم ئایە لەسەر ئەو کارە تاوانم لەسەرە وە چی بکەم تا لەوە ڕزگارم بێت لەو ترسەی کە هەمیشە بەشوێنمەوەیەو دڵە ڕاوکێی توش کردووم ؟

وەڵام: یەکەم –چون بۆ لای ئافرەتانی جادوو گەر زۆر بەتوندی قەدەغەیە لەبەرئەوەی جادوو بێ باوەڕییە زیان دەگەیەنێ بە بەندەکانی خوا ی بەرزوو بەڕێز، ڕۆیشتن بۆلایان تاوانێکی زۆر گەورەیە، وە ئەوەش کەباستکرد و مریشکت خنکاندووە تاوانێکی ترە لەبەر ئەوەی سزادانی ئاژەڵانی تێدایە و کوشتنی ئاژەڵانە بەناهەق، وە نزیك بوونەوەیە بۆلای جگە لە خوا بەوکارە بۆیە دەبێتە هاوبەش دانان بۆ خوا، بەڵام لەبەرئەوەی کەتۆ گەڕایتەوە بۆلای خوای پاك و بێگەرد و تەوبەیەکی ڕاستت کردووە، ئەوەی ڕۆیشتووە لەو تاوانەی ئەنجامداوە خوای پاك و بڵند لێی خۆشدەبێت، وە هەرگیز لە داهاتودا نەچیتەوە سەر کردنی تاوانی وا، وە خوای گەورە لەو کەسە خۆش دەبێت کەتەوبەی کردووە، وە دروستیش نیە بۆ موسوڵمانان کە واز لە جادوو گەران بێنن جادوەکەیان بلاّو بکەنەوە لەنێوان خەڵکیدا، بەڵکو پێویستە ڕێیان نەدرێت و بەرپەرچیان بدرێتەوە، وە پێویستە لەسەر کاربەدەستانی موسوڵمانان کە ئەو جادوو گەرانە بکوژێ و خەڵکی بپارێزێ و بەدوریان بگرێت لەشەڕو خراپەیان.

پرسیار: بۆچونی بەڕێزتان چیە دەربارەی کردنەوەی شوێنی دیدەنی تایبەت بە خوێندنی قورئانەوە؟

وەڵام: ئەوە لە کردەوەی پێشین نەبووە کە ئەوان ژورێ یان شوێنی تایبەت بکەنەوە بە خوێندنی قورئانەوە، وە فراوانکردنی ئەو کارە خراپەی لێ دەکەوێتەوە، وە کەسانێ هەڵدەستن بەو کارە کە شیاونین و شارەزا نین، لەبەرئەوەی خەڵکی بە شوێن

چاوچنۆكی و تەماحی دونیادا دەڕۆن، وە دەیانەوێ كە خەڵكی بۆ لای خۆیان ڕابكێشن ئەگەر چی بە كردنی شتە قەدەغە كراوەكانیش بێت.

# وانەی نۆیەم لە ڕاڤەی هەڵوەشێنەری هەشتەم

زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمووی : هەشتەم : پـــشتگیری کردنـــی هاوبـــەش دانـــەران و یارمەتیـــدانیان دژی موسڵمانان وە بەڵگەش فەرمایشتی خوایە کەدەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾﴾ المائدة: ٥١ واتـه : ( هەرکەسێکیـشتان دۆستایەتیان لەگەڵ بکاو بیانکا بە یارمەتیدەرو دۆستی خۆی وە یان هاوکاری و هاوڕێیان بکات، بێ گومان ئەو کەسە هەرلەوانەو بە وان دادەنرێ، ئەگەر چی بە ناسنامەش موسڵمان بێت، بێ گومان خوا هیدایەت و ڕێنمای گەلی ناحەق و ستەمکارناکات).

## ( ڕاڤە )

زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێ بێت جۆرێك لە جۆرەكانی دۆستایەتی بێ باوەڕانی وەرگرتوە وهێناویەتی كە ئەویش پشتگیریكردن و پشتیوانیە، وەگەرنا دۆستایەتی هەریەكە لە خۆشەویستی دڵ و پشتگیری كردنی هاوبەش دانەران دژ بەموسڵمانان و پیاهەڵدان و ستایش كردنی بێ باوەڕان و جگە لەوانەش دەگرێتەوە. لەبەرئەوەی خوای پاك و بێگەرد پێویستی كردووە لەسەر موسڵمانان كە دژایەتی بێ باوەڕان و ڕق لێبونیان و دورکەوتنەوە لێیان و پشتێكردنیان كردووە، ئەوەیە لە ئیسلامدا ناسراوە بەبەشی دۆستایەتی و دوژمنایەتی .

جا فەرمایشتی زانای پایە بەرز ((پشتگیری كردنی هاوبەش دانەران و یارمەتی دانیان دژ بە مسوڵمانان )) یارمەتیدان بریتیە لە پشتگیری كردن، ئەوەی ئاشكرایە كەلە لێكدەری لێكدانەوەو ڕاڤەیە، جا پشتگیریكردن واتاكەی بریتیەت لە یارمەتی دان.

پاشان زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەم ئایەتەی كردوە بە بەڵگە ﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ ﴾[1] واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە !مووسای و عیسایی مەكەنە دۆست وپشتیوانتان، واتە: نە یارمەتیان بدەن و نە داوای یارمەتیشیان لێ بكەن وە بەهیچ جۆرێ مولاق و هاوكاری و خۆشەویستیتان نەبێ بۆیان، چونكە ئەوانە هەندێكیان پشتیوان و یارمەتیدەری هەندێكیانن و لەبەر ئێوەش دەست لە دینی خۆیان هەڵناگرن و هەمووشیان بۆ ئێوە دەبنە یەك دەستەو بەستە و

---

[1] المائدة: ٥١

لەڕۆژی خۆیدا گەلەکۆمەتان لێ دەکەن، وە هەرکەسێکیشتان دۆستایەتیان لەگەڵ بکا و بیانکاتە یارمەتیدەرو دۆستی خۆی وە یان هاوکاری و هاوڕێیان بکات، بێ گومان ئەوکەسە هەر لەوانەو بە ئەوان دادەنرێت، بێ گومان خوا هیدایەت و ڕێنمای گەلی ناهەق و ستەم کارناکات ).

جا فەرمایشتی خوای گەورە (وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ) بەڵگەیە لەسەر بێ باوەڕی کەسێ ئەوە بکات، لەبەرئەوەی ڕووکەشی وتەکەی (فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ) واتە: وەك وێنەی ئەوانە لە بێ باوەڕیدا .

ئەوە ڕووی بەڵگە هێنانەوەکەی زانای پایە بەرزە، ڕەحمەتی خوای لێبێت .

وەبێ گومان باسمانکرد کە دۆستایەتی چەندین بەشە لەوانە خۆشەویستی لەدڵەکاندا گەرچی پشتگیریشیان نەکات، وە لەوانە پشتگیری و یارمەتی دانیان و سەرخستیان گەرچی خۆشیشی نەون، وەلەوانە پیاداهەڵدانیان و ستایشی ئاینەکەیان و سوپاس کردنیان، هەموو ئەوانە دەچنە ناو دۆستایەتیکردنەوە (وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ) دۆستایەتیان دەکات بە خۆشویستنیان یان دۆستایەتیان دەکات بەسەرخستنیان و یارمەتیدانیان دژی مسوڵمانان، یان دۆستایەتیان دەکات بە ستایشکردنیان یان ستایشی ئەوەدەکات کە ئەوانی لەسەرن، جا ئایەتەکە گشتگیرەو هەموو ئەوانە و جگە لەوانەش دەگرێتە خۆ.

## جا پشتگیری بێ باوەڕان دژی موسڵمان چەند بەشێکە

بەشی یەکەم: پشتگیری کردن و یارمەتی دانیان دژی موسڵمان لەگەڵ خۆشویستنی ئەوەی لەسەرین لە بێ باوەڕی و هاوبەش دانان و گومڕای، ئەو جۆرە لە جۆری بێ باوەڕی گەورەیە و خاوەنەکەی لە ئاینی ئیسلام دەردەکات، جا هەرکەسێ پشتگیریان بکات و یارمەتیان بدات دژی موسولمانان لەگەڵ خۆشویستنی ئاینەکەیان و ئەوەی ئەوانەی لەسەرن و ڕازی بوون لێیان بە ویستی خۆی و هیچ زۆرێکی لێ نەکراوە ئەوە دەبێتە بێ باوەڕی گەورەو خاوەنەکەی لەڕیزی موسڵمانان دەردەکات لەسەر ڕووکەش وتەکەی خوای گەورە (فَإِنَّهُ مِنْهُمْ).

بەشی دووەم: کە یارمەتیان بدات دژی موسڵمانان بە ویستی خۆی نە، ئەو خۆشی ناون، بەڵکو زۆری لێ دەکەن لەسەر ئەو کارە ((یارمەتی دانەیان)) بە هۆی نیشتە جێ بوونی و مانەوەی لە نێوانیاندا، جا ئەوە هەڕەشەیەکی زۆر توندی لەسەرە و ترسی ئەوەی لێدەکرێت کە دوچاری بێ باوەڕی گەورە بێتەوە و لە ڕیزی موسڵمانان دەربچێت، وەلەوە کە هاوبەش دانەران لە کاتێکدا زۆریان لە کۆمەڵێ موسڵمان کرد لە ڕۆژی بەدردا لەسەر دەرچونیان لەگەڵیان بۆ شەڕکردن لەگەڵ مسولمانانندا، خوای پاکو بێگەرد ئەوەی بەباش نەزانی کە ئەوانی لەسەر بوون و سەرکۆنەی کردن لە کاتێکدا ئەوان وازیان لە کۆچکردن هێنا لە پێناو خوداداو لەگەڵ هاوبەش دانەراندا مانەوەو خۆیان توشی ئەوە کرد کەوتنە ناویەوە لە زۆر لێکردنیان لەسەر دەرچوون لەگەڵ هاوبەش دانەران لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان ((موسڵمانانی ناو شاری مەککە کە مابونەوەو کۆچیان نەکردبوو))زۆر ڕقیان لە ئاینی بێ باوەڕان بوو وە ئاینی ئیسلامیشیان خۆش

دەویست، بەلاّم لـە مەککـە مانـەوە لەبـەر چرووکی و پیسکەییان و ترسـیان لـە مـالّ و دارایی و شارەکەیان و منالّەکانیان[١]. نەك مانەوەکەیان لەبەر خۆشەویستیان بێت بۆ بێ باوەڕان و ئاینەکەیان، لەگـەڵ ئەوەشـدا خـوای گـەورە ئایـەتی دابەزانـد دەربارەیـان و فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ﴾[٢]

واتە: (بێگومان ئەوانەیان کە فریشتە گیانی کێشان، لە کاتێکدا ناحەقیان لە خۆیان کرد، چونکە (دار الشرك) یان بەجێ نەهێشت و کۆچیان نـەکرد بـۆ نیـشتیمانی ئیمـان (مەدینە))، بەر لەوە دەڵێن: ((باشە ئێوە لە کوێ بوون، بۆچی لێرە کۆچـتان نـەکردوو لەگەڵ هاوبەش دانەراندا مانەوە ))).

واتە: لەگەڵ چ لایەنێکدا بوون ئێوە ؟ ئەوە پێناخۆش بوونە، بە واتای بۆچـی ئێـوە لەگەڵ هاوبەش دانەراندا بوون و ئێوە موسوڵمانن ؟ ئەوان وتیـان ﴿ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ ﴾[٣] هەمان ئایەت

واتە: ئەڵێن: ((ئێمـە لـەو ولاّتـەی مەککـە دا بـێ دەسـەلاّت و لاواز کرابـوین، نـەمان دەتوانی بۆ هیچ لایەك کۆچ بکەین و بە ناچاری هەر لەو شوێنەدا ماینەوە)).

هـیچ فێڵێکمـان نـەدەزانی، ئـەوان بـوون ناچـاریان کـردین بـە زۆر لەسـەر ئـەوەی بمێنینەوە، ئەوانیش پێیان وتن ﴿ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ ﴾[٤]

---

١ اخرجه البخاری (٤٥٩٦) عن ابن عباس (رضي الله عنهما )، و إبن جرير (٥/٢٧٤-٢٧٥) وانظر : تفسیر البغوی (١/٤٦٩) ط . دار المعرفة.

٢ النساء: ٩٧

٣ النساء: ٩٧

٤ النساء: ٩٧

واتە: ((فریشتەکان ئەڵێن ئایە ؟زەوی خوا فراوان نەبوو تالەوێ کۆچ بکەن و بڕۆنە شوێنێکی تر بە ئازادانە خواپەرستی خۆتان بکەن )).

بۆچی ئارام دەگرن لەسەر مانەوە لەگەڵ بێ باوەڕاندا و ئێوە موسوڵمانن؟ وە خۆتان دووچاری ئەوە کرد کەتێی کەوتن لەوا دیمەنێکی ترسناکدا ؟ پاشان خوای گەورە بڕیار لەسەریان دەدات و دەفەرموێت ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾﴾[1] هەمان ئایەت.

واتە: ((جا لەدوا ڕۆژدا جێگایان دۆزەخە و ئەویش چارەنوسێکی نالەبارو خراپە ئەوە هەڕەشەیەکی توندە بۆیان پاشان دەفەرموێت)): ﴿إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾﴾[2]

واتە: ( ئەو پیاو وژن و مندالأنە نەبێ کە توانای هیچ خۆ دەرباز کردنێکیان نیە و شارەزای ڕێگەش نین و ڕێ دەرناکەن، جا بێ گومان خوا لە ئەوانە ئەبورێ و خواهەمیشە گوناح پۆشی لێبوردەیە، لە خاوەن بیانوانیش بیانوو وەردەگرێت ).

جا ئەوەی کۆچکردنی وازلێ هێناو دەیشیتوانی و کۆچی نەکرد و مایەوە و نیشتەجێ بوو لەگەڵ هاوبەش دانەراندا و ئەوانیش لەگەڵ خۆیاندا بردیان و دەریان کرد بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسوڵماناندا، ئەوە هەڕەشەیەکی زۆر توندی لەسەرە (إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ) ئا ئەوانە بیانویان لێ وەردەگیرێ لە مانەوە

---

[1] النساء: ٩٧

[2] النساء: ٩٨ – ٩٩

یان لەبەرئەوەی ئەوانە ناتوانن كۆچ بكەن وە خوای بەرزو بەڕێزیش دەفەرموێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾[١]

واتە: (خوای گەورە بە دەر لە توانا ئەرك ناخاتە سەر شانی هیچ كەسێك ).

بەشی سێ یەم: هەر كەسێك یارمەتی بێ باوەڕان بدات دژی مسوڵمانان و ئەو كەسە بەویستی خۆیەتی و هیچ زۆرێكی لێنەكراوە لەگەڵ ڕقیشی بۆ ئاینی بێ باوەڕانو ڕازی نەبوونی پێشی، جا ئەوە گومانی تیادا نیە كەئەوە ئەنجامدەری تاوانێكی گەورەیە لە تاوانە گەورەكان، وە ترسی لێدەكرێ لە بێ باوەڕبوون. (( بەو كارەی لە ڕیزی مسوڵمانان دەرناچێت بەڵام دەبێت زۆر ئاگای لەخۆی بێت و بترسێ كاری وا ناشرین نەكات و بێ باوەڕانی خۆش نەوێت ویارمەتیان نەداو دژی مسوڵمانان جوڵە جوڵ نەكا با مسوڵمانەكانیش بە دڵی ئەونەبن چونكە هەر موسوڵمان باشترە لە بێ باوەڕ و ئەو یارمەتیدان وكردەوانەی گومانی تێدا نیە كە بەرەو بێ باوەڕی ڕادەكێشێت .. وەرگێڕ)).

بەشی چوارەم: هەركەسێ یارمەتی بێ باوەڕان بدات دژی بێ باوەڕانی كە پەیمانیان هەیە لەگەڵ موسوڵماننندا ئەوەی كارێكی قەدەغەكراو و دروست نییە، لە بەر ئەوەی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی مسوڵمانانە، جا ئەو بێ باوەڕانەی كە ڕێك كەوتن و پەیمانیان هەیە لەگەڵ مسوڵماناندا دروست نیە بۆ هەموو مسوڵمانان كەشەڕیان لەگەڵدا بكەن وەك ئەمەكێك بۆ ئەو پەیمانەی كە لەنێوان ئەوان و مسوڵماناندا هەیە، وە ئەو كەسەش دەبێتە یارمەتی دەری كەسانێ كە شەڕ لەگەڵ ئەو بێ باوەڕە

---

[١] البقرة: ٢٨٦

پەیمانـدارەدا دەكـەن لـە خـودی بـێ بـاوەڕان ((واتـە هـەردوو هـەر بـێ بـاوەڕن بـەڵام لایەكیان پەیمانی هەیە لەگـەڵ مـسوڵمانان‌دا بۆیـە دروسـت نیـە مـسوڵمان یارمـەتی بـێ باوەڕان بدەن كەشەڕ لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانەدا دەكەن كە پەیمانیان نیـە چـونكە ئـەوە خیانەتـە..وەرگێـڕ): جـا ئـەوە دەبێتـە هەڵوەشـاندنەوە بـۆ پـەیمانی موسـوڵمانان و دەبێتیشە ناپاكی و ستەم لە متمانەو پەیمانی مسوڵمانان پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێت: ((مَن قَتَلَ مُعاهَداً لَم یَرِح رائحَةَ الجَنة ))[1] .

واتە: ((هەركەسێ بجەنگێ لەگەڵ كەسێكدا پەیمانی لەگەڵدا بەسـتراوە و متمانـەی دراوەتێ و بیكوژی هەرگیز بۆنی بە هەشت ناكات ))

جـا ئەگـەر خـوای پـەروەردگاری بـەرزو بـەڕێز بەدڵنیایـەوە قەدەغـەی كـردوە سەرخستنی مسوڵمانان بەسەر بێ باوەڕاندا لە كاتێكدا كە ئەو بـێ باوەڕانـە پـەیمانیان هەبێت لەگەڵ مسوڵماناندا جا چۆن بەكەسێ ڕێگە دەدات كە پشتی بێ بـاوەڕان بگـرێ لە سەر هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی مسوڵمانان لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانەدا ((واتە بە هـیچ جۆرێ ڕێگە نـادات بـە مـسوڵمانان دژی كـافرانێ بجـەنگن كـە پـەیمانیان هەیـە لەگـەڵ مسوڵماناندا .. وەرگێڕ)).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞ﴾[2].

---

[1] اخرجة البخاری (٣١٦٦) من حدیث عبدالله بن عمر و رضی الله عنهما.

[2] الأنفال: ٧٢

واتە: (خۆ ئەگەر داوای یارمەتیان لێ کردن بۆ پاراستنی ئاینەکەیان، دەبێ ئێوەش یارمەتیان بدەن و سەریان خەن بەسەر دوژمنانی هەردوو لاتاندا، مەگەر دژی ئەوانە لەگەڵ ئێوە هاوپەیمانن و ڕێکەوتنامەیان مۆر کردبێ  ئەگەر چی بێ باوەڕیش بن، لەو دەمەدا نابێت یارمەتیان بدەن).

جا ئەگەر مسوڵمانان داوای یارمەتیان لێ کردن دژی بێ باوەڕان بۆ ئەوەی سەریان بخە ین ئەوا پێویستە لەسەرمان موسڵمانان سەربخەین بەسەر بێ باوەڕاندا تەنها لەیەك باردا نەبێت: ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە پەیمانیان هەبێت لەگەڵ مسوڵماناندا جا بۆیە دروست نیە  بۆمان کە یارمەتی مسوڵمانان بدەین و سەریان بخەین  بەسەر بێ باوەڕاندا، جا چ جای بێ باوەڕان سەرخەین و یارمەتیان بدەین دژ بەو بێ باوەڕانەی کە پەیمانیان هەیە لەگەڵ مسوڵماناندا، ئەوە کارێکی دروست نیە کە مسوڵمان بیکات، هەموو ئەوەش لە پێناو ئەمەك داری و بەسفەتیە بەرامبەر بەو پەیمانەی کە هەیە .

بەشی پێنجەم: کە بریتی یە لە دۆستایەتی بێ باوەڕان و خۆش ویستنیان بەبێ ئەوەی یارمەتیان بدات دژی مسوڵمانان، ئەوە خوای گەورە قەدەغەی کردووە و باوەڕی لە خاوەنەکەی سەندۆتەوە و نەی هێشتوە، خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ﴾[1]

واتە: (هیچ کۆمەڵێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوای هەبێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن هەرچەندە ئەوانە باوکیان یان کوڕو نەوەیان یان براو عەشیرەتیان بن)، بەکورتی مرۆڤی باوەڕدار نابێ بە هیچ

[1] المجادلة: ٢٢

شـێوەیەك دۆسـتایەتی بکـا لەگـەڵ دوژمنـانی خـواو پێغەمبـەرداﷺ ئـەگینا لـەوان دەژمێردرێت، وە ئەوانەی کە لە دۆستایەتی دوژمنانی خوا خۆ ئەپارێزن کە سانێکن خوا باوەڕی لە نێو دڵیاندا چەسپاندووە و بەهیچ شتێك لەق نابێت )).

وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾[1]

واتە: (خۆ داواکردنەکەی ئیبراهیمیش بۆ لێ خۆشبوون لەباوکی تەنها لەبەر ئەوە بوو کە کاتی خۆی پێش ئەوەی بێ باوەڕی باوکی بۆ دەرکەوێ بە لێنی دابوو کە داوای لێبوردنی بۆ بکات، جاکە زانی سور دوژمنی خوایە یەخەی لێ هەڵتەکاند و بەرائەتی لێ کرد، چونکە ئیبراهیم پیاوێکی زۆر ملکەچ و دەست بەدوعا و هێمن و لەسەرخۆ بوو بەرامبەر بە خەڵکانی نەزان) .

وەهـەروەها دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ ﴾[2].

واتە: (ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆست و پشتیوان، لە کاتێکدا ئێوە خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبڕن، وە ئەوان بێ باوەڕبوون بەوەی لە لایەن خواوە بۆتان هاتووە).

---

١ التوبة: ١١٤
٢ الممتحنة: ١

تا ئەو شوێنەی دەفەرموێت: ﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ﴾[1]

واتە: (ئەی باوەڕداران بە ڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی كە لەگەڵیدا بوون لە پێغەمبەران نمونەیەكی چاكتان خراوەتە بەر چاو، كاتێك كە بە قەومەكەی خۆیان وت پاش ساڵەهای ساڵ لە بانگەواز كردنیان: ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەشی كەلە جیاتی خوای گەورە دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین وئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپا بووە تا ئەوكاتەی كە باوەڕ بە خوای تاكو تەنها دەهێنن).

جا سورەتی مومتەحینە هەر هەمووی دەربارەی قەدەغەكردنی دۆستایەتی بێ باوەڕانە ئەگەر چی نزیكتر ین كەس بن ئەو بێ باوەڕانە لە مرۆڤی موسڵمانەوە، پاشان خوای گەورە كۆتای سورەتەكەشی بەوە هێناوە كەفەرمویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ ﴿١٣﴾ ﴾[2]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: دۆستایەتی كۆمەڵێ مەكەن ((مەبەست جولەكەیە )) خوا غەزەبی لێگرتون، واتە نەبەنامەو نەبەكاغەز و نوسین و نەبە هیچ

[1] الممتحنة: ٤

[2] الممتحنة: ١٣

جۆرێكی تر هاوكاریان مەكەن، بە ڕاستی نائومێدو بێ هیوا بوون لە قیامەت، چونكە باوەڕیان پێی نیە، وەك بێ باوەڕەكان لە مردووی ناو گۆڕەكان بێ ئومێد بوون زیندوو ببنەوە ئەوانەیش بە هیچ شێوەیەك بە هیواو ئومێدی هاتنی قیامەت و پاداشتی نین، كە وابوو دوور بگرن لێیان و مەیانكەنە پشتیوان و دۆستی خۆتان و ڕازو نیازی مسوڵمانانیان لا مەدركێنن).

هەموو سورەتی مومتەحینە لە بابەتی دوژمنایەتی كردنی بێ باوەڕانەو خۆش نەویستنیان لە سەرەتایەوە تا كۆتای سورەتەكە[1].

---

١ زانای خواناس ((حەمدی كوڕی عەتیق)) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە قسەی زانای پایە بەرز موحەممەدی كوڕی عبدالوهاب ڕەحمەتی خوای لێبێت دەگێڕێتەوە كە : هەرچی بابەتی سێیەمە كە بریتیە لەوەی كەپیاوێ بیانوو پۆزشی هەیە لەسەر پێ خۆشبوون وسازانی لەگەڵ هاوبەش دانەران و دەرخستنی گوێڕایەڵی بۆیان، ئەوا بزانە كە دەرخستنی پێخۆشبونیو سازانی بۆ هاوبەش دانەران سێ حاڵەتی هەیە كە ئەوانیش:

***حاڵەتی یەكەم:*** كە بە تەواوی لە گەڵیاندا بگونجێ و بسازێ لە ڕووكەش و لە ناخدا،ملكەچیان بێت لە ڕووكەشدا،وە حەزبەلای ئەوان بكات ودۆستایەتی و خۆشەویستی بۆیان هەبێت لە ناخیدا،
ئەوا ئەوكەسەی كەوایە بێباوەڕەو لەدەرەوەی بازنەی ئیسلامدایە، ئیتر زۆری لێكرابێت لەسەر ئەوە یان زۆری لێنەكرابێت،وە ئەو كەسە لەوانەیە كە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت : ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾ النحل ١٠٦
واتە((بەڵام ئەوكەسەی دڵی بە بێباوەڕی خۆشكردبێت، ئەوانە خەشم و تووڕەیی خوایان لەسەرەو سزایەكی زۆر گەورەیان بۆ ئامادە كراوە)) .

***حاڵەتی دووەم :*** كە لە گەڵیاندا گونجاو سازاو بێت لە ناخیدا لەگەڵ پێچەوانە بوونی لەگەڵیاندا لە ڕووكەشدا، ئەوەش بەهەمان شێوە بێ باوەڕە، بەڵام ئەگەر كاری كرد بە ئیسلام لە ڕووكەشدا ئەوا خوێن و ماڵی پارێزراوە، وە ئەو كەسە دوو ڕووە .

*حاڵەتی سێیەم* : کە گونجاو سازاو بێت لە گەڵیاندا لە ڕووکەشدا بەڵام لە ناخەوە پێچەوانەیان بێت: ئەوە لە دوو ڕوەوە سەیر دەکرێت :

*ڕووی یەکەم* لەبەرئەوەی وا دەکات چونکە لە ژێر دەسەڵاتیاندایەو لێی دەدەن و کوت و بەندی دەکەن، وە هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکەن و دەڵێن : یان ئەوەتا لە گەڵماندا دەگونجێی و ملکەچیمان بۆ دەردەخەیت وە ئەگەر نا دەتکوژین، ئەوا لەو حاڵەتەدا کە ئەم کەسەی تێدایە دروستە بۆی لە کە لە گەڵیاندا بگونجێ و بسازێ لە ڕووکەشدا لەگەڵ ئەوەی کە دڵەکەی دامەزراوە بە باوەڕ، هەروەکو لە عەمماری کوڕی یاسر ڕوویدا کاتێ خوای گەورە ئایەتی دابەزاند و فەرموی: ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾النحل ١٠٦

واتە: (( ئەوەی پاشگەز بێتەوە لە خوا ناسی دوای باوەڕ هێنانی، جگە لە وانەی کە ناچار دەکرێن و وشەی بێ باوەڕی دێت بەسەر زاریدا لە کاتێکدا کە دڵیان پڕە لە باوەڕ )).

وە هەروەکو دەفەرموێت : ﴿إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ ال عمران ٢٨ .

واتە ((مەگەر خۆتانیان لێ بپارێزن – ئەویش بەوەی بە دەم ڕازیان بکەن و نەك بە دڵ و کردەوە )).

جا ئەو دوو ئایەتە بە لگەن لەسەر حوکم و بڕیارەکە هەروەکو ئیبن کەسیر هۆشداری داوە لەسەر ئەوە لە ڕاڤەی ئایەتەکەی سورەتی الی عمران .

*ڕووی دووەم :* کە گونجاو سازاو بێت لە گەڵیاندا لە ڕووکەشدا بەڵام لە ناخەوە پێچەوانەوە یان بێت، ئەو کەسە لە ژێر دەسەلا تیاندا نەبێت بەڵکو ئەوەی پاڵی پێوە دەنێن بۆ گونجانی لە گەڵیاندا لەڕوکەشدا چاو تێبڕینیەتی لەدەستکەوتنی پلەو پایەی دەسەلات وسەرۆکایەتی یان ماڵی دونیای یان چاوچنۆکی و پیسکەیەتی بەوەی شارو ولاتەکەی لە دەست نەچێت یان لە بەر ماڵ و خێزانی یان ترسی هەیە لەوەی لە داهاتودا ڕوودەدات لە لایەن ئەوانەوە دژ بەم، ئەوا ئەم کەسە لەم حاڵەتەدا بە هەڵگەڕاوە و پاشگەزبوەوە دادەنرێت وە هیچ سودی پێناگەیەنی ڕق لێبوونی بۆیان لە ناخی دڵیدا، ئەوە ئەو کەسە لە وانەیە کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت : ( ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ النحل ١٠٧

واتە : (( ئەوە چونکە خۆشەویستی دونیایاندا بەسەر دوا ڕۆژدا، بێ گومان خوای گەورەش هیدایەت و ڕێنموی گەلی بێ باوەڕ و خوا نەناسان ناکات )).

تەواو بوو، وەرگیراوە لە پەرتوکی ((مجموعە التوحید من رسالە الشیخ حمد بن عتیق رحمە الله )) لاپەڕە ٢٩٥، ٢٩٦ .



## لێرەدا چەندین بابەت هەیە

بابەتی یەکەم: حوکمی شوکردنی ئافرەتی مسوڵمان بە پیاوی بێ باوەڕ: دروست نیە بە هیچ جۆرێ کە پیاوی بێ باوەڕ ئافرەتی مسوڵمان بخوازێ و بیکاتە هاوسەری خۆی ئیتر با ئەو پیاوە جولەکە یان گاور یان بتپەرست بێت یان بێ دین بێت، دروست نیە هەرگیز شوکردنی ئافرەتی مسوڵمان بە پیاوی بێ باوەڕ لەبەر فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ﴾[1]

واتە: (ژن و کچانی باوەڕدار لە خوانەناسو هاوبەش دانەران مارە مەکەن تا نەبنە خاوەن باوەڕی دامەزراو، چونکە بێ گومان کە بەندەیەکی باوەڕدار لە پیاوێکی ئازادی هاوبەش دانەرو خوانەناس چاکترە، هەر چەن ئەو هاوبەش دانەرە قەدو قیافەو پلەو پایەی سەراسیماتان بکات، چونکە بە ڕاستی ئەو هاوبەش دانەرانە خەڵکی بۆ ناو ئاگر بانگ دەکەن).

واتە: ئافرەتانی مسوڵمانیان لێ مارەمەکەن تا باوەڕ دەهێنن، جا ئەگەر وازیان لە بێ باوەڕی هێناو چونە ناو ئیسلامەوە ئەوا لەو کاتەدا دروستە ئافرەتی مسوڵمانیان بدرێتێ و لێیان مارە بکرێت، خوای پاك و بێگەرد دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا

---

[1] البقرة: ٢٢١

جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ﴾[1]

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: ژنە باوەڕدارەکان کەلە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ لای ئێوە لە مەدینە، جا بۆ خۆتان تاقیان بکەنەوە بزانن ڕاست دەکەن لە بڕواکەیاندا ؟ لەبەر ئیسلام هاتوون، یان لە مێردو کەس و کاریان هەڵاتوون ؟! خواش زاناترە بە باوەڕەکەیان، ئەو چاك ئەزانێ چۆن و بۆ چی ئیمانیان هێناوە و کۆچیان کردوە ؟جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن و تەنها لەبەر ئیسلام هاتون مەیان گێڕنەوە بۆ لای مێردە کافرو بێ بڕواکانیان، چونکە ئەو ژنانە حەڵاڵ نین بۆ ئەو پیاوە کافرانە و ئەو پیاوە بێ بڕوایانەش بۆ ئەو ژنە باوەڕدارانە، واتە ژنی مسوڵمان دەبێت تەنها بۆ پیاوی مسووڵمان بێت).

جا ئەگەر بۆتان دەرکەوت کە ئەو ئافرەتانە باوەڕدارن ئەوا مەیان گێڕنەوە بۆ لای مێردە بێ باوەڕەکانیان، لەبەر ئەوەی بێ گومان لە یەك جیابونەتەوە و وە هاوسەرگیری نێوانیان هەڵوەشاوەتەوە لە نێوان ئافرەتی مسوڵمان و پیاوی بێ باوەڕدا، وە هەروەها نابێت هەر لەسەرەتاوە ئافرەتی مسوڵمان شو بە پیاوی بێ باوەڕ بکات بەڵام ئەگەر لە دوای شوکردنەکەی ئافرەتەکە مسوڵمان بوو یان پیاوەکە بێ باوەڕبوو ئەوا دەبێت ئەو ئافرەتە لەو پیاوە جیابکرێتەوە، هەروەکو لە ئایەتەکەی سورەتی بەقەرەدا هاتووە (وَلَا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ ) وە ناشبێت بەردەوام بێت لەسەر هاوسەری نێوانیان ئەگەر ئافرەتەکە موسڵمان بوو بەڵکو دەبێت لێ ی جیابێتەوە (فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ) جادروست نیە

---

[1] الممتحنة: ١٠

مارەکردنی ئافرەتی مسوڵمان لە پیاوی بێ باوەڕ هەر لە سەرەتاوە یان لە کاتی ژیانی هاوسەرێتیدا لە کاتێکدا کە هەر دووکیان مسوڵمانن بەڵام دوای پیاوەکە بێ باوەڕدەبێت ئەوا لەو کاتەدا یەکسەر ئافرەتە موسڵمانەکە لەو پیاوەی بێ باوەڕبووە قەدەغە دەبێت و دەبێت لێی جیا بێتەوە، ئەوەش فەرمانێکی کۆدەنگی نێوان زانایانە لە سەر ئەو بابەتە .

بەڵام هێنانی ژنی بێ باوەڕ لەلایەن پیاوی باوەڕدارەوە ئەگەر ئافرەتە بێ باوەڕەکە لە خاوەن پەرتوکەکان نەبوو ئەوا بە کۆدەنگی زانایان ئەو ئافرەتە حەڵاڵ نیە بۆ پیاوی مسوڵمان لەبەر فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ﴾[1]

واتە: (( ژنانی خوانەناس و هاوبەش دانەر مارەمەکەن تا باوەڕی دامەزراوو ڕاستەقینە دێنن )).

جگە لەوەی کە دەرکراوە لەم ئایەتە لە هێنانی ژنی بێباوەڕ لە لایەن پیاوی باوەڕدارەوە بە مەرجێ ئافرەتە بێ باوەڕەکە جولەکە یان گاور بن، ئایەتەکەی سورەتی مائیدە ئەم گشتیەی سورەتی بەقەرەی تایبەتی کردوە، کە دەفەرموێت:

﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ ﴾[2]

واتە: (لەمڕۆ بە دواوە هەموو شتێکی چاك و پاکتان بۆ ڕەوایە و سەربڕاوی دەستی ئەوانەی نامەیان پێ دراوە ڕەوایە بۆتان و دەتوانن بیخۆن).

---

[1] البقرة: ٢٢١

[2] المائدة: ٥

مەبەست بە خواردن لێرەدا سەربڕاوی دەستی گاور و جولەكەیە، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ﴾[1]

واتە: (وە خواردن و سەربڕاوی دەستی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵەو ڕێی پێدراوە. ژنانی باوەڕدارو داوێن پاك و ئازادیشتان بۆ حەڵاڵە، هەروەها ئەو ژنە داوێن پاكانەش كەلە پێش ئێوە پەرتوك ونامەیان پێدراوە لەو جولەكە و گاورانەی بڕوایان بە تەورات و ئینجیل هەیە).

داوێن پاكەكان: واتا ئەوانەی ناموسیان خاوێنەو زینا كار نین بە لام ئافرەتێكی بێ باوەڕی گاورو جولەكە كە ناموسیان خراپەو زیناكارن دروست نیە بكرێنە هاوسەر لە لایەن پیاوانی باوەڕدارەوە ئیتر ئەو ئافرەتە بێ باوەڕبێت یان باوەڕدار چون داوێن پیس و زینا كارن ئەوا بە كەڵكی ژیانی هاوسەریە تی نایەن لە گەڵ موسڵمانانداءخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾﴾[2]

واتە: (پیاوی زینا كە ڕو شەڕواڵ پیس هەر دەبێ ژنی زینا كەرو داوێن پیس، وەیان هاوبەش دانەرو بت پەرست مارە بكات بۆ خۆی، چونكە ئافرەتی بەڕێز و داوێن پاك هەرگیز هاوشانی ئەو نییە، كەواتە زینا كاران لە كۆڕی بڕوا داران دەچنە دەرەوە — ژنی زیناكارو داوێن پیسیش هە ردە بێ لە لایەن پیاوی زینا كارو داوێن پیس و هاو بەش دانە رەوە مارە بكرێت، بێ گومان ئەو جۆرە شوكردنەو مارە كردنە ی ژنانی زینا كاران لەسەر بڕوا دارانی داوێن پاك قە دەغە كراوە چونكە زیانی گەورەی تێدایە).

---

[1] المائدة: ٥
[2] النور: ٣

## جادروست و ڕێدراوە هێنانی ئافرەتی بێ باوەڕ بە دوو مەرج

یەکەم: کە ئەو ئافرەتە بێ باوەڕە دەبێت داوێن پاك و ناموس پاك بێت و داوێن پیس نەبێت هەر دەمە و لای یە کێك بێت .

دووەم: دەبێت ئە و ئافرەتە جولە کە یان گاور بێت .

جا بەو دوو مەرجە دروستە موسڵمان ئافرەتی بێ باوەڕ بهێنێ، بەڵام دە گونجێ بوترێ: زانراوە لەوەی کە خۆشەویستی هەیە لە نێوان ژن و پیاودا خوای گەورە دە فەرموێت: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ [1]

واتە: (خۆ شەویستی و میهرەبانیشی خستۆتە نێوانتان بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە باری گرانی ژیان هەڵگرن و درێژە بە ژیان بدەن).

جا چۆن دەگونجێ کە ئافرەتێکی خاوەن نامەی بێ باوەڕ مارە بکات و سۆزو خۆشەویستیشی بۆی هەبێت،ئایە دروستە خۆشە ویستی و دۆستایەتی موسڵمان بۆ ئافرەتی بێ باوەڕ لە گەڵ ئەوەی کە خوای گەورە دە فەرموێت: ﴿لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ﴾ [2]

واتە: (موسایی و عیسایی کە جولەکەو گاورن مەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان، نە یارمەتیان بدەن و نە داوای یارمەتیان لێ بکەن).

---

[1] الروم: ٢١

[2] المائدة: ٥١

دەڵێین لە وەڵامی ئەمەدا: خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو خۆشەویستی و میهرەبانی سروشتیە لە مرۆڤدا هەیە لە پێناو ژیانی ژن و مێردایەتیدا، بەلاَم خۆشەویستی ئاینی دروست نیە (( واتە دروست نیە کەسێ ژنە گاورو جولەکەکەی لەبەر ئەوە خۆش بوێت کە جولەکەیە یان گاور بەلاَم ئەگەر لەبەر ئەوە خۆشی بوێت کە ژنیەتی ئەوا قەیناکەو دروستە .. وەرگێڕ )) .

دووەم بابەت: ڕێز لێنانی بێ باوەڕان ئەگەر چاکەیان لەگەڵدا کردین نەك خۆشەویستی بێت بۆیان، بەڵکو تەنها پاداشتیان دەدەینەوە و ڕێزیان لێدەنێین بەس لەسەر کارە باشەکانیان بەتەنها، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾[1]

واتە: (خوا ڕێتان ناگرێ لەو بێ باوەڕانەی شەڕیان لەگەڵ نەکردون لە ئایندا و لە ماڵو زێدی خۆتان دەریان نەکردون کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و مامەڵە یان لەگەڵ بکەن بە دادگەری، بە ڕاستی خوای دادپەروەر خەڵکانی دادپەروەری خۆش دەوێت).

جائەگەر بێ باوەڕان نەجەنگان لە گەڵ موسڵماناندا و یارمەتی کە سانێکیشیان نەدا کە لە گەڵ موسڵماناندا لە جەنگدان،وە ئەو بێ باوەڕانە کاردەکەن لای موسڵمانان و جێ دەستیان دیارە، ئەوا مسوڵمان پاداشتیان دەدەنەوە لەسەر کارە چاکەکانیان کەدەیکەن لەگەڵ موسڵماناندا، وە ئیسلامیش هانی شوێن کەوتوانی دەدات لەسەر

[1] الممتحنة: ٨

چاکەکردن و جوان هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کەسانێکدا کە ڕفتاریان جوانە، لەبەر ئەوەی هیچ منەتێکی بێ باوەڕ لەسەر موسڵمان نەمێنێتەوە

لەو وەلامدانەوە جوانەی سودی زۆری تێدایە، لەوانە هاندانیانە بۆ ناو هاتنە ناو ئیسلام ئەگەر بە مامەڵەیەکی چاك مامەڵەیان لەگەڵدا کردن، ئەوانە نەجەنگاون لەگەڵماندا و یارمەتی کەسانێکیشیان نەداوە کەلە جەنگدان لەگەڵماندان، جا ئەگەر بە چاکە مامەڵەمان لەگەڵدا کردن ئەوا هۆکارێکە بۆ بانگەوازکردنیان بۆ هاتنە ناو ئیسلام، وە لەوانە پاداشت و ڕێزلێنانیانە لەسەر ئەو کارە جوانەی کە کردویانە لەگەڵ موسڵماناندا ((وە لەوانە هیچ منەتێکیان نامێنێ بەسەر مسوڵمانانداو)) وە نالێین ئێمە دەستی یارمەتیمان بۆ درێژکردون و شتمان بۆ کردون ئەگەر پاداشتیان بدەینەوە لەسەر کارە چاکەکانیان، دەڵێین پێمان بەخشین هەروەکو ئێوە پێتان بەخشین، هیچ شتێکتان بەسەرمانەوە نەماوە تا سەرشۆڕ بین لەبەر دەستانداو لاوازی بەر دەستان بین .

بابەتی سێیەم: مامەڵە دونیاییەکان لەگەڵ بێ باوەڕاندا وەکو ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانی و سودگەیاندیان بە یەکتر، ئەوە کارێکی ڕێگەدراوە، وە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ موسڵمان کالاّو کەل و پەل لەلای بێ باوەڕانەوە هاوردە دەکەن بۆ شارو ناوچەکانیان، وە هەروەها پۆشاك و ئامێری ڕۆشتن و چەك و تفاقیان لێدەکڕن لەگەڵ شتی تریشدا هەر لە کۆنەوە ئەمە ڕودەدات لە نێوان موسڵمانان و بێ باوەڕاندا، وە ئەوە بەشێك نیە لە دۆستایەتی کردنیان بەڵکو بریتیە لە گۆڕینەوەی سودو قازانجی نێوانیان، وە بەرژەوەندی موسڵمانانی تیادایە و هیچ خۆشەویستیەك نیە بۆ یان لەبەر ئەوەی تەنها کڕین و فرۆشتنەو بەس .

بابەتی چوارەم: دروستە بۆ موسڵمانان كە بێ باوەڕان بەكار بهێنن بۆ ئەنجام دانی ئەو كارو بارانە ی جگە لەوان نایزانن، وە دروستە بۆمان كە سود لە شارەزای و پسپۆڕیان وەربگرین لەو شتانەی كە جگە لەوان شارە زاییان نیە ونایزانێ یان ئەوان زۆر باشتری لێدەزانن و وردن تیایدا و زۆر شارەزان، وە دروستە بۆمان كە بەكرێیان بگرین چونكە پێغەمبەرﷺ (( ابن أريقط )) ی بەكرێ گرت تا ڕێگەی پیشان بدات و بێ باوەڕیش بوو، لەوەدا بەڵگەی ئەوەی تیادایە كە دروستە بێ باوەڕ بە كرێبگیرێ تاسود لە شارە زاییە كەی وەر بگیرێت، لە بەر ئەوەی ئەو كەسە خزمەتگوزاریمان پێشكەش دەكات ئێمەش كرێی و مافی دەدەینێ، ئەوە وەك وێنەی كڕین و فرۆشتن وایە لەو شتانەی سودی تیادایە بۆمان پێویستمان پێیەتی .

بابەتی پێنجەم: چاكەكردن لەگەڵ باوكی بێ باوەڕدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾ [1]

واتە: (هیچ كۆمەڵێ نابینین كە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوای هەبێت دۆستایەتی ئەوانە بكەن دژایەتی خواو پێغەمبەرەكەیﷺ دەكەن، هەرچەندە ئەوانە باوكیان یان كوڕ و نەوەیان یان براو عەشیرەتیان بن).

جا دۆستایەتی دروست نیە لە نێوان موسڵمان و بێ باوەڕدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ [2]

---

[1] المجادلة: ٢٢

[2] المائدة: ٥١

واتە: (هەر کەسێکیشتان دۆستایەتیان لەگەڵ بکاو بیانکات بە یارمەتیدەر و دۆستی خۆی بێ گومان ئەو کەسە هەر لە وانەو بە وان دادەنرێت).

گەرچی باوك یان برا یان کەسی نزیك بێت، بەڵام منداڵی موسڵمان چاکە لەگەڵ باوکی بێ باوەڕدا دەکات لە ڕووی وەلا مدانەوە چاکە بۆ باوکی و لەبەرامبەر چاکە بە چاکە، ئیسلام ئاینی چاکەکاری و ئەمەك دارییە، وە لەو چاکەیەش باش بوونی منداڵی موسڵمانە لەگەڵ باوکی بێ باوەڕدا خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴾[1]

واتە: (ئێمە دەربارەی باوك و دایك بە مرۆڤمان ڕاگەیاندو ئامۆژگاریمان کرد کە: هەمیشە ڕەفتاری چاکەیان لەگەڵ بکەن، بە تایبەتی لەگەڵ دایکیدا، دایکی بە پێستی سکی هەڵیگرتوە بە لاوازی لەسەر لاوازی تا لەداوێنی بەربۆتەوە، هاتۆتە ئەم جیهانەوە، شیر بڕینەوەش دوو ساڵی خایەند، کە وایە ئەی مرۆڤ: بەردەوام سوپاسی من بکە لەسەر نیعمەتەکانم و سوپاسی باوك و دایکیشت بکە لەسەر ئەو هەموو ئەزیەتو ئازارە لە پێناوی تۆدا چێشتویانە، گێڕانەوەشتان هەر بۆلای منە، دوای زیندوو بونەوە).

---

[1] لقمان: ١٤ – ١٥

جا منداڵ لەگەڵ باوك و دایکیدا بە باشە دەبێت ڕەفتار بکات، وە لەگەڵ باشبونیان بەوە دەبێت خەرجیان بکێشێ و پێویستیە کانیان پڕبکاتەوە ئەگەر چی باوکیشی یان دایکیشی بێ باوەڕبن، لە بەر ئەوەی ئەوە وەلآمدانەوە جوانە بەرامبەر چاکەکانیان کە لەگەڵ منداڵە موسڵمانەکانیان کردویانە، پاشان هەر لە هەمان ئایەتدا دەفەرموێت:

﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ﴾ [1]

واتە: (هەمیشە گوێڕایەڵیان بەو لە سنوری ڕەزامەندی خودادا، خۆ ئەگەر هەوڵیشیان داو پێیان داگرت لەسەر ئەوەی شتێك بکەیت بە شەریك و هاوبەشم، کە هیچ بەڵگەو زانیاریەکت پێی نیە ئەو سا گوێڕایەڵیان مەکە وە لە دونیادا لەگەڵ هەردوکیاندا بە شێوەیەکی چاك و پەسەند هاوەڵی بکە، هاوڕێ وهاوکارێکی چاك بە بۆیان بە جل و بەرگ و خۆراك و هەڵسوکەوتی چاك دڵخۆشیان بکە).

واتە: (( لە ئایندا شوێن پێغەمبەرﷺ بکەون شوێن ئاینی دایك و باوکت مەکەوە. بەلآم لە بەرئەوەی ئەوان چاکەیان لەگەڵتا کردوە و گەورەیان کردویت و پەروەردەیان کردوی و خەرجیان کێشاوی و جل و بەرگ و خۆراکیان بۆ پەیدا کردوی جا تۆش وەلآ می چاکەیان بدەرەوە با هەردوکیشیان بێ باوەڕبن .

بە دڵنیاییەوە دایکی (( ئەسمائی کچی ئەبوبەکر )) هات بۆلای ئەسمائی کچی لە کاتێکدا کە بێ باوەڕ بوو داوای یارمەتی لە ئەسماء کرد، ئەسمایش ڕۆیشت پرسی بە پێغەمبەرﷺ کرد و پێی ووت: دایکم هاتووە بۆلام و دەیەوێ پێی ببەخشم، ئایە کاری بۆ جێ بە جێ بکەم و ڕایی کەم ؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: (( نعم، صلي أمك )) [2] .

---

[1] لقمان: ١٥

[2] تقدم تخريجه .

واتە: (( بەڵێ، كاری بۆ جێ بە جێ بكەو ڕایی بكە و پەیوەندی لەگەڵیدا بكەو باش بە لەگەڵیدا)).

پێغەمبەرﷺ فەتوای بۆ دا بەوەی كە پەیوەندی لەگەڵ دایكیدا بكات و باش بێت بۆی و هەرچی پێویستە بۆی جێ بەجێ بكات لە كاتێكیشدا كە دایكی بێ باوەڕە .

ئەمە لە ڕووی دۆستایەتی و خۆشەویستی ئاینەوە نیە بەڵكو ئەوە لە ڕووی وەڵام دانەوە جوانە لە بەرامبەر پەروەردەكردنیان و چاكبونیان بووە لەگەڵتدا لە لایەن ئەو دایك و باوكە بێ باوەڕەوە، وە ئەوە دووبارە لە ڕووی مامەڵەی دونیاییەوە، بەڵام مامەڵەكردنی ئاینی بە خۆشویستن و سەرخستن و یارمەتیدان نابێت شتی وا بكرێت، جا ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی ڕێزو ئەمەكداری و بەسفەتیە، هیچ كاتێ چاكەی پێناخۆش نیە و ڕێگری ناكات هەر چەندە لەگەڵ بێ باوەڕانیشدا بێت بەڵكو لە بەرامبەریدا بە چاكە وباشە وەڵا می دەداتەوە .

وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًاۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾﴾[١]

واتە: (وە لە دونیادا لەگەڵ هەر دوكیاندا بە شێوەیەكی چاك و پەسەند هاوەڵی بكە، وە بەردەوام هەر ڕێگەی ئەوە بگرە كە بەرەو من ڕێگەی گرتوتە بەرو گەڕاوەتەوە بۆلام، لە پاشان هەمووتان هەر بۆلای من دەگەڕێنەوە، ئینجا لەو كارو كردەوەی كە لەدونیادا كردوتانە ئاگادارتان دەكەم).

---

[١] لقمان: ١٥

**بابەتی شەشەم:** وە بەهەمان شێوە دروستە بۆ موسڵمانان کە لەگەڵ بێ باوەڕاندا هەڵسوکەوت بکەن و ڕازیان کەن ئەگەر موسڵمانان ترسان لە شەڕ و خراپەی بێ باوەڕان، ئەوا دروستە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن لە ژیانی ڕۆژانەداو ڕازیان کەن .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ﴾[١]

واتە: (نابێت باوەڕداران بێ باوەڕان بکەنە دۆست و پشتیوان و یارو یاوەری خۆیان لە جیاتی باوەڕداران، ئەوەی کاری وابکات، ئەو کارەی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ پەیوەندیەکی بە خوای گەورەوە نەمێنێت).

واتە: (( ئەو کەسەی دۆستایەتی بێ باوەڕان دەکات بە خۆشویستن و سەرخستن و پشتگیری ئەوا بە دڵنیاییەوە خوای گەورە بەرائەتی خۆی لێکردوەو دوورە لێی))لەدوای ئەوە دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ﴾ .

واتە: (( مەگەر لە بەرئەوەی خۆتان لە شەڕیان بپارێزن و قوتار بن ))

کە بریتیە لەخۆگونجاندن لەگەڵیاندا ئەگەر موسڵمان لە شەڕو خراپەی ترسا، ئەوە هیچ کات لە دۆستایەتی کردن نیە بەڵکو ئەوە هۆیەکە بۆ دورخستنەوەی مەترسی لە موسڵمانان، ئێمە خۆمان دەگونجێنین لەبەر ئەوەی لە خراپەیان بە دوور بین بەوەی ماڵیان بدەینێ تا لەخراپەیان پارێزراو بین، یان ئەوەی دەیانەوێ لە کارو باری دونیا. ئەوە بە خۆشەویستی بۆیان دانانرێت بەڵکو بە خۆگونجاندن لە گەڵیاندا دەژمێرێت بۆ

---

[١] آل عمران: ٢٨

دورخستنەوەی شەڕ و خراپەیان، لەبەر فەرمودەی خوای گەورە ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةً﴾[١]

واتە: (مەگەر خۆتان لەشەڕیان بپارێزن و قوتاربن).

هەریەکە لە خۆپاراستن و خۆپارێزی و خۆگونجاندن بەیەك واتاو مانا دێت .

وە هەندێ لە خەڵکی جیاوازی ناکات لە نێوان خۆگونجاندن و سەر شۆڕکردن، خۆگونجاندن و خۆپاراستن دروستە لەکاتی پێویستدا بۆ دورخستنەوەی شەڕو خراپەی بێ باوەڕان، بەڵام سەرشۆڕکردن بریتیە لە دابەزین لەشتێ لە ئایندا بۆ ڕازی کردنی بێ باوەڕان، ئەوەش کارێکی نادروستە و هەرگیز شتی وانابێت، خوای بەرزو بەڕێز دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ﴿٩﴾﴾[٢]

واتە: (جاکەوابوو تۆ بە قسەی ئەوانە مەکە بە درۆزنت دەزانن، ئاواتە خوازن کە تۆ نەرمی بکەیت لە ئاینەکەتدا دەربارەی بیروباوەڕەکەت، جا ئەوانیش ئەو حەلە نەرمیت لەگەڵ بکەن و ڕێکەون ).

واتە: (( ئەگەر تۆ تۆزقاڵێك لێیان نزیك ببیتەوە و دەست لەبەرنامەکەت شل بکەیت ئەوانیش ئامادەن گوێڕایەڵ بن )) .

---

[١] آل عمران: ٢٨

[٢] القلم: ٨ – ٩

وە خوای پەروەردگار لە کاتێکدا کە باسی دابەزینی قورئان دەکات دەفەرموێت:

﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾﴾[1]

واتە: (ئایە ئێوە هەر بەم قورئانە باوەڕ ناکەن ؟! و کردەوەی پێناکەن تا بێ باوەڕان ڕازیکەن).

وازی لێدەهێنن لە پێناو ڕازی کردنی بێ باوەڕاندا ئائەوە بریتیە لەسەر شۆڕکردن و دابەزین .

گێڕدراوەتەوە لە کاتێکدا کە بێ باوەڕەکان داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد کە ئەوان ساڵێ خودا دە پەرستن و پێغەمبەریش ﷺ ساڵێك پەرستراوەکانی ئەوان بپەرستێ. خوای گەورە قەدەغەی ئەوەی لێکردو فەرمایشتی بەرزی خۆی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾﴾[2]

واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ئەی بێ باوەڕان: دارو بەرد پەرستان: خوانەناسان ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، من چی لە دارو بەرد بکەم، ئەوەش من دەیپەرستم ئێوە نایپەرستن، چونکە من خوایەکی هەق و ڕاست ئەپەرستم و دارو بەردناپەرستم دیارە ئەم دوانەش جیاوازیان زۆرە،وە منیش پەرسندەی ئەوە نیم کە

---

[1] الواقعة: ٨١

[2] الكافرون: ١ – ٦

ئێوە پەرستوتانە و دەیپەرستن، وە ئێوەش پەرستندەی ئەو زاتە نین كە من دەیپەرستم، جا كەوابوو ئاینی خۆتان بۆ خۆتان و ئاینی خۆیشم بۆ خۆم ).

خوای گەورە قەدەغەی لێكرد كە وەڵامیان بداتەوە وە بۆ ئەوە، یان دابەزێ لەشتێ لە ئاینەكەی لەپێناو ڕازیكردنیاندا، جا دروست نیە دابەزین لە ئاین لە بەر ڕازیكردنی بێ باوەڕان هەر چیەك ڕووبدات (( ابن كثیر)) فەرمویەتی: ((واتە من پەرستراوەكانی ئێوە ناپەرستم، بەڵكو خوا دەپەرستم لەسەر ئەو شێوەی كە پێی خۆشەو لێی ڕازییە)).

(وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ) واتە: ئێوە كەسانێكن كە فەرمانەكانی خوای گەورە و شەرعەكەی جێ بە جێ ناكەن لە پەرستندا، وە خوای پاك و بێگەرد دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذًا لَّاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا (٧٣) وَلَوْلَا أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا (٧٤) إِذًا لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا (٧٥) ﴾[1]

واتە: (بێ گومان ئەوەندەی نەمابوو هاوبەش دانەرو بێ باوەڕەكان سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە بەوەحی بۆمان ناردووی كە لات بكەن و لە خشتەت بەرن و لەهەندێ فەرمانمان بترازێیت، تا شێوازی بانگەوازەكەت بگۆڕی و غەیری قورئانیان بۆ بخوێنیتەوە و درۆو لەسەر ئێمە هەڵبەستیت، ئیتر دەیانكردیت بە دۆست و خۆشەویستیان و دەبویتە پیاوی چاك * دیارە ئەگەر خۆمان توند ڕامان نەگرتیتایە و دەستمان پێتەوە نەبوایە، خەریك بوو لە خشتەت بەرن و كەمێ بەلای ئەواندا بڕۆیت و

[1] الإسراء: ٧٣ – ٧٥

بە گوێیان بکەیت * چاك بزانە ئەو کاتەیش هەر لەم ژیانی دونیایەدا دوو بەرامبەر سزامان دەدایت، لە مەرگیشدا هەردوو بەرامبەری ئەوان سزامان پێ دەچەشتیت، چونکە گوناهی پێغەمبەرﷺ زانایان لە تاوانی خەڵکانی تر گەورەترە، بۆیە سزایشیان دوو بەرامبەرە ).

جا بۆیە دروست نیە خۆبەکەم زانین لەبەرامبەر بێ باوەڕاندا بە دابەزین لە شتێك لە ئاینی ئیسلام لەپێناو ڕازیکردنیاندا، جا بۆیە سەرشۆڕکردن، بە هیچ جۆرێ دروست نیە، بەڵام خۆپارێزی ئەوە دروستە لەکاتی پێویستیدا، ئاسانکار ییەکە لەلایەن خوای پاك و بێگەرد و بەرزو بڵند، وەکو دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗ﴾ [١]

واتە: (مەگەر خۆتان لەشەڕ و خراپەیان بپارێزن)تا پاڵ بە خراپەکەیانەوە بنێن و خۆتانی لێبپارێزن، بۆیە پێویستە شارەزابوون لەم بابەتانەدا، هەندێ خەڵکی ئاسانکاری دەکات بۆ بڵاوبونەوەی دۆستایەتی کردنی بێ باوەڕان و دەڵێت: ئەوە لە ڕووی باش ڕەفتارکردن و مامەڵەکردنە و دەرخستنی ئاینی ئیسلامە بە ڕووی لێبوردەیەوە، وەکە پێناخۆشی و ڕق و کینەی تیادانیە، ئەوە قسەیەکی بە تاڵ و پووچە، لەبەرئەوەی ئاینی ئیسلام ڕق و خۆشەویستی و دۆستایەتی و دوژمنایەتیشی تیادایە، وەبەتەنها خۆشەویستی تیا نیەو بەس وەکو دەڵێن، ئەمە قسەیەکی بەتاڵە. ئیسلام ئاینی بە هێزو پتەوەو زۆر بە دەسەلاتە، لێخۆشبوونی تیادانیە لەگەڵ بێ باوەڕاندا یان سەرشۆڕکردن بۆیان بە دابەزین لە شتێك لە ئایندا، گروپ و دەستەیەك هەیە بانگەشە دەکەن بۆ ئەوەی کە موسڵمان جیهاد دژی بێ باوەڕان نەکەن و نەجەنگن لەگەڵیاندا، لەبەرئەوەی ئاینی ئیسلام ئاینی سۆز و میهرەبانیە و شەڕکردنی

---

[١] آل عمران: ٢٨

تیادا نیە . و گروپ و دەستەیەكیش هەیە زۆر توندە و مامەڵەكردن لەگەڵ بێ باوەڕاندا بە دۆستایەتی دەزانێ و بە خۆشەویستی بۆیان دادەنێ، ئا بەو شێوەیە وردیشی ناكاتەوە وەكو خوای گەورە لە قورئانەكەیدا درێژەی پێداوە و شی كردۆتەوە، جا بۆیە پێویستە شارەزابوون لە شتەكانداو دابەزاندنی حوكم و بڕیارە شەرعیەكان لە شوێنەكانی خۆیاندا، وە بەهیچ جۆرێ هەق و ناهەق تێكەڵاو نەكەین و نەڵێین كە ئیسلام مامەڵە لەگەڵ بێ باوەڕان ناكات و ئاینی توڕەی و هەڕەشەیە و سۆز و میهرەبانی تیادانیە، بەڵكو ئاینی پاك و پیرۆزی ئیسلام سۆزو میهرەبانیشی تێدایەو توڕەی و هەڕەشەشی تێدایە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً﴾[1]

واتە: (ئەی گەلی خاوەن باوەڕ: لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانەدا بجەنگێن لێتانەوە نزیكن، واتە بەر لە هەموو شتێ دەبێ دەورو بەری خۆتان لە شیرك و خوانەناسی، ئەو جا بڕۆن بۆ جێگەیەكی تر، بۆیە پێغەمبەریشﷺ لە پێشدا، لەعەرەبەكانی دەورو بەریەوە دەستی پێكرد، وە دەبێت توندو تیژی و زەبروزەنگیشتان لێ ببینن، واتە: با هەست بكەن بە توندو تیژی و لێ بڕانتان) وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ﴾[2]

---

[1] التوبة: ١٢٣

[2] المائدة: ٥٤

واتە: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە: هەر كەسێكتان لە ئاینی خۆی كە ئاینی ئیسلامە پاشگەزبێتەوەو وەرگەڕێ، جا خوا لەمە و لا كەسانێك دێنێت ئەوەندە بەرفەرمانی دەبن خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێ، لە ئاستی خاوەن باوەڕاندا خۆ بەكەم زان و بەسۆزن وە لەبەرامبەر بێ باوەڕاندا خۆ بەگەورە زان و سەر بڵندو دەرون بەرزن، توندو تیژو بە هەڵمەتن، بۆ ڕەزامەندی خوا تێدەكۆشن و دەجەنگن و لەتەشەرو لۆمەی لۆمەكارانیش ناترسن و باكیان نابێ).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ﴾[1]

واتە: (موحەممەدﷺ ڕەوانەكراو و پەیامبەری خوایە، پێیان خۆش بێت یان نا، ئەگەر ئەو كەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەو كەوتوون لەبەر بێ بڕواكاندا ئازاو بەهێزن، لەناو خۆشیاندا میهرەبان و بەسۆز و دڵ نەرمن).

واتە: زۆر بە سۆزن لەگەڵ موسڵماناندا، بەڵام مانای وانیە كە ئەوان توندو تیژن لەسەر كافران یان ڕق و كینەو بە ئازارن بۆ بێ باوەڕان، مامەڵەیان لەگەڵ ناكەن لەوەی كە خوای گەورە بۆی بە ڕەوا داناون یان ئەو موسڵمانانە ژن و ئافرەتی گاورو جولەكە ناهێنن، وەكڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ ناكەن، ئەوە داواكراو نیەو خوازراو نیە، جا ئەو بەرژەوەندیانەی كە موسڵمانان پێویستیانەو لەگەڵ بێ باوەڕاندا ئاڵوگۆڕی دەكەن لەبەر ئەوەی موسڵمانان پێویستیان پێیەتی، بەڵام لە بارەی كاروبارو دۆزی ئاینەوە هیچ دابەزین و خۆبەكەم زانی تیادا نیە، وە لێبوردنیشی تیادانیە لەگەڵ ئاینی

---

[1] الفتح: ٢٩

بێ باوەڕیدا، جا بۆیە پێویستە ئەوە بزانێت، لەبەرئەوەی ئەم بابەتە لەزۆرێك لە خەڵكی شێواوەو تێكچوە لێیان، لە نێوان ئاسانكاریدا بانگەشە دەكات كە ئیسلام هەمیشە ئاینی ئاشتی خوازی و هێمنیە، وە لە نێوان توند ڕەوێكدا كە وادەبینی بە هیچ جۆرو ڕێگەیەك دروست نیە مامەڵە كردن لەگەڵ بێ باوەڕاندا، هەركام لەم دوو بۆچون و ڕێگە جیاوازە بەهەڵەداچون و بونەوتە بار لەسەر ئیسلام، جا ئەوەی پێویستە خوێندن و لێكۆڵینەوەی ئەم شتانە بكرێ و شارەزای یاساكان و بابەتەكانی كە تیایدایەتی ببین، لەبەرئەوەی ئەو بەشە زۆر گرنگە بە تایبەتی لەم سەردەمەی ئێستادا، خوا باشتر دەزانێ .

وەدرودی سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەرمانﷺ و لەسەر خزمو كەسە نزیكەكانی و هاوەڵەكانی بێت .




پرسیار: ئایا بەستنی پەیماننامە لەگەڵیاندا لەسەر دامەزراندنی پرۆژەکانی سەربازی لەوڵاتی موسڵماناندا بە پشتگیری بۆیان و سەرخستنیان دادەنرێت ؟

وەڵام: ئەوە دروستە لەبەر ئەوەی بۆ بەرژەوەندی موسڵمانانە، ئێمە پێویستمان بەوەیە کە فێری کارو بارە جەنگیەکان و شێوازەکانی شەڕکردن ببینن، وە ئەوان لە ئێمە باشتر شارەزان و زیاتری لێدەزانن، هیچ ڕێگریەك نیە لەوەی کە سودمەندبین لە شارەزای و پسپۆڕییان، وەئەوە لە دۆستایەتی کردن نیە بۆیان ئەوە لە ئاڵوگۆڕکردنی بەرژەوەندییە کە موسڵمان پێویستیان پێیەتی.

پرسیار: کەسی واهەیە فەتوا دەدات بە کوشتنی ئەو بێ باوەڕانەی لە دورگەی عەرەبیدان، بەو هۆیەشەوە دەڵێن کە ئەوانە لەوانە نین پەیمانەیان لەگەڵدا گرێدرابێت وە لەبەرئەوەی دەوڵەتەکانیان موسڵمانان دەکوژێت بە ناوی تیرۆرەوە، جا ئایە ئەم فەتواییە ڕاست و دروستە؟

وەڵام: ئەوە فەتوای نەزانەکان و ئەوانەیە کە بانگەشەی زانست دەکەن و خۆیان بە زانا دەزانن، دروست نیە کوشتنی بێ باوەڕان، ئەوەی کە بە پەیمان هاتوون و هاتونەتە ناوەوە بەبێ باوەڕی و ئارامی لەبەر ئەوەی ئەوە لە ناپاکی و ستەمە کوشتنیان، دروست نیە ئەوە ئەگەر لە دوورگەی عەرەبیشدا بن، دروستە بۆیان کە بێنە ناو دوورگەی عەرەبەوە بۆ بەرژەوەندی گۆڕینەوە لە نێوان ئەوان و موسڵماناندا. یان وەك باڵوێز یان بازرگانی یان دەستی کارو کرێکار کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە جگە لە خۆیان نایزانن ئەوە دروستە هاتنە ناوەوەیان، ئەوەی قەدەغەکراوە نیشتەجێ بوون و مانەوەیان بە بەردەوامی ئەو بێ باوەڕانە جێگیر بن

لە دورگەی عەرەبدا، بەڵام ئەوانە دەڕۆنە دوورگەی عەرەبیەوە بۆ کڕین و فرۆشتن و مامەڵە کردن و پاشان دەچنە دەرەوە ئەوە هیچ ڕێگریەکی تیان نیە، وە ئەو کەسەی کە بێ باوەڕان دەردەکات و ڕێگریان دەکات لە نیشتەجێ بوون مانەوەی هەمیشەی لە دوورگەی عەرەبیدا کاربەدەستە، ئەوە مافی هەمووکەسێك نیە، ڕووی قسە لە کار بەدەستانی موسڵمانە ئەوان دەریان دەکەن ئەگەر تواناو دەسەڵاتی ئەوەیان هەبوو .

پرسیار: ئایە مامەڵە کردن لەگەڵ بێ باوەڕاندا ئەوانەی کە شەڕ لەگەڵ موسڵماناندا ناکەن و لەوڵات و شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان وە دەریان نانێن بە چاکە کردن لەگەڵیاندا ئایە ئەوە لە دۆستایەتی کردن و پشتگیریە ؟ وە ئەوە چۆن دەبێت ؟

وەڵام: ئەگەر چاکەیان لەگەڵ کردین، چاکە یان لەگەڵ دەکەین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾[1]

واتە: (خوا ڕێتان ناگرێ لەو بێ باوەڕانەی جەنگیان نەکردوە لەگەڵتاندا و لە ئایینداو لەماڵ و زێدی خۆتان دەریان نەکردون کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و مامەڵەیان لەگەڵ بکەن بە دادگەری).

ئەوە چاکەیە لەوانەوە، ئەگەر چاکەیان لەگەڵدا کردین چاکەیان لەگەڵدا دەکەین لە کاروباری دونیادا، ئەگەر دیارییەکی پێ بەخشیت تۆش دیاریەکی پێ ببەخشە، پێغەمبەرﷺ دیاری بێ باوەڕانی وەرگرتوە، لەبەر ئەوەی دیاری لە مامەڵەی دونیادا قەیناکاو زەرەری نیە .

[1] الممتحنة: ٨

پرسیار: کەسی وا هەیە دەڵێت: دۆستایەتی کردنی بێ باوەڕان و پشتگیری کردنیان لە سێ ڕووەوە دەبێت:

یەکەم: کە دۆستایەتی کردنێکی تەواو، ڕەهاو گشتگیر بێت کە ئەوە بێ باوەڕی دەرکەری خاوەنەکەیەتی لە ڕیزی موسڵمانان .

دووەم: کە لە پێناوی بە دەستهێنانی بەرژەوەندیەکی تایبەتدا بێت و هیچ لەوێدا نیە کە پەنای بۆ ببات و پاڵی پێوە بنێ بۆ ئەوەی لە ترسێك و هاوشێوەکانی، ئەوە قەدەغەیە و بێ باوەڕی نیە .

سێ یەم: لەبەر هۆکاری ترس بێت لە بێ باوەڕان، حوکم لەوەدا دروستە بە مەرجێ دۆستایەتیەکە ڕووکەش بێت نەك لە ناخەوە بێت .

پرسیار: ئایە ئەو دابەش کردنە ڕاست و دروستە ؟

وەلام: دۆستایەتی کردن دوو بەشە:

یەکەم: دۆستایەتی کردنیان لەبەر دین و ئاینەکەیان، ئەوە بێ باوەڕیەو خاوەنەکەی لە ڕیزی موسڵمانا دەردەکات .

دووەم: دۆستایەتی کردنیان لە پێناو چاوچنۆکی و دەسخستنی دونیادا لەگەڵ ڕق لێبون لە خۆیان و ئاینەکەشیان ئەوە قەدەغەیە و بێ باوەڕی نیە (( نابێت دۆستایەتیان بە هیچ جۆرێ لە جۆرەکان، وە بە هەر مەبەستێك بێت بکرێت چونکە بەرەو قەدەغەکراوو بێ باوەڕی ئەنجامدەرەکەی ڕادەکێشێ .. وەرگێڕ))

پرسیار: کەسێ یارمەتی هاوبەش دانەرانی دا دژ بە موسڵمانان بە چەك یان هەر شتێکی تر زۆر لێکرابوو یان ترسابوو لەسەر نامووسی، ئایە ئەو کەسە هەڵوە شێنەری لە هەڵوە شێنەرەوەکانی ئیسلامی ئەنجامداوە ؟

وەڵام: ئەوە وەکو ئەوە وایە کە باسمانکرد کە ئەگەر زۆری لێکرابوو ئەوا دەبێتە ژێر دەستە و چەوساوەکان وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا ﴿٩٨﴾ ﴾[1]

واتە: (توانای هیچ خۆدەربازکردنێکیان نیەو شارەزای ڕێگەش نین و ڕێ دەرناکەن).

خوای گەورە بێ گومان بەهانەی بۆ هێناوەتەوە ئەگەر هیچ فێڵێ نەزانێ خۆی دەرباز بکات یان هیچ شارەزانیە و ڕێ دەرناکات، وە لەگەڵ بێ باوەڕاندا ماوەتەوە بە ناچاری ئائەوە بە دڵنیای خوای گەورە بەهانەی لێوەردەگرێ، هەروەکو دەفەرموێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴿٩٩﴾ ﴾[2]

واتە: (جا بێ گومان خوا لەوانە ئەبورێ و خوا هەمیشە گوناح پۆشی لێبوردەیە و لە خاوەن بیانوانیش بیانوو وەردەگرێت).

بەمەرجێ ئەو کەسە ڕقی لەبێ باوەڕان بێت، ڕقی لە ئاینەکەشیان بێت .

پرسیار: ئایە دادوەری کردن بەجگە لە وەی خوا دایبەزاندووە لە بێ باوەڕی بچوک یان گەورە؟ وە بەڵگەش چیە لەسەر ئەوە لە پەرتوکەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرﷺ ؟

وەڵام: ئەم بابەتە ڕۆشن و ڕونە لە قسەی زانایان و پێشەوایان، کە هەر کەسێ دادوەری بکات بە جگە لەوەی کە خوا دایبەزاندوە و باوەڕیشی وایە کە ئەوە دروستە یان ئەوە باشترە لە دادوەری خوا یان یەکسانە لەگەڵ دادوەری خوا یان ئەوکەسە

---

[1] النساء: ٩٨

[2] النساء: ٩٩

سەرپشکە ئەگەر بیەوێ دادوەری بە حوکم و بڕیاری خوا دەکات وە ئەگەر بیەوێ دادوەری بە جگە لەو دەکات ئەوە بێ باوەڕە بە کۆ دەنگی زانایان . بەڵام ئەگەر باوەڕی وابێت کە پێویستە دادوەری بەشەرعەکەی خوای بەرزو بەرێز بکرێت وهەر ئەوەش هەق و ڕاستیە، وە حوکم وبڕیار جگەلە خوای گەورە بەتاڵ و پوچە، بەڵام دادوەری کرد بەوە لەبەر بەرتیلێ کە بیدرێتێ یان لەبەر ئارەزویە کە لە دەرونیدایە لە بابەتێ لە بابەتەکان سەرپێچی حوکم و بڕیاری خوای کرد بۆ مەبەستێ لە مەبەستەکانی یان لەبەر ئارەزووی دەروونی یان لەبەر بەرتیل وەرگرتن یان سەرنەوی کردن بۆ یەکێك ئەمە تاوانێکی گەورەیە لە تاوانە گەورەکان، بەڵام بەو کارە لە ئاینی ئیسلام دەرناچێت و بێ باوەڕ نابێت، لەبەر ئەوەی دەزانێ کەئەوە قەدەغەیە و نابێ بکرێت وە هەڵەیە و سەرپێچی کارە، ئەوە دەبێتە تاوانێ لە تاوانە گەورەکان، ئەوە درێژەدان و ڕونکردنەوەیە لەم بابەتە دا .

پرسیار: ئایە خەواریجەکان لە ئەهلی قیبلە دادەنرێت ؟ وە ئایە نوێژ لە دوایانەوە دەکرێت ؟ وە ڕێکخەر چیە لەوەدا کە کێ دروستە نوێژ لەدوایەوە بکرێت لە ئەهلی قیبلە ؟

وەڵام: زانایان جیاوازن لە بارەی خەواریجەوە، ئایە ئەوان بێ باوەڕن، یان ئەو خەواریجانە گومڕاو لە سنور دەرچون ؟ لەسەر دوو قسەیەو قسەی بێ باوەڕ دانیان نزیکترە لەبەر ئەوە بەڵگەکان بەڵگەن لەسەر بێ باوەڕدانانیان، وە هەرچی دەربارەی نوێژ کردنە لە پشتیانەوە ئەوە دروست نیە بەو بەڵگەیەی کە ئەوان بێ باوەڕن، مەگەر

لەبەرئەوەی زاڵبوون بەسەر شوێنێکدا هەروەکو چۆن شەرع زانان باسیان کردووە، ئەوا لەوکاتەدا موسڵمان نوێژ لەدوایانەوە دەکات[١].

پرسیار: کەسێ دەسەلاتداران بە بێ باوەڕ دادەنێت و داوا لە موسڵمانانیش دەکات کەلە ژێر فەرمانی فەرمانڕەواکانیان دەرچن، ئایە ئەو کەسە خەواریجە ؟

وەڵام: ئــەوە ڕێــچکە و ڕێبــازی خەواریجەکانــە ئەگــەر واببینــێ دەرچــوون لەسەرکاریەدەستانی موسڵمانان، وە لەوەش قورستر و توندتر ئەگەر بێ باوەڕی کردن ئائەوە ڕێبازی خەواریجەکانە .

پرسیار: هەڵوێستی ئێمە چیە دەربارەی ئەوانەی دەسەلاتدارانی موسڵمانان بە بێ باوەڕ دادەنێت لەم ڕۆژگارەدا بەهەموو شێوەیەك ؟ ئایە ئەوانە لە خەواریجەکانن ؟ شارەزامان بکە لەو بارەیەوە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە زانیاریتەوە و پاداشتی خێرت بداتەوە .

وەڵام: ئەوانەی کە دەسەلاتداران و فەرمانڕەوایانی موسڵمانان بەبێ باوەڕ دادەنێن ئەوانە لە خەواریجەکانن.

١ وە لە وانەی کە پێیان وایە خەواریج بێ باوەڕن هەروەکو (ابن حەجەری عەسقەلانی ) ڕەحمەتی خوای لێبێت باسی کردووە ( بوخاری و قاچی ئەبوبەکر و سوبکی و قورگبی و کە خاوەنی پەرتوکی ((الشفا)) قاضی عیاوە گێڕاویەتیەوە، وەهەروەها لەخاوەنی (( الروضة ))ئیمامی نەوەوی لە پەرتوکی ((الردة)) تەماشای ((فتح لباری ١٢/٣٠٠)) بکە.

# وانەی دەیەم لەڕاڤەی هەڵوەشێنەری نۆیەم

**زانـای پایـە بـەرز ڕەحمـەتی خـودای لێبێـت فەرمویـەتی (( هـەر كەسێك باوەڕی وابێت كە هەنـدێك خـەڵك بۆیـان هەیـە بچنە دەر لـە شـەریعەتی موحممـەدﷺ هـەروەكو چـۆن خـەضـر بـۆی هـەبوو دەرچێت لـە شـەریعەتی مووسا سـەلامی خـوای لێبێـت ئـەوا ئـەو كەسە بێ باوەڕە )) .**

## ( ڕاڤە )

بێ گومان كە خـوای پـاك و بێگـەرد موحممـەدیﷺ بـۆ هـەموو خـەڵكی نـاردووە و ڕەوانەی كردووە، بە عەرەب و عەجەمیەوە، بەخوێندەوار و نەخوێندەواریـەوە، بـۆ لای هەردوو بەرەی پەری و مرۆڤەكان، جا پێویست بووە لەسەر هـەموو دروسـت كراوەكـان لە پـەری و مـرۆڤ كـە شـوێن پێغەمبـەر ﷺبكـەون، ئـەوەش لـە تایبـەت مەنـدی ئـەوە هەروەكو خۆی ﷺدەفەرموێت: ((كان النبي يبعث إلى قومه الخاصة و بعثتُ إلى النـاس الكافة ))[1] .

واتە: (( هەموو پێغەمبـەرێك بـۆ لای گەلەكـەی خـۆی نێـردراوە بەتـەنها، بـەلأم مـن بۆلای هەموو خەڵكی نێردراوم بەگشتی )) .

---

[1] أخرجه البخاري (٣٣٥)، ومسلم (٥٢١) من حديث جابر بن عبدالله رضي الله عنه .

وەهەروەها خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾[١]

واتە: (ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد ئەی موحەممەدﷺ كە بۆتـەواوی خـەڵكانی جیهـان ببیتە موژدەدەر و ترسێنەر).

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥٨ ﴾[٢].

واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: ئەی خەڵكینە چاك بزانن كـەمن پەیامبـەرو نێـردراوی خوام بـۆلای سـەرجەم ئێـوە نـەك تـەنها بـۆلای هەندێكتان، مـن ئـەو خوایـە نـاردومی كەدەسـەڵات دارێتـی تـەواوی ئاسمانـەكان و زەوی تـەنها هـی ئـەوە، ئـەو نـەبێ هـیچ پەرستراوێ بە هەق نیە، ژیان دەبەخشێ و گیان دەستێنێ، دەسا ئێوەش بە خواو بەو پەیامبەرە هەواڵ دەرە نە خوێندەوارەی خوا بڕوابكەن، كە ئەوە بۆخۆی بڕوای تەواوی بە خواو بە هەموو وشەكانی ئەو هەیە، دەبـێ ئێـوەش شـوێنی بكـەون سـا بـەڵكو بـە ختیارو شارەزای ڕێگەی هەق و ڕاستی ببن) .

وە لەبارەی جولەكەوە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ

---

[١] سبأ: ٢٨

[٢] الأعراف: ١٥٨

ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ [١]

واتە: (باوەڕداری تەواو ئەوانەن دەکەونە شوێنی ئەو پە یامدارو هەواڵدەری خوایە، کە نەخوێندەوارە، ئەو پێغە مبەرەی کەناوو سیفەتە کانی لە تەورات ولە ئینجیلدا نوسراوە لای خۆیان دەستیان دە کەوێ، واتە زۆر بەچاکی دەیناسن،فەرمانیان بە چاکە پێ دەکات ولە شتی خراپ و ناپەسەند ڕێیان لێ دەگرێت وهەموو شتێکی پاك و خاوێنیان بۆ حەلاڵ دەکات و هەموو شتێکی پیس وزیان بە خشیان لێ قەدەغە دەکات وەکو ئارەق وگۆشتی بەرازو ڕیبا، وە بارو تەکلیفی قورس و کۆت وزنجیری لەسەریان شە تەك درابوو لای دەبا، ئینجا ئەوانەی بڕوایان بەو پەیامبەرە هێناو بەڕێزو حورمەتەوە ڕایانگرت و هاوکاری و پشتگیری لێ کرد بە جیهادو تێکۆشان و دوای ئەو ڕوناکیەش کەوتن لە گەڵیا نێردراوە، ئەو خە ڵکانەی ئە مانە سیفە تیان بن بە ختیارو سەرفرازن).

خوای پە روەردگار پێویستی کردوە لە سەر گاورو جولەکە کە شوێن پێغەمبەر موحەمەدﷺ بکەون، وە سەریخەن و ڕێزی لێگرن و بەبەرزی دابنێن ﷺ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( لایسمع بی یهودی ولا نصرانی ثم لایومن بی وبالذی جئت بی الا دخل النار ))[٢].

[١] الأعراف: ١٥٧

[٢] سبق تخريجه .

واتە: (( هیچ کام لە جولەکەو گاورنیە بانگە وازی من ببیستێ و پاشان باوەڕم پێ نەهێنێ وە باوەڕیش بەوە نەهێنێ کە هێناومە کە قورئانە ئەوا بە دڵنیاییەوە دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ))

وەپێغەمبەرﷺ بەدەستی عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێت کۆمەڵێ پەڕەی لەتەورات بینی، پێغەمبەرﷺ پێی ناخۆش بوو سەرکۆنەی کرد لەسەر ئەوە فەرمووی: ((ئەوەچی دەکەیت ئەی کوڕەکەی خەتاب دوای ئیسلام شوێن جولەکە دەکەون، ئەگەربرام مووساﷺ زیندوو بوایە ئەوا بۆی نەبوو وەنەیدەتوانی شوێن هیچی دیکە بکەوێ تەنها شوێنکەوتنی من نەبێت، ئەوجا عومەر ڕەزای خوای لێ بێت فەرمووی: (ڕازی بوون بەوەی خوا پەروەردگارمان بێت، وە بەوەی کە ئاینی ئیسلام ڕێبازو ئاینمان بێت، وە بەوەی محمدﷺ هەواڵدەرو پێغەمبەرمان بێت)))[1].

وە خوای بەرز و بەڕێز پەیمانی وەرگرتوە لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لەسەر ئەوەی کە ئەگەر پێغەمبەر موحممەدﷺ ڕەوانە کرا وە یەکێ لەوان زیندوو بوو ئەوا دەبێت، شوێنی بکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾[2]

١ أخرجة احمد (١٥١٥٦)، وابن ابي عاصم في السنة رقم (٥٠)، و عبدالرزاق في المصنف (١٠١٦٤)، وابن عبدالبر في الجامع (١٤٩٧ )

٢ آل عمران: ٨١ – ٨٣

واتە: (ئەو کاتەیان وەبیر بێنەوە کە خوا پەیمانی پتەوو بەهێزی لە یەکە یەکەی پەیامبەران وەرگرت کە هەرچەندە کتێب و نامەی زانستی وحیکمەتم پێ دابن وە پاشان پەیامبەرێك هاتە ناوتان و ئەوەی ئێوەشی بە ڕاست زانی . خوا هەر ئەو کاتە پەیمانی لێوەرگرتن کە ئەبێ باوەڕی پێ بێنن و هاوکاری و یارمەتیشی بدەن . ئیبن و عەباس دەفەرموێت: خوا هەر پەیامبەرێکی ناردبێت پەیمانی لێوەرگرتوە کە سەرەڕای خۆیشی دەبێت هۆز و گەلەکەشی ئاگادار بکات کە باوەڕ بەو پەیامبەرە بێنن، مەبەست ئەوەیە کە مووسا و عیسا سەلامی خوایان لێ بێت هەر ئەو ڕۆژە بە گەلەکەیان ڕاگەیاندووە کە هەر کات موحەمەدﷺ هات باوەڕی پێ بێنن، جا خوا بە پەیامبەرەکانی وت: ئایە دانتان بەوە دانا و پەیمانەکەی منتان وەرگرت ؟ ووتیان: بەڵێ پەیمانمان داو، هەروا دەکەین، ئەوسا خوا فەرموی: دەسا ئێوە لەناو خۆتاندا بۆئەم بەڵێنە بەشایەت بن،وامنیش لەگەڵتانم و شایەتم لەسەر ئەو پەیمانە * ئینجا هەر کەسێك لەمە بەدواوە لە و پەیمانە پاشگەز بێتەوە و ڕووی لێوەربگێڕێ فاسق و لەسنور دەرچوە . کە وابوو ململانێ وکلاکردنی فەلە و جولەکەکان کە باوەڕ ناهێنن بە موحەمەد ﷺو بەرنامەکەی ڕاکردن لە ڕاستیەکان و خۆدەر بازکردنە لێیان و یاخی بوونیشە لە پێغەمبەرە کانیان * ئاخۆ دینێکیان دەوێ، جگە لە ئاینی خوای خاوەن نامەکان ؟ ئاین و بەرنامەکە ی خوا دەبوێرن، کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بیانەوێ و نەیانەوێ موسڵمان وملکەچی فەرمانی ئەون و هیچ کەسێك ناتوانێ لە ژێر دەسەڵاتی خوا خۆی لابدات و هەموانیش تەنها هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە).

جا بەڵگەکان زۆر ڕوون و ئاشکران لەوەی کە نامەکەی پێغەمبەر موحەمەد ﷺ گشتگیرە، وەئاینە کەشی هەڵوەشێنەری هەموو ئاینەکانە،وەهیچ ئاینێك نامێنێ

لە[illegible] ڕەوانە کردنی موحەمەد ﷺجگە لەئاینی ئیسلام کە هێناویەتی، وە هەر لەبەر ئەوەشە کاتێ پێغەمبەر عیساﷺ لەکۆتا سەردەمدا دادەبەزێت شوێنی پێغەمبەر موحەمەد ﷺدەکەوێت و حوکم بە شەریعەتەکەی کە شەریعەتی ئیسلامە دەکات و دەبێتە شوێنکەوتە بۆ پێغەمبەر موحەمەد ﷺ جا بۆیە هیچ کەسێ بۆی نیە و ناتوانێ دەرچێ لە شەریعەتی موحەمەدﷺلە جنۆکە و مرۆڤەکان، خوای بەرزو بەرێز دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ [1]

واتە: (وەبیربێنەوە ئەو کاتە ئەی موحەمەدﷺ کەنۆ کەس لەجنۆکەکانمان ناردە لات تاگوێ ڕابگرن لە قورئان، ئینجا کاتێ گەیشتن و ئامادەی قورئان خوێندنەکە بوون لە ناو یەکتریدا، وتیان: گوێ بگرن و بێدەنگ بن، ئینجا خوێندنی قورئانەکە تەواو بوو خێرا گەڕانەوە بۆ لای قەومەکەیان بە ئاگادار کردنەوەیان لە سزای خوا، گەڕانەوەو وتیان ئەی گەلەکەمان ! بێ گومان ئێمە گوێمان لە کتێبەکەوە بووە کە لە پاش مووسا دابەزێنراوە، ئیبن و عەباس دەفەرموێت (( ئەو جنۆکانە هەواڵی عیسایان نە ئەزانی): سەلمێنەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی واتە تەورات ئەسەلمێنێ و ددانی پیادا دەنێ: ڕێنمونی دەکات بۆ هەق و ڕێی ڕاست، وتیان: ئەی خزمینە ! وەلامی

---

[1] الأحقاف: ٢٩ – ٣٢

بانگکەرەکەی خوا بدەنەوە و بڕواش بە خوا بێنن لە گوناحەکانتان خۆش دەبێت و لەسزای ئێش گەیەنەریش دەتان پارێزێ * خۆ هەر کەسێك وەلأمی بانگخوازی خوا نەداتەوە ناتوانێ لە زەویدا لە دەستی خوا دەرچێت و هەڵێ و جگە لە خواش هیچ یارو دۆستێکی نییە تا بتوانێ لەو ڕۆژەدا یارمەتی بدات، لێرەدا گفتوگۆی جنۆکەکان تەواو دەبێت، ئەفەرموێ ئەوانەی باوەڕ ناهێنن لە گومراییەکی ئاشکرا دان )) .

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾﴾[1]

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: لەلایەن پەروەردگارمەوە وەحیم بۆ کراوە کە چەند کەسێك لە پەریەکان گوێیان ڕاگرت بۆ قورئان خوێندنەکەم، جا وتیان: بێ گومان ئێمە گوێمان گرت بۆ قورئانێکی سەیرو سەمەرە لە ڕووی هۆنینەوە و ڕەوانبێژی و خۆشخوانینەوە).

جا سورەتی (جن) هەموو پەیامەکەی موحەمەدی ﷺ تیادایە بۆ جنۆکەکان، وە پەیامەکەی ﷺ گشتگیرە بۆ هەردوو بەرەی مرۆڤ و جنۆکە بۆیە لەسەر یانە گوێڕایەڵی بن، وە هەرکەسێ وەلأمی بانگەوازەکەی نەداتەوە و شوێنی نەکەوێ ئەوە لە کۆمەڵی ناو ئاگرە بە دڵنیای لەبەر ئەوەی بێ باوەڕە بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە ئەوانەی دەڵێن کەکەسێ بۆی هەیە لەشەریعەتی موحەمەد ﷺ دەربچێت و گوێڕایەڵی نەبێت و بەڵگەش دێننەوە بۆ ئەو قسەیەیان بە بەسەرهاتەکەی خەضر لەگەڵ مووسا سەلامی خوایان لێبێت، جا بەسەر هاتەکەی خەضر هەروەکو خوای گەورە باسی کردووە لە

---

[1] الجن: ١

قورئان و لە سورەتی کەهف دا کە موسا سەلامی خوای لێبێت هەستاو ووتاری بۆ خەڵکی دا لەناو قەومەکەیدا، جا پرسیاریان لێ کرد: ئایە هەیە لەسەر ڕووی زەوی لەتۆ زاناتر بێت ؟ موساش فەرموی: نەخێر، خوای پەروەردگاریش فەرموی: بەندەیەکم هەیە لە بەندەکانم لە زەویدا ئاواو ئاوایە زانیاری وای لەلایە لای تۆ نیە، واتە لە هەندێك شتدا لەتۆ زاناترە، موسا ﷺ ڕۆیشت بۆلای ئەو بەندەیە تا فێری زانست بێت لای ئەو. خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ ﴾[1]

واتە: (ئەو کاتە وە بیر بێنە ئەی موحەمەد ﷺ کە (( مووسای کوڕی عمران ﷺ)) بە هاوڕێ لاوەکەی خۆی (( یوشعی کوڕی نونی کوڕی یوسف)) ی گوت: من لێ بڕاوم سەفەرێ بکەم و نەگەڕێمەوە هەتا ئەگەمە جەمسەری بەیەك گەیشتنی هەردوو دەریاکە، کەلە زەریای هیندی و لە دەریای سوور لە (( باب المندب )) دا یەکدەگرنەوە، یا خود هەر ماوەیەکی زۆرتریش بچم هەتا دەگەمە مەبەست با ڕێگاکەش هەشتا ساڵ پیادە ڕەو بێت).

هەتا گەیشتە ئەو زەویەی کە خەضری تیادابوو جا پێی ووت: ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ ﴾[2]

واتە: (مووسا سەلامی خوای لێبێت پێی گوت: ئاخۆ مۆڵەتم دەدەیت شوێنت بکەوم؟ واتە ڕوخسەتم دەدەیت کە بەردەوام لەگەڵت بم تا لەو زانستەی لەلایەن

[1] الكهف: ٦٠
[2] الكهف: ٦٦

پەروەردگارتەوە فێر کراویت منیش فێر بکەیت و نیشانمی بدەی بەڵکو کەڵکی لێوەر بگرم لە کاروبارمدا).

مووسا خۆی پیشانی خەضر دەدات و دەیەوێ فێری زانست بێ نایەوێ بە هەڕەشەو توندی و ڕقەوە قسە بکات بەڵکو زۆر بە نەرم و نیانی و ئەدەبەوە وەکو کەسێکی فێرخوازی لای زانایەك خۆی دەردەخات و دەفەرموێت: ﴿ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ ﴾[1]

واتە: (ئاخۆ مۆڵەتم دەدەیت شوێنت بکەوم ؟ تا لەو زانستەی لەلایەن پەروەردگارتەوە فێرکراویت منیش فێر بکەی * خەضر وتی: بەڕاستی تۆ هەرگیز لەگەڵ من هەڵناکەیت، ناتوانی خۆڕابگری لە بەرامبەر ئیشەکانی منەوە، چونکە هەندێ شت دەبینی لە منەوە بەڕواڵەت لەگەڵ شەریعەتەکەی تۆدا ناگونجێت )

تا کۆتای بەسەرهاتەکە . کە کونکردنی و عەیبدارکردنی کەشتیەکەو کوشتنی منداڵەکەو دروستکردنەوەی دیوارەکەی تیادایە، مووسا زۆری پێ سەیر بوو ئەو شتانە ڕوو دەدات لەبەر ئەوەی نەیدەزانی هۆکارەکانی چییە کە بۆ وادەکات، لە دوایدا خەضر بۆی ڕون کردەوە لەبەر چی ئەو کارانە دەکات و هەرهەمووی بە فەرمانی خوای گەورە کردویەتی و فەرمووی: ﴿ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ﴾[2]

واتە: ( دڵنیاشبە لە خۆمەوە نەم کردووە، بەڵکو گشتی بە فەرمانی خوا بووە).

---

[1] الكهف: ٦٦ – ٦٧

[2] الكهف: ٨٢

بەڵکو ئەوانە هەر هەمووی فەرمانی خوای گەورەی لەسەر بووە بۆیە کردومن، وە بە مووساشی گوت: من زانستێکم پێیە کە خوای گەورە فێری کردوم لای تۆنیە و فێر نەکراوی، وە تۆش زانستێکت لایە کە خوای گەورە فێری کردوویت و لای من نیەو فێر نەکراوم ))[1] .

بێ گومان زانایان جیاوازیان هەیە دەربارەی خەضر، ئایە پەیامبەرە یان دۆستێکە لە دۆستانی خوا ؟ دوو قسەیانە هەیە لە بارەیەوە:

قسەی یەکەم: کە ئەو پێغەمبەرە، لەبەر ئەوەی ئەو شتە لە توانا بەدەرانە لە موعجیزەن کە بۆ پێغەمبەر نەبێت شتی وا نابێت و ڕوو نادات لەسەر دەستیاندا .

قسەی دووەم: کە ئەو دۆستێکە لە دۆستانی خواو ئەم شتانەش کە دەیزانێ و ڕوودەدات لەسەر دەستی کەراماتن لە کەراماتی دۆستانی خوا و موعجیزە نین، وەوەکو زانراوە دۆستانی خوا لەسەر دەستیاندا کەرامات و گەلێ شتی لە توانا بەدەر ڕوودەدات .

پاشان ئایە خەضر زیندووە یان مردووە ؟

ئەوەی کە بەڵگەی ڕاست و دروستی لەسەرە ئەوەیە کە مردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾[2]

واتە: (( ئێمە پێش لەتۆ وامان نەکرد مرۆڤێك نەمرێت، ئایە ئەگەر تۆ بمری ئەوانە ژیانی هەتاییان دەبێ ؟! نە، هەرگیز شتی وا نیە )) .

---

١ أخرجه القصة البخاري برقم (٧٤)، ومسلم برقم ( ٢٣٨٠) من حديث إبن عباس رضي الله عنهما عن أبي بن كعب رضي الله عنه .

٢ الأنبياء: ٣٤

خوای بەرز و بەڕێز هەواڵی داوە كە بۆ هیچ كەس نیە ژیانی هەتا هەتای لە دروستكراوەكان، وە هەموو دروستكراوەكان دەمرن، وەكو دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾﴾[1]

واتە: (هەرچی بەسەر پشتی زەویەوەیە هەر هەموو لە نێو دەچێت.

وە خەضر یش بەندەیەكە لە بەندەكانی خوا لە نەوەكانی ئادەم و ئەویش لەناو چونی بەسەردا دێت وەكو هەر كەسێكی تری جگە لەخۆی پاشانیش ئەگەر زیندو بوایە ئەوا بۆی نەبوو واتە نەی دەتوانی كە دەرچێ لە شەریعەتی پێغەمبەرﷺ تەنها ئەوە نەبێت كە بێت بۆلای پێغەمبەرﷺ و شوێنی كەوێت، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺبۆلای هەموو خەڵكی بەگشتی ڕەوانە كراوە و نێردراوە، خۆ ئەگەر زیندوو بوایە لەكاتی ڕەوانەكردنی پێغەمبەردا ﷺ ئەوا دەهات بۆلای و شوێنی دەكەوت، وە باسیش نەكراوە كە هاتبێت بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەوەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە خەضر مردووە و زیندو نیە، هەرئەوەش قسەی ڕاست و دروستە بەڵام هەركەسێ بڵێ كە زیندووە ئەوە هیچ بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرای پێ نیە، وە ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە نامەیەك هەیە دراوەتە پاڵ شیخ الإسلام ( ئیبن و تەیمیە ) كە تیایدا باس كراوە كە

خەضر زیندووە، وە لەچاپیشی دراوە لە (( مجموع الرسائل ))[2].

---

[1] الرحمن: ٢٦

[2] مجموع الفتاوی (٤/ ٣٣٨ ) و في حاشیتها مكتوب (ئابە و شێوە نەم نامەیەم بینیوە ).

بەهەڵەلە كاتێكدا لە نامەیەكی تریدا ژیانی خضر ڕەت دەكاتەوە، وە ئەوەیش بە هەمان شێوە هەر لە ( مجموع الرسائل )[1] دایە، جا ئەو نامەیەی كە دراوەتە پاڵ شەیخی ئیسلام ڕاست نیە كە باسی ژیانی خضر دەكات و دەڵێت زیندووە، وە ئەگەر گریمان ڕاستیش بێت هی ئەوە ئەوا پشت بەنامەكەی دووەمی دەبەسترێت كە بەڵگەی هێناوە لەسەر مردنی خەضر، وەهەرمرۆڤێكیش ئەگەر دووقسەی هەبوو لەسەر بابەتێك یەكیان لەگەڵ بەڵگەكاندا یەكی دەگرتەوەو دووەمیان پێچەوانەی بەڵگەبوو ئەوا ئەوەیان وەردەگیرێ كەهاوڕێكە لەگەڵ بەڵگەكاندا .

وە لەبەر چی خەضر شوێن مووسا ﷺ نەكەوت ؟ .

وەڵام: مووسا ﷺ پەیامەكەی گشتگیر نەبوە، پەیامەكەی تایبەت بوو بە نەوەكانی یەعقوبەوە ﷺ و نەنێردرابوو بۆ هەموو خەڵكی، ئەویش هەروەك هەموو پێغەمبەرانی تر لە پێش پێغەمبەر موحەمەدەوە ﷺ پەیامەكانیان تایبەت بووە بە گەلەكانیانەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( كان النبي يبعثُ الى قومهِ خاصة و بعثتُ الى الناسِ الكافة )[2].

واتە: (( هە رچی پێغەمبەر هەیە نێردراوە بۆ لای گەلەكەی خۆی بەتایبەتی، بەڵام من نێردراوم بۆ هەموو خەڵك بە گشتی )) .

جا مووسا ﷺ بەتەنها نێردرابوو بۆلای نەوەكان یەعقوب ﷺ و ڕەوانە نەكرابوو بۆ هەموو خەڵكی .

---

[1] مجموع الفتاوى (٤/ ٣٣٧).
[2] تقدم تخريجه

جا بۆیە ناوترێ: کە خەضر دەرچووە لە شەریعەتی مووساﷺ، لەبەر ئەوەی هەر لە بنەڕەتەوە لەگەڵی مووساﷺ نەبووە هەتا بووترێ دەرچووە لە شەریعەتەکەی .

## دەرچوون لە شەریعەتی موحەممەد ﷺ چەند جۆرێکە:

لەوانە هەیانە بێ باوەڕیە، وە هەیانە گومڕاییەو بێ باوەڕی نیە . هەیانە دەرچوونی گشتیە، هەیانە لە بەشێکداو لە شتێکدا دەرچووە، جا هەر کەسێك لەشەرع دەردەچێت یان لە بەشێکی دەردەچێت و ئەو دەرچونەشی لێی بە حەلاڵ دەزانێ و پێی ڕەوایە ئەوە بەو کارەی پێی بێ باوەڕ دەبێت، وە ئەو کەسەی دەردەچێ و دەرچونەکەی بە حەلاڵ و ڕەوا نازانێ ئەوە گومڕاییەو بێ باوەڕی نییە .

وە ئەوانەی کە دەڵێن: کە هەندێ خەڵك بۆی هەیە و دەتوانێ لە شەریعەت موحەممەدﷺ دەرچێت هەروەکو چۆن خەضر لە شەریعەتی مووسا دەرچوو، ئەوانە بونیان هەیە ڕۆچووە صۆفیەکانن کەوا دەڵێن .

ئەوانە دەڵێن: ئەگەر صۆفی گەیشتە پلە و ئاستێك لە ناسینی خوا ئەوا پێویستی نیە بە پێغەمبەرﷺ لەبەر ئەوەی ئەو کە صۆفیە گەیشتووە بە خوا، وە دەڵێن پێغەمبەر ﷺ نێردراوە بۆ لای خەڵکی بە گشتی کە نەخوێندەوارو نەزانن، بەلام ئەو صۆفیان تایبەتن لەناو خەڵکیدا و گومانی تیا نیە کە گەیشتون بە خواو پێویستیان بە پێغەمبەر ﷺنیە .

وە دەڵێن: ئێمە زانیاریمان ڕاستەو خۆ لە خواوە وەردەگرین، بەلام ئێوە زانیاریتان لە مردووەکانەوە وەردەگرن، مردوو لە مردووەوە، مەبەستیان بە فەرمودەکان و

زنجیرەی گێڕانەوەی فەرموودەکانە، بەڵام ئێمە ((صۆفیەکان)) لە خواوە ڕاستەوخۆ وەردەگرین . ئاوا دەڵێن ئەو صۆفیانە ؟

بەڵکو ئەوانە دەڵێن: ئەرکیان لەسەر شان نەماوە لەبەر ئەوەی ئەوان گەیشتوون بە خوا، جا بۆیە نوێژ ناکەن، وە خوا ناپەرستن، لای ئەوان پەرستش بۆ خەڵکی نەزانە، وە هەروەها هیچ شتێك لای ئەوان قەدەغە نیە، هەرچی لە فەرمان و قەدەغەکراوەکان و حەڵاڵ و حەرام هەیە لای ئەوان تایبەت بە خەڵکی نەزان و عەوامە کە نەگەیشتوون بە خوا، بەڵام صۆفیەکان بە دڵنیایەوە گەیشتوون: حەڵاڵ و حەرام بۆ ئەوان نیە بۆیە زینا و داوێن پیسی و کردەوەی گەلی لوط کە نێر بازییە و قەدەغەکراوەکان بە ڕەوا دادەنێن وبە حەڵاڵی دەزانن.

وە دەڵێن: ئێمە هیچ شتێکمان لەسەر نیە لە قەدەغەکراوەکان و گەیشتوینەتە مەبەستێ کە دەریکردوین لە بازنەی ئەرك و فەرمان، ئەوانە لە ڕاستیدا گومانی تیانیە کە ڕاست دەکەن لەبەر ئەوەی دەرچوون لە بازنەی ئەرك و فەرمان بۆ بازنەی شێتەکان، لەبەر ئەوەی هەر کەسێ بگاتە ئەو ئاستە ئەوە شێتە هیچ ئەرکێکی لەسەر نیە .

بەڵام ئەوەی کە ئەرکی لەسەر نیە بەرامبەر خوای بەرز و بەڕێز لەبەرئەوەی گەیشتووە بە خوا ئەوە درۆیە بە ناوی خوای بەرزو بەڕێزەوە دەکرێت و بێ باوەڕیشە بە پەیامەکانی خوا، جا بۆیە هیچ کەسێ بۆی نیە کە دەربچێت لە شەریعەتی پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە گەیشتبێ بە پەرستن و زانست و زانیاری بە خوای گەورە . بەڵکو هەتا زانستی زیاد بکات ئەوا بە دڵنیاییەوە گوێڕایەڵی و شوێن کەوتنی بۆ پێغەمبەر ﷺ زیاد دەکات، جا بۆیە پێویستە لەسەری کە گوێڕایەڵ و شوێن کەوتوبێت بە باشی زیاتر

لەوەی کە پێویستە لەسەر کەسێ کە نازانێ واتە: شارەزای زۆری نیە تا بەچاکی خوای گەورە بپەرستێ و گوێڕایەڵی بکات ئەوە مانای قسەکەی زانای پایە بەرزە کە فەرمووی: ((هەرکەسێ گومانی وابێت کە بۆی هەیە بتوانێ لە شەریعەتی موحەمەد ﷺ دەربچێت)) جا هەر کەسێ گومانی وابێت ئەوە هەڵگەڕاوەتەوە لە ئاینی ئیسلام، لەبەر ئەوەی بێ باوەڕە بە قورئان و بە پێغەمبەر ﷺ، بە کۆ دەنگی موسڵمانان و زانایان بە بێ باوەڕیان داناوە، ئەوانەی ڕۆچوون لە صۆ فیەت کە لەم ڕۆژگارەدا زۆرن لە پەرتوکەکانیاندا شتی زۆری لە خورافەو درۆو دەلەسە و زۆر بوێرانە لەسەر خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ گەلێ شت دەڵێن کە هیچی وانیە، وە گومانی تیا نیە کە زانایان هەستاون بە بەر پەرچ دانەوەی گومانەکان و شتە پڕو پوچەکانیان بەتاڵ و پوچ کردۆتەوە، وە لە بەهێزترین ئەوانەی هەستاون بە ڕەد دانەوەیان شیخ الإسلام ( ئیبن و تەیمیە )و قوتابیەکەی ( ابن القیم) ڕەحمەتی خوایان لێبێت، وەهەروەها کۆمەلێك لە زانایانی هاوچەرخیش هەستاون بە بەر پەرچدانەوەیان وەکو (( عبدالرحمان الوکیل)) ڕەحمەتی خوای لێبێت پەرتوکێکی هەیە بە ناوی ( مصرع التصوف ) ((پەرتوکێکە دەربارەی پڕو پوچیەتی صۆفیەکانە بۆیە ئەو ناوەشی لێناوە چونکە پڕ بە پێستی ئەوانە، چونکە کە سانێکی عەقڵ ڕووخاو و شێتن درۆ هەڵدەبەستن و بەڕاست و چەپدا باڵە فڕێیانە وەکو شێتێ کە لەناو خۆڵێکدا باڵە فڕێ دەکات و لەپاشدا فێ لە خۆی بهێنێ، ئەوانە هەرچی بیدعە و خورافات و بێ باوەری و هاوبەش پەیدا کردن نەبێت لای ئەوان ئاین نیەو دژایەتی ئاین پەروەرانیش دەکەن، بۆیە دەیان بینی لەهەموو سەردەمێکدا داردەستی بێ باوەڕان و کردونیان بە مەقاش و بەریان داونەتە گیانی موسڵمانانی یەك خواپەرست قسەی ناشرینیان پێ دەڵێن و هەوڵی کوشتنیان دەدەن و

سوكایەتیان پێ دەكەن تەنها لەبەر ئەوەی كە ئەو خوا پەرستانە پێیان دەڵێن كە واز لە پەرستنی بەندە بێنن‌و بۆ پەرستنی خوای بەندەكان، خوای گەورە بمان پارێزێت لێیان بۆ خاتری ناوە جوانەكانی خۆی، وە ئاگاداری خۆم ومسوڵمانانیش دەكەم بە خوێندنەوەی پەرتوكی جیاوازی لە نێوان دۆستانی خواو دۆستانی شەیتاندا كە دانراوی یەكێك لە دۆستەكانی خوایە كە ئەویش باوكی زانایان ( شەیخول ئیسلام ئیبن تەیمیەیە ڕەحمەتی خوای لێبێت ویارمەتی ئێمەش بدات كەلەڕێی ئەو پیاوە گەورەیەوە زیاتر شارەزابین بۆ خواناسین و تێگەیشتن لە ئاینەكەمان .. وەرگێڕ)

وە ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە عە لمانیەكانیش دەگرێتەوە ئەوانەی كە دەڵێن با (ئاین لە دەوڵەت ) جیا بكرێتەوە، وە كە ئاین و پەرستنەكان لە مزگەوتەكاندا بێت، وە هەرچی مامەڵەو كڕین وفرۆشتن و یاساكانی و یاسا ڕامیاریەكان ئەوا ئەمانە ناچنە ناو ئاینەكەی پێغەمبەر ﷺ واتە نابێت ئاین خۆی لە قەرەیان بدات و ئازادیان بكات و خەڵكی خۆیان كاری تیا بكەن و بە ئارەزوی خۆیان هەڵی سوڕێنن، ئەوە قسەی عەلمانیەكانە، وە دەڵێن: ئاین بۆ خواو نیشتمان بۆ هەموان، وە ئەوانیش خۆیان دەگەیەنن بە پێڕی صۆفیەكان ئەوانەی كە دەڵێن كەسێ بۆی هەیە دەربچێت لە شەریعەتی موحەمەد ﷺ، وەئەو عەلمانیانەش دەڵێن: بۆی هەیە دەربچێت لە شەریعەتی موحەمەد ﷺ لە كارو باری ڕامیاری و مامەڵەكاندا .

وە هەروەها زانایانی زانستی (( كەلام و مەنتیق )) بە شێكیان بەردەكەوێ لەوەدا. ئەوان ئەوانەن كە بابەتەكانی بیرو باوەڕ دەردەكەن لە بەڵگەكانی قورئان وسونەت دەڵێن بەڵگەكانی قورئان و سوننەت بیسەرین (( واتە – دەبیسترێن دەبێت یەكی باسی

بکات و قورئان و سوننەت بخوێنێتەوە و کەسانی دی گوێی بۆ بگرن و ببیستن .. وەرگێڕ )).

گومان دەبەخشن، بەڵام بەڵگە عەقڵیەکان بریتین لەبەڵگە دڵنیا بەخشەکان دڵنیای دەبەخشن، بابەتەکانی بیرو باوەڕ بەڵگەیان بۆ ناهێنرێتەوە بە بەڵگەکانی قورئان و سوننەت لەبەر ئەوەی بەڵگەی گومانـاوین، بەڵام بەڵگەکانی زانستی کەلام و مەنتیق بەڵگەی دڵنیا بەخشە لایان، هەر لەبەر ئەوە دەبینی بیرو باوەڕیان بینا کراوە لەسەر زانستی کەلام و دەمە قرێ و مشتو مڕ و زانستی مەنتیق، وە هیچ کات بە ئایەتێك یان بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بەڵگە ناهێننەوە، ئەوە دەرچونە لە شەریعەتی پێغەمبەر ﷺ لە گرنگترین شتدا کە ئەویش بیرو باوەڕە .

وە ئەوەی کە پێویستە لەسەر موسڵمان ئەوەیە کە شوێن قورئان و سوننەت بکەوێت لە هەموو کارو بارەکانیدا لە پەروەردە و ڕەوشت و لە بیروباوەڕداو لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانە و مامەڵەکردندا و لە خوو ڕەوشت و لە هەموو کاروبارەکاندا، لەبەر ئەوەی پەیامەکەی پێغەمبەر ﷺ گشتگیرو گونجاوە بۆ هەموو کات و شوێنێك تا ئەوکاتەی ڕۆژی دوای دێت، لەبەر ئەوەی ئەوەی دایبەزاندووە خوای بە دەسەڵات و کارزان و دانایە کە دەزانێ ئەوە گونجاوە بۆ هەموو کاتێك تا ڕۆژ ی دوای دێت، ئەوە دابەزێنراوە لەلایەن خوایەکی قسە بە جێ و هەمیشە سوپاس کراوە، وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٌ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾[1]

---

١ فصلت: ٤١ - ٤٢

واتە: (بەڕاستی ئەو قورئانە کتێبێکە هەرگیز ناشکێت و نابەزێ و زۆر بە هێزە ئەتوانێ ڕەدی هەموو جۆرە نکوڵی و نکوڵی کارێك بداتەوە * هەرگیز ڕەفتارو گوفتاری هیچ و پوچی تیا نایەت، نە لەپێش خۆی نە لەپاش خۆی چوون لەلایەن خوایەکی قسە لەجێ و هەمیشە سوپاس کراوەو نێردراوە)

جا بۆیە شەریعەتەکەی شەریعەتێکی گشتگیر و گونجاوە بۆ هەموو کات و شوێنێك بۆ هیچ موسڵمانێك نیە کە لێی دەربچێت و کردەوەی پێ نەکات .

وە هەروەها دەچێتە ناو ئەو هەڵوەشێنەرەوە ئەوانەی دەڵێن کە شەریعەت تەنها بۆ سەردەمی ڕابووردو بووەو بەڵام بۆ ئێستا نە گونجاوەو شەریعەت بە کەڵکی ئەم سەردەمە نایەت، لەبەرئەوەی چەندمامەڵە پەیدابووەو چەندین شت داهێنراوە کە لەشەریعەتدا هیچ لەبارەیەوە نەهاتووەو تیایدا نیە، ئەوەش مانای ئەوەیە کەشەریعەت کورتی هێناوە لای ئەوان وەلەلایەن قسە لەجێ هەمیشە سوپاسکراوەوە نییە، هیچ گومانێکی تێدانیە لەبێ باوەڕی ئەو کەسەی کەقسەی وادەڵێ، وەئەوەش هەر دەچێتە ناو ئەوەی کەوا گومان دەبات دروستە دەرچوون لەشەریعەتی موحەمەدﷺ ودەڵێت: کەشەریعەت ناتوانرێ جێ بەجێ بکرێت بەسەر ئەم سەردەمەدا بەڵکو جێ بەجێ دەبێت بەسەر ئەو سەردەمەی کە ڕابوردووە، ئای کەچەندە زۆرەکەقسەی وادەڵێن . وەپێشەوا مالیك ڕەحمە تی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (( لايَصلِحُ أخرَ هذهِ الامَـةِ ألا ما أصلَحَ أولَها ))[1].

واتە: (( کۆتای ئەم نەتەوەیە باش نابێت تەنها بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پێ باش بوو ))

---

١ و قدروى هذا الاثر إبن عبد البر في تمهيد (٢٩٢/١٥)ط . الفاروق بسند صحيح عن مالك قاله : كان وهب بن كيسان يعقد الينا ولا يقوم أبدا حتى يقول : إعلموا أنه لا يصلح أخر هذه الامر إلا ما أصلح أوله.

وەئـەوەی كـە سـەرەتاكەی پـێ باشـكرد قورئـان وسـوننەت بـوو جـا بـەهیچ جـۆرێ كۆتایەكەشـی چـاك نابێـت تـەنها بـە قورئـان و سـوننەت نـەبێت، شـەریعەتی ئیـسلام گونجاوە بۆ هەموو كات وشـوێنێك تـا ڕۆژی دوای، تۆمـە تبـاری مەكـە بەكـەم كـورتی و ناتەواوی لەبەر ئەوەی خـوای پـەروەردگارو بڵنـد بڕیـاری بـۆ داوە بەتـەواوبوون، خـوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾[1]

واتە: (وا لەم ڕۆوە بەرنامەو ئاینەكەتانم بە پایان گەیانـد هـەموو شـتێكم بـۆ تـەواو كردن، وە نیعمەت و بە خششی خۆمم بۆ تەواو كردن، ئیـسلامیش بەبەرنامـەو ئـاین بـۆ هەڵبژاردن و نابێت هیچ كاتێك لێی لابدەن و خۆ هەڵخەڵەتێنن).

پێغەمبەرﷺ نـەمرد هـەتا دیـن تـەواو چارەسـەر بـوو، وە لـە تەواویـەتی ئـەو ئاینـە ئەوەیە كە دەگونجێ بۆ هەموو سەردەم و بۆ هەموو شوێنێك، وە ئەگـەر نەگونجایـە بـۆ هەموو سەردەم و شوێنێك تەواو نەدەبوو بەڵكو كەم و كورت و ناتەواو دەبوو، وە خوای گەورە شاهیدی بۆ داوە بە تـەواوی ئـەو ئاینـە، وە ئەوانـە دەڵـێن كـە تـەواو نیـە لەبـەر ئەوەی بۆ ئەم سەردەمە گونجاو نیە .

وە هەروەها دەچێتە ناو ئەم هەڵوەشێنەرەوە: هەر كەسێك شتێك زیاد بكاو دایهێنێ لە ئایندا یان شتێكی نوێ بهێنێتە كایە وا گومان ببات كە ئەوە چاكە و خێـرە وە ئـەرە نزیكبونەوە لە خوای بەرزو بەڕێز ئەوە جۆرێكە لـە دەرچـوون لـە شـەریعەتی موحەمـەد ﷺلەبەر ئەوەی بەشی نەكردن ئەوەی خوای گـەورە بـە شـەرعی دانـاوە بـەڵكو ئـەوان

---

[1] المائدة: ٣

هاتوون زیادەیان هێناوە، وە مانای ئەوەیە کە ئەو ئاینە تەواو نیە وە پێویستی بەو زیادانە هەیە کە ئەوان هێناویانە .

وە هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( من عمل عملا ليس عليه امرنا فهو رد))[1] .

واتە: (( هەر کەسێك کارێك بکات لە ئایندا فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە لێی وەرناگیرێت)) .

وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( من احدث في امرنا هذا ماليس منه فهو رد))[2]

واتە: ((هەر کەسێك لەم ئاینەی ئێمەدا شتێك دا بهێنێت کە خۆی لەوە نەبێت ئەوە لێی وەرناگیرێت)).

وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (( واياكم و محدثات الامور فان كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة ))[3] .

واتە: (( ئامان ئاگاداری شتە تازە داهێنراوەکان بن لە ئایندا، چونکە هەموو تازەیەك داهێنراوە، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە )) .

جا دەرچون لە شەریعەتی موحەمەد ﷺ هەموو ئەم جۆرانە دەگرێتەوە، بەڵام هەندێکیان لە هەندێکی تریان توندترو سەختترە، جا هەندێکیان بێ باوەڕی و

---

١ تقدم تخريجة

٢ تقدم تخريجة.

٣ تقدم تخريجة .

هەڵگەڕانەوەیە، وە هەندێکیان گومڕاییەو ناگاتە بێ باوەڕی، وە ئەوەی جەمسەرەکانی صۆفی گەریەتی لەسەریەتی لە دەرچوون لە شەریعەتی موحەمەد ﷺ ئەوە بێ باوەڕیەکی ڕوون و ئاشکرایە .

وە هەروەها هەر کەسێ خۆی دەچوێنێ پێیانەوە لە هەندێ شت و کارو باردا ئەوا بە گوێرەی دەرچونەکەی و خۆچواندنەکەی دەرچونە لە شەریعەتی موحەمەد ﷺوە ئەوەی پێویستە لەسەر موسڵمان پابەند بوونە بە قورئان وسونەتەوە، وە باوەڕی وابێت کە هەردووکیان تەواون و چارەسەرن و گونجاون بۆ هەموو سەردەم و شوێنێك وە بە هیچ جۆرێ گومان و دوو دڵی نەبێت لەوەدا هەمیشەو بە بەردەوامی .

بەڵێ، بەدڵنیاییەوە کە هەندێ لەم شتانە لەلای هەندێ لە خەڵکی شاراوەیە وە هیچ حوکم و بڕیارێك نابینن بۆ ئەو شتانە لە قورئانەکەی خواو سونەتەکەی پێغەمبەرداﷺ، ئەوەش لەبەر کورتی تێگەیشتنیانە نەك لەبەر ناتەواوی قورئان و سونەت بێت، وە ئەگەرنا زانستێکی ڕاست ودروستیان لابوایە و چاوڕۆشن بونایە ئەوا دەیان بینی کە قورئان و سوننەت هەموو ئەو شتانەی مرۆڤایەتی پێویستی پێیەتی دەگرێتە خۆ تا ڕۆژی قیامەت دێت، وە ئەوەش کە ئەوە نابینێ لەسەر یەتی کە تۆمەتباری زانستەکەی‌و تێگەیشتنەکەی بکات نەك قورئان و سوننەت تۆمەتبار بکات و بڵێ: ئەو دوانە ئەوەو ئەوەی تیادا نیە .

پاشان بە هەمان شێوە دەزانین کە کارو باری ئەو شتانەی لەناو خەڵکیدا باون‌و ڕێدراون ناچنە ناو داهێنانەکان لە ئایندا وەکو پیشەو پیشەسازیەکان، وەئەمەش

هاتووە لە قورئان و سونەتدا کە بیان گرێتەوە، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾[1]

واتە: (هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەرهەموو خوا بە میهرەبانی خۆی بۆ ئێوە ڕام کردووە ئەستێرە و کێو و دەریا و ڕووبار و دار و درەخت و ... هتد).

هەتا شتە ڕێدراوەکان وەداهێنانەکان لەژیان و تازە بابەتەکان وپیشەسازییەکان قورئان وسوننەت دەیانگرێتەوە، بێ گومان کەخوای گەورە لەقورئاندا ئامارەی بەکاروبارە دونیاییەکان کردوەوباسی کردون و وەچۆنیە تی سود وەرگرتن لێیان وبەکارهێنانیان وەکو یارمەتیەك بۆ ژیانی ڕۆژانە،بەڵام تێگەیشتنەکانی خەڵکی و ڕێبازو ڕێچکەکانیان کورت بینە لەوەدا کەئەوەش کەمو کورتی و نەنگیە لەهەست کردنی خەڵکیدا، جابۆیە قورئان و سوننەت تەواون و چارەسەرن و گونجاون بۆ هەموو سەردەم وشوێنێك، وە شەریعەتی موحەمەدﷺ زۆر تەواو و چارەسەرە کە ئەویش گشتگیرە بۆ سەرجەم مرۆڤ و جنۆکەکان هیچ کەسێ ناتوانێ لە دوای ڕەوانەکردنی موحەمەد ﷺ دەربچێت لە شەریعەتەکەی هەر کەسێك بێت و هەر پلەو پایەیەکی هەبێت، جا ئەگەر دەرچوو لێی دەرچونێکی تەواو ئەوا بێ باوەڕە، پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت: ((لایَسمعُ بي يهودي ولا نصراني ولم يؤمن بي الا دخل النار))[2].

واتە: (( هیچ جولەکە و گاورێك نیە کە بانگەوازی من ببیستێت و باوەڕم پێنەهێنی ئەوا بێ گومان دەچێتە ناو ئاگر )) .

[1] الجاثية: ١٣
[2] سبق تخريجه

جا ئەگەر ئەوە لە بارەی خاوەن پەرتوکەوە بێت (( جولەکە + گاور )) جا دەبێت چۆن بێت بۆ جگە لەوان ؟ لەبەر ئەوەی پەرتوکی پێشوو تەواو بوو بە هەڵوەشاندنەوە، ئەو قورئانە هەموو پەرتوکەکانی هەڵوەشاندەوە، وە شەریعەتەکەی موحەمەدیش ﷺهەموو شەریعەتەکانی پێشووی هەڵوەشاندەوە وە شەریعەتەکان کاتی دەبن، خوای بەرز و بەڕێز بۆ هەموو نەتەوەیەك ئەوە بە شەرع و بەرنامە دادەنێ بۆیان کە لەگەڵیان بگونجێ و باش بێت بۆیان لە کاتی خۆیدا، وە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ [1]

واتە: (بۆ هەر یەکێ لە ئێوەش ئەی موسڵمانان و ئەهلی کیتاب: یاساو بەرنامەیەکمان دانا بۆ ئەوە کاری پێ بکەن و لێی لانەدەن، واتە: پلە بە پلە بە دوای یەکدا کتێب و بەرنامەمان بۆ ناردن هەتا کۆتا بەرنامە (( قورئانی پیرۆز)) ئیتر پاش هاتنی ئەو دەبێ هەموو لە دەوریا خڕ ببنەوە و کار هەر بەو بکەن).

جا بۆیە بۆ هەموو نەتەوەیەك ئەو بەرنامەیە دادەنێ کە لە گەڵیا دەگونجێ لەکاتی خۆیدا پاشان کۆتای پێ دێت بەبەرنامەو یاسایەکی تر هەتا بەرنامەو یاسای ئیسلام هات لەکاتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەرەوەﷺ تا ڕۆژی دوای بەردەوام دەبێت، ئەو بەرنامەو یاسایەش گشتگیرە بۆسەرجەم و گشتگیرە بۆ شوێن، وە هەروەها گشتگیر یشە بۆ هەموو بەندەکان تا ڕۆژی قیامەت دێت بە هیچ جۆرێ نە دەگۆڕدرێ و نەگۆڕانکاریش تیادا دەکرێت، جا هەرکەسێك وا گومان بەرێت کە پێغەمبەر ﷺ نێردرا بۆ عەرەب بەتایبەتی هەروەکو کۆمەڵێ لەگاورەکان وا دەڵێن ئەوە بێ باوەڕە بەخوای بەرزو بەڕێز، جاهەیە لەگاورەکان کە دەڵێت: موحەمەدﷺ پێغەمبەرەو لەلایەن خواوە

---
[1] المائدة: ٤٨

نێردراوە بەڵام پەیامەكەی تەنهابۆ عەرەبەكانەو بەس، ئەوە بێ باوەڕە بە خوای بەرزو بەڕێز لەبەرئەوەی ملنەدەرو بێ باوەڕە بە گشتیەتی پەیامەكەی، وەهەر لەبەر ئەوەشە هەر كەسێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بكات دوای ڕەوانە كردنی موحەمەد ﷺ ئەوە بێ باوەڕە لەبەرئەوەی خوای بەرز و بەڕێز موحەمەدی ﷺ گێڕاوە بە كۆتای پێغەمبەران، هەروەكو دەفەرموێت: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾[1]

واتە: (موحەمەد ﷺ باوكی هیچ پیاوێكتان نیە، نە زەید و نە كەسی دیكەتان، بەڵكو ئەو پەیامبەری خوایە و دواهەمینی پێغەمبەرانە).

وە كۆتای ئەوەیە كە لە دوایەوە پێغەمبەر نەیەت، وە لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (( سیكون بعدي كذابون ثلاثون كلهم یدعي أنه نبی، و انا خاتم النبین لا نبی بعدي ))[2].

واتە: (( لە دوای من كۆمەڵێك درۆزن پەیدا دەبن كە ژمارەیان سی كەسە هەرهەمویان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە پێغەمبەرن وە من كۆتای پێغەمبەرانم و هیچ پێغەمبەرێك دوای من نییە )) .

جا بۆیە خەڵكی پێویستی بە پێغەمبەر نیە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نێردراوە بۆ پێویستی خەڵكی، وە خوای گەورە دەوڵەمەندی كردوون بە قورئان و سونەت كە

---

١ الأحزاب: ٤٠

٢ أخرجه أحمد ( ٥/ ٢٧٨ )، والترمزی ( ٢٢١٩ )، وابو د اود ( ٤٢٥٢ )، و ابن ماجه ( ٣٩٥٢ )، والحاكم ( ٤/ ٤٤٩ ) وصححه علی الشرط الشیخین، و قال الترمزی : (( هذا حدیث حسن صحیح )).

هەردوكیان بەردەوامن تا ڕۆژی دوایی، جا بۆیە پێویستیان بە پێغەمبەر نیە یان پێویستیان بە یاسا و بەرنامەیەك نیە جگە لە یاسا و بەرنامەی موحەمەد ﷺ.

جابۆیە لە دوای مردنی پێغەمبەر ﷺتا ڕۆژی قیامەت ئەو ماوەیە بەبەرنامەو یاسای ئیسلام پڕكراوەتەوە، بەڵام یاسا و بەرنامەكانی پێغەمبەران لە كاتی خۆیدا كاریان پێ كراوە، هەموو بەرنامەو یاسایەك كاری پێ دەكرێت لە كاتی خۆیداو تێپەڕی ئەو كاتە ناكات، وە كاتێ ئەم یاسا و بەرنامەیە ئەو كاتە فراوانەیە لە كاتی ڕەوانەكردنی پێغەمبەر ﷺ تا ڕۆژی دوای، وە دەوڵەمەندە و نوێگەرە لە یاساكانی و قورئانەكەی و سوننەتەكەیدا، مرۆڤایەتی پێویستی بە پێغەمبەرێك نییە لە دوای موحەمەد ﷺ، وە پێویستی بە پەرتوكێك نییە لە دوای قورئان، وە پێویستی بە بەر نامەو یاسایەك نیە لە دوای بەرنامەو یاسای موحەمەدﷺ، وە لەبەر ئەوە هەركەسێ بانگەشە بكات كە پێغەمبەرەو هەركەسێكیش ئەوە بە ڕاست بزانێت ئەوا بێ باوە، دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە لە ئاینی ئیسلام، وە دەبێتە درۆخەرەوە بۆ خواو پێغەمبەر، كەی ﷺو كۆ دەنگی زانایان لە گشتیەتی پەیامێ كە پێغەمبەری ﷺپێ نێردراوە، جا كەواتە هیچ كەسێ ناتوانێ هەر كەسێك بێت و هەر پلە و پایەكی هەبێت كە دەرچێت لە شەریعەتی موحەمەد ﷺ، وە داوای تێگەیشتنی ئاینەكەی لە خوای گەورە داوا دەكەین وە كردەوە كردنیش بەیاسا و بەرنامەكەی وە داوای لێدەكەین كە بە دوورمان بگرێت لە ڕێچكەی گومڕایی و سەرلێشێواوی . وە درودی خوا لەسەر پێغەمبەرمان موحەمەد ﷺو لەسەر خزمە نزیكەكانی و هەموو هاوەڵەكانی بێت .



**پرسیار:** ئایە ئەوەی بانگەشەی دەرچوون بکات لە شەریعەت و بەرنامەو یاسای موحەمەدﷺ بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووەو دەبێتە بێ باوەڕ؟

**وەڵام:** هەموو ئەو کەسانەی دەرچوون لە بەرنامەو یاسا بانگەشەکاری پێغەمبەرایەتی نییە، وە هەر کەسێ بانگەشەی دەرچوون بکات لە پەرستنداو، وا دابنێ کە پەیوەست نییە بەوەی کە خوا بپەرستێت لەسەر ڕێگاو ڕێبازی پێغەمبەرﷺ نمونەی صۆفیەکان، کە دەڵێن: ئێمە پێویستیمان بە پێغەمبەر ﷺ نیەو ئێمە گەیشتوین و شارەزابووین، وە ئەو کەسەی بانگەشەی پەیامداری دەکات ئەوە جۆرێکی ترە، وە ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە بۆی هەیە و دەتوانێ دەربچێت بێ باوەڕ دەبێت ئەگەر چیش بانگەشەی پەیامداری و پێغەمبەرایەتی نەکات

**پرسیار**: ئایە هەر کەسێك گومانی بێت کە هەندێ خەڵکی بۆیان هەیە و دەتوانن کە دەربچن لەبەرنامەو یاسای موحەمەد ﷺ حوکمی وەکو حوکمی کەسێکە کە باوەڕی بەوە بێت ؟

**وەڵام:** بەڵێ هەرکەسێك گومانی هەبێت لەوەدا کە دروست نییە دەرچوون لەبەرنامەو یاسای موحەمەد ﷺئەوا بەوە بێ باوەڕ دەبێت، بە تەنها گومان و دوودڵی.




زانای پایە بەرز موحەمەدی کوڕی عبد الوهاب ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمویەتی : پشت هەڵکردن لە ئاینی خوای گەورە، خۆی فێر ناکات و کردەوەشی پێ ناکات، وە بەڵگەش فەرمایشتی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾﴾ السجدة: ٢٢

واتە : (کێ لەو کەسە ستەم کارترە کە بە ئایەتەکانی پەروەردگاری ئامۆژگاری دەکرێت کەچی ڕوویان لێ وەرچەرخێنێت ؟ ئەوانە تاوانبارن، بە ڕاستی ئێمەش تۆڵە لە تاوانباران دەستێنین﴾.

( ڕاڤە )

ئەو ئایەتانەی کە بەڵگەن لەسەر بێ باوەڕی و پشت تێکردن زۆرن بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ٣﴾[1]

واتە: (ئەوانە بڕوایان نەهێناوە و ڕوو وەردەگێڕن لەوەی پێی ترسێنراون لە دروستکردنەوەیەکی نوێ بۆ جەزا !).

وە نموونەی فەرمودەی خوای گەورە ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُۚ﴾[2]

واتە: (دەبێ کێ لەو کەسە ستەمکارتر بێت کە بە ئایاتەکانی پەروەردگاری واتە بە قورئان ئامۆژگاری بکرێ کە چی ڕووی لێوەرچەرخێنێت و ئاکامی ئەو کارە خراپانەیش کە بەدەستی خۆی پێشی خستوون لە بیریکردبێ !).

وە نمونەی فەرموودەی خوای گەورە ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ٦١﴾[3]

واتە: (کاتێکیش بەو دووڕووانە بگوترێ: وەرنە لای ئەم بەرنامەو شەریعەتە خوا دایبەزاندووە، وەرنە لای ئەم پەیامبەری خوایە، تا کێشەکانتان بۆ ببڕێتەوە، کەچی دووڕووەکان دەبینی بە توندی ڕووت لێوەرگێڕن و قەتیش بەو بەرنامەو بڕیارەی تۆ ڕازی نابن).

---

[1] الأحقاف: ٣

[2] الكهف: ٥٧

[3] النساء: ٦١

وە نمونـەی فـەرمودەی خـوا: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ ﴾[1]

واتە: (هەر کەسێك لەئاست یادی خوا ڕوو وەرگێڕێ ئەوا ئێمەش شەیتانێکی بۆ دەسازێنین هەردەم هاوڕێ ی دەبێت و لێی جیا نابێتەوە).

وە نمونـەی فـەرمودەی خـوای گـەورە: ﴿وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴾[2] واتە: (وە ئەوەی لە یادی پەروەردگاری خۆی واتە قورئان ڕوو وەرئە گێڕێ خوا دەیخاتە ناو سزایەکی سەختەوە).

وە نمونەی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ ﴾[3]

واتە: (جا ئەگەر لەمنەوە ڕێنمایەکتان بۆهـات، ئەوسـا ئـەوەی پـەیڕەوی لـە ڕێنمـای کرد ئیتر نە لەدونیا گومڕا دەبێ و نە لە قیامەتیشدا بەدبەخت ئـەبێ بـە سـزا . وە هـەر کەسێکیش ڕوو لەو قورئانەم ڕوو وەرگێـڕێ ئـەوە بـێ گومـان ژیـانێکی سـەختی دەبـێ، هەرچەندە خاوەن دونیاش بێ، بەڵێ مرۆڤ هەر کە پەیوەندی لە خوا پچڕا دڵـی تەنگـە،

[1] الزخرف: ٣٦

[2] الجن: ١٧

[3] طه: ١٢٣ – ١٢٦

بچووکە، بێ ئارامە، هەرگیز تێر نابێ، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشر و دادگای ئەکەین * ئەویش لەو هەڵوێستەدا ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم ! بۆچی منت بە کوێری حەشر کرد ؟ خۆ من لە دونیادا چاوم ساغ بوو بینا بووم * خوا لە وەڵامدا دەفەرموێ: کار هەر وایە تۆ بەڵگە و ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەت بۆ هات لە بیرت کرد ئاوا ئەمڕۆش تۆ لە بیر دەچیت، پشت گوێت ئەخەین و فەرامۆشت ئەکەین).

وە نمونەی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾[1]

واتە: (هەر کەبەشێ لە قورئان دەنێردرێت و نهێنیەکانی ئەوانی تێدا بێ و لای پێغەمبەرﷺ بۆ یەکتری ئەڕوانن و لە خەجاڵەتی خۆیاندا دەڵێن: ئاخۆ بڵێی کەسێك لە موسڵمانەکان بتان بینێ ئەگەر بۆی دەرچن و بەجێ ی بهێڵن، لە پاشان خۆیان دەکێشایە دواوەو دەگەڕانەوە و دەردەچوون، یاخوا دڵیان لە باوەڕ وەرچەرخێ چونکە بە ڕاستی خەڵکێکی تێنەگەیشت و نەفامن).

وەنمونەی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾[2]

واتە: (ئەی موسڵمانەکان: بانگکردن لە پەیامبەرﷺ وەك بانگکردن لە خۆتان دامەنێن یا خود بەناوی خۆیەوە بانگی لێمەکەن، وەك ئێوە لە یەکتری بانگ دەکەن

[1] التوبة: ١٢٧

[2] النور: ٦٣

بەڵكو بەو بڵێن (( یا رسول الله، یانبی الله ))، بێ گومان خوا ئاگای لەو كەسانە هەیە كە لەپشت یەكتر خۆ ئەشارنەوە و خۆ ئەدەنە پاڵ یەكتر و خۆ دەدزنەوە لێتان، وە لە مزگەوت یەكەیەكە خۆیان دەكێشایە دەرەوە، بێ مۆڵەت، دەبا ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانەكانی پەیامبەر ﷺ ئەكەن، بترسن كە سەر ئەنجام تووشی بەڵاو نەهاتێك ببن، یان تووشی سزایەكی بە ئێش ببن)

خوای گەورەو پاك و بێگەرد لەم ئایەتانەدا ئاگاداری ئەوانەی كردۆتەوە كە پشت هەڵدەكەن لە یادكردنی قورئان و سوننەتە وە فێرنە بوونیانە وە كارو كردەوە پێنەكردنیانە بە جۆرەها لە هەڕەشە، وە لە پاڵ ئەوەشدا كەوا خوای گەورەو پاك و بێگەرد هانیداوە بۆ فێربوونی زانستی بە سوودو كارو كردەوە پێكردنیشی .

وە خوای پاك و بێگەرد دەفەرموێت: ﴿ ۞ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾[1]

واتە: (هەق نەبوو باوەڕدارەكان هەموو بە جارێ بچنە جیهادو شارو گوندەكان چۆڵ بكەن، با لەباتی ئەوە هەموو بچنە دەرێ، لە ناو هەر دەستەیەك چەند كەسێكیان بچنە دەرێ بۆ ئەوەی لە جموجۆڵەكانی جیهاددا لە كارو باری ئایندا شارەزاو ئاگادار بین و باش تێبگەین كە ئیسلام ئاینی جموجوڵەو كە لە گۆڕپانی جیهادیش گەڕانەوە ناو خێڵی خۆیان بیان ترسێنن و هۆشیاریان بكەنەوە بەڵكو لە نافەرمانی خوا خۆ بە دوور بگرن).

[1] التوبة: ١٢٢

وە پێغەمبەرﷺدەفەرموێت: ((من يريد الله به خيراً يفقهه في الدين ))[١] .

واتە: (( ئەگەر خوای گەورە ویستی چاکەی ببێت بە هەر کەسێك شارەزایی دەکات لە شەریعەتدا)).

جا شارەزابوون لە شەریعەتی و ئایندا و فێر بوونی زانستی بەسود لە نیشانەکانی چاکەن کە خواویستی لێیەتی بۆ مرۆڤ، وە پشت هەڵکردن لە خۆشارەزا لە ئاین و شەریعەتدا نیشانەکانی خراپەن .

١ اخرجه البخاری ( ٧١)، و مسلم ( ١٠٣٧ ) من حديث معاوية بن ابي سفيان ( رضي الله عنهما ).



## فێر بوونی زانست دوو بەشە

**بەشی یەکەم:** بە شێکە پێویستی خودییە لەسەر هەموو موسڵمانێ و هیچ کەسێك بەهانەی بۆناهێنرێتەوە بە نەزانینی، وە ئەوەش ئەوەشە کە ئاینی بەندە دامەزراوە و جێگیر نابێت تەنها بەوەنەبێت لە زانینی و شارەزابوون لە بیروباوەڕی ڕاست و دروستدا وە ئەوشتانەشی کە دژی ئەو بیرو باوەڕە ڕاست و دروستەن یان دەبنە هۆی کەموکورتی تیایدا، وە زانینی یاساکانی نوێژ و زەکات و ڕۆژو و حەج و عومرە، واتە پێنج پایەکەی ئیسلام، جابۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی ژن و پیاو نێرو مێ کە فێریان ببێت، وە ئەگەرنا چۆن دینەکەی بەرپا دەکات وجێ بەجێ دەکات لەسەر شێوەیەکی ڕێك و دروست ئەگەر فێری ئەم پێنج پایەی ئیسلام نەبێت؟.

**بەشی دووەم:** ئەوەی فێربوونی پێویستی بەسیەتیە (( واتە ئەگەر کۆمەڵێك فێری بن بەسەو لەسەر هەموان دەکەوێت و پێویست ناکات تاکە تاکە موسڵمانان فێری بن.. وەرگێڕ )) . نەك لەسەر هەموو موسڵمانێك لەسەر ئەوە پێویستە کە ئامادەی ئەوەی تێدایە، کە بریتیە لە فێربوونی بەشەکانی تری زانستە لە فیقهی مامەڵەو فیقهی میرات و فیقهی ژن مارەبڕین و فیقهی سنورەکانە، وە جگە لەوەش، ئائەو زانستە فێربوونی پێویستی بەسیەتیە لەبەر پێویستی خەڵکی پێی واتە بەو زانستانە، جا ئەگەر کەسێ هەستا بە فێربوونی و بەسی بوو ئەوا لەسەر خەڵکانی جگە لەو دەکەوێ ((واتە – ئەگەر کەسێ بەباشی لە زانستی میرات بزانێ و زاڵ بێت لە زانستەکەدا ئەوا بەسەو پێویست ناکات هەموو خەڵکێ خەریکی فێربوونی زانستی میرات بن . وەرگێڕ))

وە دەمێنێتەوە لە ماڤی خەڵکانی تردا وەکو سونەتێك لە گەورەترین سونەتەکان، لەبەر ئەوەی ناگونجێ بۆ هەموو کەسێك کە فێری ئەم بەشانەی تر ببێت لە زانست،

لەبەر ئەوە فێربونیان بووە بە پێویستی بە سیەتی (( فرض الكفاية )) لەسەر موسڵمانان .

وە پشت هەڵکردن ماناکەی وازهێنانە لە شتێك لەگەڵ نە بوونی خواست و ئارەزوو لێی. (( فێری نابێت )) واتە فێری دینەکەی ئاینەکەی نابێت چونکە حەزو ئارەزووی لێ نییە نەك تەمبەڵ بێت و توانای نەبێت، ئەوە بێ باوەڕ دەبێت لەبەر ئەوەی ئاینی ناوێ، جا ئەگەر پشتی هەڵکرد لە فێربوونی بێ باوەڕە، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئارەزووی لە ئاین بووایە ئەوا فێری دەبوو، وەلەوانە کەسانێك مەن ئێستا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پرۆگرامەکانی خوێندن لە زانستەکانی ئاییندا وردەکاری و تەکنیکی بکرێت لەبەر ئەوەی بە گومانی ئەوان توندڕەوی و ڕۆچون و زیادەڕەوی و تۆقاندن دەڕوێنێ لەناو خەڵکدا، وە هەروەها کەسێ فێری دەبێت بەڵام کردەوەی پێناکات ئەوەش بە هەمان شێوە بێ باوەڕ دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە لە ئاینی ئیسلام بەوەی کەکار بەوە ناکات فێری بووە، جا ئەگەر نوێژ نەکات و ڕۆژو نەگرێت و زەکاتی ماڵی دەرنەکات و حەجی ماڵی خوا نەکات و پێویستیەکانی سەرشانی جێبەجێ نەکات و لە قەدەغە کراوەکانیش دوور نەکەوێتەوە ئائەوە ئارەزووی لە کار کردن نییە ئەوە بێ باوەڕ دەبێت، وەلەوەدا ڕەدی تیایە لەسەر مورجیئەکان ئەوانەی دەڵێن: کە کردەوە پێویست نییە، بەسە باوەڕ بوون بە دڵ و بە ڕاست دانانی بە دڵ و ئەگەر چیش کردەوە نەکات، زانای پایە بەرز لێرەدا دەڵێت: (( ئەگەر کردەوەی پێ نەکات )) واتە: وازی لە کردەوە هێناوە لەگەڵ توانایدا بەسەر کردنیدا و گونجاندنیشی بۆی، نایەوێ کە نوێژ بکات یان ڕۆژو بگرێت یان زەکاتی ماڵی دەربکات یان حەجی ماڵی خوا بکات لەتەمەنیدا جارێ یان نایەوێ دوور بکەوێتەوە لە قەدەغەکراوەکان و پێویستیەکانی سەرشانی جێ بەجێ بکات ئەوە بێ باوەڕ دەبێت لەبەر ئەوەی کردەوە ناکات بە ئاین

وە خـوای بـەرزو بـەڕێز دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ۝٥﴾[١]

واتە: (بێ گومان هەر کەس بڕوای بە بەرنامەی ئیسلام نەبێ و پاشگەز بوویەوە ئەوە بە ڕاستی هەموو کارو کردەوە چاکەکانیشی پووچەڵ دەبنەوە و لە دوا ڕۆژیشدا یەکێکە لە ڕیزی زیان مەندان ).

جابۆیە پێویستە دوو کار بکرێت: فێربوونی کارو بارەکانی ئاین کە بریتیە لەوانەی کە ئاین دانامەزرێ تەنها بە ئەنجامدانیان نە بێت، وەکاری دووەم: کردەوە پێکردنیەتی .

جا بۆیە پێویستە بە فێربوونی زانست و کردەوە پێکردنی، زانست باش نییە بەبێ کردەوە، وەکردەوەش باش نیە بەبێ زانست، ئەو دووانە زانست و کردەوە بەیەکەوە پەیوەستن، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾[٢]

واتە: (هەر ئەوخوایە خۆیەتی پەیامبەری خۆی نارد بەڕێ نیشاندەری ئاین و ڕێبازی حەق وحەقیقەت بۆ ئەوەی بەسەر گشت ئاینەکانی تردا زاڵی کات ئەگەر چی هاوبەش دانەرەکانیش حەزنەکەن و پێیان خۆش نەبێت)

وە ((الهدى )) بریتیە لە زانستی بەسوود، وە (( دین الحق )) بریتیە لەکردەوەی چاك، جا پێغەمبەرﷺ بەو دووانە نێردراوە، ڕەوانە نەکراوە بەتەنها زانست و بەس وە

---

[١] المائدة: ٥

[٢] التوبة: ٣٣

ڕەوانەش نەکراوە بە تەنها کردەوەو بەس بەڵکو بۆ هەردووکیان ڕەوانە کراوەو پەیوەستی یەکتریشن .

وە ئەوانەی کەزانستیان وەرگرت و وازیان لە کردەوە هێنا ئەوانە ﴿ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾[1]

واتە: (خەشم و قینیان بەسەردا ڕژاوە) لە جولەکەکان و لەوانەش کە لەڕێی ئەوانەوە دەڕوات فێری ئاینی خوای گەورە دەبێت و کردەوەی پێ ناکات، وەئەوانەی کە کردەوەیان گرت و وازیان لە زانست هێنا ئەوانە گاورەکانن وەهەر کەسێکیش لەگەڵ ئەوان یەکبگرێتەوە لەوەدا لەوانەی کە خواپەرستن و صۆفیەکان ئەوانەی کە خوا دەپەرستن بەنە زانیی و گومڕای وە خوا ناپەرستن لەسەر زانست و زانیاری، وە دەڵێن: فێربونی زانست ڕێگرە لەبەردەم کردەوەدا، یان دەڵێن ئەگەر کردەوەت کرد ئەوا زانست خود بە خود پێت دەگات بەبێ فێربون، بەوەی کەدڵت دەکاتەوەو زانستت بۆ دێت بەبێ ئەوەی بچیت بۆ لای زانایان و لەسەر دەستیاندا فێری زانست بن، ئا ئەوە قسەی صۆفیە کۆنەکان و تازەکانیشە، خۆبە دووردەگرن لەفێربوونی زانست و دانیشتن لەلای زانایان و دەڵێن: ئەوەی داواکراوخوازراوە کردەوەیە، جا ئەگەر کردەوەت کردو خوات پەرست ئەوا خوای گەورە دەرگای زانستت لێدەکاتەوە بە بێ ئەوەی کەهۆکاری فێربوون بەکاربهێنی، ئا ئەوە گومڕاییە پەنا بە خوا، جاهەرکەسێ وازلەفێربونی زانست بهێنێ لەبەرئەوەی حەزو ئارەزووی لێی نیە بێ باوەڕدەبێت. وەهەرکەسێکیش واز لە کردەوەکردن بەزانست بهێنێ بەشێوەیەکی هەتا هەتای بەهەمان شێوە بەبێ باوەڕ دادەنرێت، وەلەبەر ئەوە زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرمووی

[1] الفاتحة: ٧

(( پشتهەڵکردن لەئاینی خوا، خۆی فێر ناکات و کردەوەشی پێ ناکات))

خۆی فێرناکات و هەوڵێ فێربوون نادات ئەوە ڕێگەو ڕێبازی (الضَّالِّينَ).

واتە: (( گومڕاو سەر لێشێواون )) لە گاورەکان و صۆفیەکان و جگە لەوانیش، وە کردەوەشی پێ ناکات ئەمەیان ڕێگەی جولەکەیە وە هەر کەسێکیش لە ڕێگەیانەوە بڕوات لە هەموو زانایەك کە کردەوەی بە زانستەکەی نەکات .

وە مەبەست لە فێر بوونی زانست کردەوە پێ کردنیەتی، فێری زانست نابێت تەنها لەبەر ئەوەی شارەزا ببێت یان لەبەر ئەوەی پێی بوترێت زانایە یان بۆ پیا هەڵدانی و نایەوێ فێر ببێت بۆ ئەوەی کردەوەی پێ بکات بەڵکو بۆ ئەو شتانەی دەوێت، تەنها بۆ شارەزابوون و پیاهەڵدان و شانازی کردن و ستایشکردن و بەرز بوونەوەی شوێنەکەی لە لای خەڵکی، جا هەر کەسێك ئەوە مەبەست و خواستی بێت ئەوا لەو کەسانە دەبێت کەیەکەم جار ئاگری دۆزەخیان پێ خۆش دەکرێت لە ڕۆژی دوایدا، جا یەکەم کەسێ کە ئاگری دۆزەخی پێ خۆش دەکرێت لە ڕۆژی دوایدا سیانن، تێکۆشەرێك لە پێناوی خودادا و کەسێ خێر دەکات و کەسێ کە فێری زانست دەبێت[١] .

جا ئەو کەسەی تێکۆشەرە و تێکۆشاوە و کوژراوە دێت لە ڕۆژی دوایدا خوای گەورە پێی دەڵێت: چیت کردووە ؟ دەڵێت: ئەی پەروەردگارم تێکۆشاوم لە پێناوی تۆدا هەتا کوژراوم، جا پێی دەگوترێت: درۆت کرد، بەڵام بۆ ئەوە جەنگاویت تا پێت بوترێت: ئەو کەسە ئازایە، بە دڵنیاییەوە وترا، پاشان ڕادەکێشرێت بۆ ناو ئاگر .

---

١ يشير الشيخ – حفيظه الله – الى الحديث الذي أخرجه المسلم برقم ( ١٩٠٥ )، والترمزي ( ٢٣٨٢ )، و النسائي (٣١٣٧)، و احمد (٨٢٧٧) من حديث أبي هريرة ( رضي الله عنه ).

پاشان کەسی خێرکار دەهێنرێت و پێی دەوترێت: چیت کردووە ؟ ئەویش دەڵێت: هیچ ڕێگەیەکم واز لێ نەهێناوە کە تۆ پێت خۆش بێت تیایدا ببەخشرێت تا لەو ڕێگەیەدا بەخشیومە، خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێت: درۆت کرد، بەڵام تۆ بۆیە بەخشیت تا بوترێت: کەسێکی زۆر بەخشندە و دەست بڵاوە، بێ گومان وترا، پاشان ڕادەکێشرێت بۆناو ئاگری دۆزەخ .

پاشان زانا دەهێنرێت و پێی دەوترێت: چیت کرد ؟ ئەویش دەڵێت: لە پێناوی تۆدا فێری زانست بووم و خەڵکیشم فێر کرد، خوای گەورەش دەفەرموێت: درۆت کرد، بەڵام تۆ لەبەرئەوە فێری زانست بوویت تا بوترێت: ئەو کەسە زانایە، بە دڵنیاییەوە وترا، پاشان ڕایدەکێشن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ .

بەوە دەست پێدەکرێت لە پێش بت پەرستانەوە، ئەویش دەڵێت: چۆن ئێمە سزا دەدرێین لە پێش بت پەرستەکانەوە ؟

پێی دەوترێت: ئەوەی کە دەزانێت وەکو ئەو کەسە نییە کە نازانێت، جا کارەکە زۆر گرنگە، کاری فێر بوون و کاری کردەوە کردن، جا هەر کەسێك وازیان لێ بهێنێت یان واز لە یەکێکیان بهێنێت ئەوا دەبێتە هەڵگەڕاوە لە ئاینی ئیسلام ( واتە بەو کارەی لە ئاین هەڵدەگەڕێتەوە ..وەرگێڕ).

وە لەخەڵکی هەیە کە واز لە وەرگرتنی زانست دێنێت ئەگەر پێی بگات خۆی بەزل دەزانێت و مل بۆ هەق نادات و هەق ڕەد دەکاتەوە، ئەوە لەگەڵ خۆ بەگەورە زانانـدا دەبێت، وە ئەوەش لە بێ باوەڕی جۆری خۆبەزلزانینە و مل نەدانە بۆ هەق .

وە لە خەڵکی هەیە واز لە فێر بوونی ئاین دێنێت، ئارەزو و حەزی لێی نییە و پشتی لێ هەڵدەکات، جا ئەوەش لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبێت کە پشت هەڵدەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ﴾[1]

واتە: (ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ڕوو وەر ئەگێڕن لەوەی پێی ترسێنراون لە دروستکردنەوەیەکی نوێ بۆ جەزا !).

وە لە خەڵکی هەیە کە واز لە بەڵگەو وەرگرتنی حەق دێنێت ئەگەر بۆی ڕونبکرێتەوە چونکە بە گومانی خۆی پارێزگاری لە ئاینی باوان و باپیران دەکات خۆی بە پیاو دەزانێ و لوتی بەرزە، هەق وەرناگرێ و لەسەر ئەوە دەمێنێتەوە کە لەسەریەتی، چوزانی باوو باپیرانی لەسەر چی بوون هەروەکو ئەوەی هاوبەش دانەرەکانی لەسەر بوون، ئەوانەی گوڕەکان دەپەرستن هەق و ڕاستی وەرناگرن و گفتوگۆ لایان پەسەند نییە و ڕازی نابن پێی، ئەوان بە تەواوی ڕازین بەوەی کەلەسەرین، هیچ ئامۆژگاری و ڕێنمونیەك وەرناگرن، گوێیان دادەخەن لە وەرگرتنی هەق و ڕاستی، سوورن لەسەر ئەوەی کە ئەوانی لەسەرین، بەڵکو دەشگونجێت لە پێناوی ئەو بەتاڵەی ئەوانی لەسەرن بشجەنگن، وە ئەوەی لە توانایان هەیە خەرجی دەکەن لە پێناو ئەم بیرو باوەڕە پوچانەدا، بە هیچ جۆرێ هەق وەرناگرن لەوەی کە دەیبیستن لە قورئان و سوننەت، وە لەوەی دەی بیبستن لە قەدەغە کردن لە هاوبەش دانەران و فەرمانکردن بە یەکتا پەرستی، وە بەهیچ جۆرێ ئاوڕنادەنەوە بۆئەوەی کە لە قورئاندا هەیە و بەڵکو ئەوان پشتی لێهەڵدەکەن، ئەوەش لە پشتهەڵکردنە لە ئاینی ڕاست و دروستە و ڕازی بوون بە ئاینی پوچ و بەتاڵ، ئەوە لەناو خەڵکی ئەم ڕۆژگارەدا زۆرە .

---

[1] الأحقاف: ٣

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾[١]

واتە: (ئەوانەش بڕوایان بە ناهەق ( پەرستراوی تر ) هەیە حاشایان لە خوا كرد ! ئەوانە لە دونیا و قیامەتدا زیانیان لە خۆداوەو زەرەرمەندن).

جا ئەوانە باوەڕیان بە ناهەق و بەتاڵ هەیەو بێ باوەڕن بە خوا، جگە لەو دەپەرستن و هاوار لە جگە لەو دەكەن داوای فریاكەوتن لە جگە لەو دەكەن، باوەڕیان بە پەرستنی جگە لەو هەیە و بە ئاشكرا و ڕاشكاوانە بێ باوەڕن بە خوا، ئا ئەوە پشتهەڵكردنی بێ باوەڕییە پەنا بەخوا –تەنها لەبەر بە پیاوەتی نازیندا و لەبەر لووت بەرزی .

وە لە كاتێكدا كە ئەبو تالیب لەسەرە مەرگدابوو، وەكو دەزانن هەڵوێستی لەبەرامبەر بانگەواز و پاراستنی پێغەمبەرﷺ و پاراستنی بانگەوازەكە بەڵام نەدەهاتە ناو ئاینی پێغەمبەر ﷺ جا پێغەمبەر ﷺ هاتە لای بەزەی پیایدا هاتەوە و ئەویش لە كاتی سەرە مەرگدا بوو، پێی فەرموو (( یا عم قل لااله الاالله كلمة أحاج لك بها عندالله )) واتە: (( ئەی مامە، بڵێ هیچ پەرستراوێ نیە بە هەق شایەتی پەرستن بێت جگە لە الله، وشەیەكە دەیكەمە بەڵگە بۆت لای خوای پەروەردگار )) لەو كاتەشدا كۆمەڵێ خەڵكی هاوبەش دانەری لابوو كە پێغەمبەر ﷺ ئەم قسەیەی پێ گوت، ئەوانیش پێیان ووت: ئایە واز لە ئاین و گەلی عبدالمطلب دەهێنیت ؟ زانیبویان ئەگەر ئەو بڵێ لاإلە إلاالله ئەوا بێ گومان وازی لە ئاینی عبد المطلب هێناوە كە بریتی بوو لە پەرستنی بتەكان، لە دوای ئەوان پێغەمبەر ﷺ پێی وتەوە، ئەوانیش لە دوای ئەو پێیان وتەوە: ئایە واز لە ئاینی عبد المطلب دەهێنیت، جا ئەبو طالب وتی ئەو مەبەستی خۆی بوو لەسەر ئاینی (عبد المطلب)ە، ڕازی نەبوو بڵێ (لاإلە إلاالله) و لەسەر ئەوە مرد: وەكو

---

[١] العنكبوت: ٥٢

لوت بەرزی و پیاوەتی کردن بۆ ئاینی عبد المطلب و ئاینی هاوبەش بۆ خوا دانان، پشتی هەڵکرد لەوەرگرتنی یەکتا پەرستی بۆیە چووە ناو ئاگرەوە پەنا بە خوا، پاش ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((لأستغفرن لك ما لم أنه عنك)).

واتە: (( سوێند بە خوا داوای لێخۆشبونت بۆ دەکەم تا لێم قەدەغە دەکرێت ))

خوای گەورە ئایەتی دابەزاندوو فەرمووی: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾[1] واتە: (نە پێغەمبەرﷺ ڕێدراوە داوای لێبوردنی بۆ هاوبەش دانەران بکات نە باوەڕدارانیش ئەگەر چی خزمی نزیکیشیان بن، بە تایبەتی پاش ئەوە بۆیان دەرکەوتوە کە دۆزەخین و بۆ کوفر کار دەکەن).

وە لەبارەی ( ابو طالیب ) ەوەئایەت هاتە خوارێ و فەرموی: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾[2]

واتە: (بێ گومان تۆ ناتوانی ئەی پێغەمبەرﷺ کەسێ بخەیتە سەر ڕێی ڕاست و بڕواهێنان کە بۆخۆت خۆشت بوێ هەرچەندە هەوڵ و تەقەلای لەگەڵ بدەیت، بەڵام خوا ڕێنمای هەرکەسێ خۆی بیەوێ دەکات، خۆشی زاناترە بەوانەی کە ڕێبازی هیدایەت دەگرن).

وەسێ کەس چوونە مزگەوت وپێغەمبەریش ﷺقسەی بۆ هاوەڵە بەڕێزەکانی دەکرد، جایەکێ لەو سێ کەسە هات ولەناو بازنەی دانیشتنەکەدا دانیشت بەویستی ئەوەی کە فێرببێت، وەدووەم: شەرمی کرد کەبڕوات و هات و دانیشت، وەسێیەمیان

[1] التوبة: ١١٣
[2] القصص: ٥٦

پـشتی هەڵکردودەرچـووە دەرەوە، جـا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (( الا اخـبرکم بخـبر الثلاثة؟)) قالو بلا یا رسو ل الله . قال ((اما احدهم فقد اوی فـاواه الله ، والثـانی اسـتحیا فاستحیاالله منه، والثالث اعرض فاعرض الله عنه))[١] .

واتە: (( ئایە هەواڵتان بدەمێ دەربـارەی ئـەو سـێ کەسـە هـەواڵیان چـیە )) وتیـان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرموی: (( هەرچی یەکەمیانە بێ گومان خۆی دانیـشت لەناو بازنەی دانیـشتنەکەدا خـوای پـەروەردگاری کـردە پـشت و پـەنای خـۆی خـواش داڵـدەی دا، دوەمیـان شـەرمی کـرد خـوای گـەورەش شـەرمی لێکـرد (( شـەرمی خـوای پەروەردگار تایبەت و لایەقی خۆیەتی ))، وە سـێیەم کەسـیان پـشتی هـەڵکرد و خـوای گەورەش کەسێکی ناوێ کـە بـەوجۆرە بێـت بۆیـە ئـەوی نەویـست، جـا ئـەوە پاداشـتی ئەوانەیە کە پشت هەڵدەکەن لە فێر بوونی کاروبارەکانی ئاینەکەیان .

وە خەڵکانێك هەن لە بانگەواز کارانی خراپ کە دەڵێن: خەڵکی فێری یەکتا پەرستیو بیرو باوەڕی ڕاست و دروست مەکەن، گەنجان و مندالآنی موسـڵمانان فێـری بـیرو بـاوەڕ مەکـەن، لەبـەر ئـەوەی ئەوانــە موسـڵمانن و پێویـستیان بــە فێربــوون نییــە، ئەوانــە موسڵمانن‌و لە کۆمەڵگە و ژینگەیەکی ئیسلامیدا دەژین و پێویستیان بەوە نیە کە فێـری یەکتاپەرستی ببن .

ئایە ئەوە لە پشتهەڵکردن نیە لە فێر بوونی ئاین ؟

ئەوە پشتهەڵکردنە لە فێربوونی ئاین، لەبەر ئەوەی ئاین بە میرات وەرناگیرێ و بەوە نیە ژینگەیەکی ئیـسلامیە، بـەڵکو ئـاین بـە زانـست و فێربـوون وەردەگـیرێ، جـا بۆیـە دەبێت و پێویستە بە فێربوونی ئاین و فێرکردنی خەڵکی تریش و کارکردن بەو زانستەی وەریگرتوە، جا ئەو کەسەی ئـاین فێرنابێـت چـونکە حـەزی لێـی نییـە، وە کردەوەشـی

[١] اخرجة البخاري ( ٦٦)، و مسلم ( ٢١٧٦ )، و الترمذي ( ٢٧٢٤ )، والترمذي ( ٢٧٢٤) من حديث ابي واقد الليثي رضي الله عنه

پێناکات ئەگەر فێری بوو ئەگەر بیشیلێت (لا الـه الا الله ) ئـەوە هەڵگەڕاوەیـە لـە ئـاینی ئیسلام و ئەنجامدەری هەڵوەشێنەرێکە لە هەڵوەشـێنەرەوەکانی ئیـسلام، ئـەو کـارەش ترسناك و مەترسیدارە .

وە پشتهەڵکردن ئەگەر لە فێر بوونی بنچینەکانی ئاین و بیروباوەڕ بێت و حەزیان پێ نەکات و ئارەزووی لێیان نیە ئائەوە هەڵوەشێنەرێکە لە هەڵوەشـێنەرەوەکانی ئیـسلام، بـەلأم ئەگـەر پـشتهەڵکردنەکە لـە فێربـوونی وردە کاریـەکانی ئـاین و وردەکـاری و بابەتەکانی یاسا فیقهیەکان بوو بەهۆی تەمبەڵی یان خـۆ یەکلانەکردنـەوەیان بـۆ ئـەوە، ئـەوە سەرپێـچیە و بـە هەڵوەشـێنەرێك لـە هەڵوەشـێنەرەوەکانی ئیـسلام ناژمێردرێـت، بـەلأم بنـچینەکانی ئـاین کـە ئـاین بەنـدە بەوانـە نـەبێت دانامـەزرێ جـا هـەر کەسـێك پشتهەڵکات لە فێربوونیـان و خـۆی بـە دوور بگرێـت لێیـان ئـەوا بـەوە ئیـسلامەتیەکەی هەڵدەوەشێتەوە، بەلأم کـارو بـارە وردەکاریـەکانی تـر و یاسـاکانی مامەڵـەکردن وەکـو پێشتر باسکرا ئەوە پێویستی بەسیە تیە(( فرض کفایة ))، جابەوە دەبنە وازلێهێنەر لـە سوننەت و کەمتەرخەم دەبن لە فێر بوونی شەرع و یاساکانیدا لەبەر کـەمی چـالاکیان و جوڵەیان لەو پێناودا یان تـەمبەڵیان یان تێنەگەیشتنیان، لەبەر ئەوەی هـەر کەسـێ واز لە زانستێ بێنێت کە فێربوونی پێویستی بەسـیەتیە دەبێتـە وازلێهێنـەری سـوننەت یـان وازلێ هێنەری سوننەت یـان وازلێهێنـەرێ بـۆ واجبێـك، جـا بۆیـە پێویـستە ئـەم شـتانە بزانێو شارەزاییان ببێت، وە ئەم وردەکاری و ڕێکخەرانە بزانێ لە پـشتهەڵکردندا، کـەی دەبێتە بێ باوەڕی ؟ وە کەی دەبێتە سەرپێچی ؟

بەهەر حاڵ فێربـوونی زانـست گومـانی تیـادا نیـە کـە ئەوەیـە ژیـان وەهـەر ئەویـشە ڕۆشنایی، وە ئەوە کە خوای بـەرزو بـەڕێز فـەرمانی پێکـردوە، وە پێغەمبەرەکـەی ﷺ فەرمانی پێکردوە و هانی داوە بـۆ فێربـوونی، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (( مـن سـلك طریقا یلتمس فیه علما سهل الله له به طریقا الی الجنة، وما اجتمع قوم في بیـت مـن بیـوت

الله يتلون كتاب الله و يتدار سونهُ بينهم الا نزلت عليهم السكينة و غشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة و ذكرهم الله فيمن عنده ))[1].

واتە: (( هەر کەسێ ڕێگەیەك بگرێت تا تیایدا فێری زانست بێت خوای گەورە ڕێگەی بەهەشت بۆ ئەو کەسە ئاسان دەکات کە بیخاتە ناویەوە، وە هیچ کۆمەڵێ نیە کۆ ببێتەوە لە ماڵێ لە ماڵەکانی خودادا واتە لە مزگەوتێکدا کە پەرتوکەکەی خوا قورئانەکەی دەخوێننەوە و دەیخوێنن لە ناو خۆیاندا بەیەکتر دەڵێینەوە و خۆیان شارەزا دەکەن لە ماناو مەبەستەکانی ئەوا بێ گومان دڵ ئارامی و هێمنی دادەبەزێتە سەریان و سۆز و بەزەی خوا دایان دەپۆشێ و فریشتەکان چوار دەوریان دەگرن و خوای گەورەش باسیان دەکات لای ئەوانەی لای خۆین ))وە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( وان الملائكة لتضع اجنحتها لطالب العلم . رضا بما يصنع ))[2]

واتە: (( فریشتەکانی خوای پەروەردگار باڵەکانی دادەنێ بۆ فێر خوازان زانستی شەرعی وەك ڕازی بونێك بەوەی دەیکات کە فێربوونی زانستە )) ئائەوە هاندانە بۆ فێربوونی زانست و ڕووتێکردنیەتی تا ئاینی بەندەی پێ دامەزراو تر بێت و تا بتوانێت بەهۆی ئەو زانستەوە سودمەند بێن و جگە لە خۆشی سودمەند بکات، وە گومانی تیادا نیە ئەگەر زانست و زانایان نەمان ئەوا نەتەوەی ئیسلام تیادەچێت و دەفەوتێت وەکو پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت: (( إن الله لايقبض العلم إنتزاعا ينتزعه من صدور الرجال ولكن يقبض العلم بقبض العلماء فإذا لم يبقا عالم اتخذ الناس رؤوسا جهالا فأفتوا بغير علم فضلوا واضلوا ))[3]

---

١ اخرجه مسلم ( ٢٦٩٩) من حديث ابي هريرة ( رضي الله عنه ) .

٢ جزء من حديث تقدم تخريجه .

٣ اخرجه البخارى ( ١٠٠)، ومسلم ( ٢٦٧٣ ) من حديث عبد الله بن عمر العاص ( رضي الله عنهما ).

واتـــە: (( خـــوای گـــەورە ئەوزانـــستە هەڵناكێـــشێتەوەو وەریناگرێتـــەوە بـــە هەڵكێشانەوەیەك لـەدڵی پیاواندا بـەڵام دەیگرێتـەوەو دەیـسێنێتەوە بـەمردنی زاناكـان، جائەگەر زانا نەماو خەڵكانێكی نەفام مانەوە ئەوا خەڵكی كۆمەڵە سەركردەیەكی نەزانو نەفام دەكەنە پێشەواو دەمڕاستی خۆیـان كەبـەئارەزوو بۆچـونی خۆیـان فـەتوا دەدەن لەكاتێكدا كەپرسیاریان لێ دەكرێت، جاخۆیان گومڕا دەبن و خەڵكیش گومڕادەكەن ))

جابۆیـە دەبێـت فـەتواو وەڵام دانـەوەی پرسـیار بەزانیارییـەوە بێـت و بەبەڵگـەی قورئانو سوننەت بێت وە ئەگەرنا دەبێتـە گـومڕای و تیاچـوون . ( ئـەوەش ڕوونـادات مەگـەر بـەفێربوون پـێش لەدەسـت چـوونی دەرفـەتی فێربـوون مـادام زانایـان بوونیـان هەبێت).

پێش ئـەوەی كـەزانا نـەمێنێت، جائەگـەر زانـا نـەما ئـەوا خـەڵكی پـەنا دەبەنـە بـەر نەزانەكان و بەناو خوێنەواروزاناكان و قورئان خوێنە نەزانەكان كە لەواتاو مەبەستەكانی تێناگەن، ئەوانیش فـ ـایان بـۆ دەدەن بـەبێ ئـەوەی زانـستیان بـەو پرسـیارە هـەبێت كەئاڕاستە یان دەكرێت لەلایەن ئـەو خەڵكانـەوە كەئـەوانیان بەدەمڕاسـت و زانادانـاوە، خۆیان گـومڕا دەكـەن چـونكە بـەبێ بـوونی زانـست قـسەیان كـردوەو خـەڵكیش گـومڕا دەكەن چونكە ئەو خەڵكە بەگوێرەی فەتواكەی ئەوان ڕەفتار دەكەن .

# وانەی دوانزەیەم لە کۆتای ڕاڤەی دە هەڵوەشێنەرەکە

**زانای پایە بەرز ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) فەرمویەتی :**
**((جیاوازی نییە لە هەموو ئەم هەڵوەشێنەرانە لە نێوان گاڵتەکارو کەسێ بە ڕاستی بێت و کەسێ بترسێت جگە لەزۆر لێکراو)).**

## ( ڕاڤە )

**ووتەی: (( جیاوازی نیە لەم هەڵوەشێنەرانە )) جیاوازی نیە لە هەموو ئەم هەڵوەشێنەرانە (( لە نێوان کەسێ بە گاڵتەی بێت و کەسێ بە ڕاستی بێت )) گاڵتەکار کەسێکە گاڵتە چیە کە قسیەك دەڵێت هەڵگەڕانەوەی تیادایە ئەویش گاڵتە دەکات، وەکەسێ بەڕاستی بێت ئەوکەسەیە کە مەبەستی هەیە لەوەی چی دەڵێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە چیرۆکی ئەوانەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردوون، لەگەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ لەجەنگی تەبوکدا جا دانیشتن و قسەیان دەکرد و یەکێ لەوان وتی: ((نەمان بینیوە وێنەی ئەو قورئان خوێنانە – مەبەستی هاوەڵان بوو – زمان درۆزن و سکەڕۆ و ترسنۆك بن لە کاتی بەرەنگاربوونەوە و گەیشتن بەدوژمن )) مەبەستیان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ڕەزای خوایان لێ بێت بوو – وەلەو کاتەدا یەکێك لەگەڵیاندا دانیشتبوو کە گەنجێك بوو ناوی (( عەوفی کوڕی مالیك )) بوو چوەوە بە گژیانداو بەو کابرایەی کە قسەکەی کرد ووتی: درۆت کرد، بەڵام تۆ بۆیە وا دەڵێی چونکە دوو**

ڕوویت، سوێند بێت بەخوا هەواڵ دەدەم بە پێغەمبەر ﷺ، جا ڕۆیشت بۆ ئەوەی هەواڵ بدات بە پێغەمبەر ﷺ جا بینی کە نیگا و وەحی پێشی کەوتوە دەربارەی هەواڵ دان بەوەی ئەوان وتیان، پاشان ئەوانە هاتن تا بیانوو پۆزش بێننەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو قسەیەی کە کردیان، جا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە قسەیەکمان دەکرد کە سوارەکان دەیکەن تا ڕێگەی پێ ببڕن و بێ تاقەت نەبین، پێغەمبەریش ﷺ، ئاوڕی نەدایەوە بە لایانداو لە خوێندنەوە ئایەتەکە زیاتری نەدەوت کە دەفەرموێت:

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ ﴾[١]

واتە: (ئەگەر لێیان بپرسیت: سەبارەت بە گاڵتە کردن بە خواو ئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستمان نەبوەو، بەڵکو تەنها گاڵتەو گەپمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایە گاڵتە کردن بە خواو ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردبوو؟، بڵێ: بڕوبیانوی بێجێ مەهێننەوە، چونکە پاش ئەوەی باوەڕتان هێنا بێ باوەڕ بونەوە).

پێی فەرموون: بە دڵنیایەوە بێ باوەڕ بون دوای ئەوەی باوەڕتان هێنابوو[٢].

لەگەڵ ئەوەی ئەوان دەڵێن: ئێمە بەڕاستمان نەبووە بەڵکو گاڵتەو گەپمان دەکرد، خوای گەورەی پاك و بێگەرد و پێغەرەکەی ﷺ بیانوەکەیان وەرنەگرت و پۆزشی بۆ نەهێنانەوە، جا بۆیە بە هیچ جۆرێ جیاوازی نیە لە نێوان کەسێ بە گاڵتەی بێت یان بەڕاستی بێت.

---

١ التوبة: ٦٥ – ٦٦

٢ تقدم تخريجة

وەوتەی (( کەسێ بترسێ )): کە ووشەی بێ باوەڕی دەڵێت یان کردەوەی بێ باوەڕی دەکات لە ترسی بێ باوەڕان بەهانەی بۆ ناهێنرێتەوە، بەوەی کە بڵێت: ووشەی بێ باوەڕی یان کرداری بێ باوەڕی بکات وەکو ئەوکەسەی بۆ جگە لە خوا ئاژەڵ سەر ببڕێت یان جنێو بە ئیسلام و موسڵمانان بدات لەبەر ئەوەی لە بێ باوەڕان دەترسێت یان لە شتێ دادەبەزێ و سەر شۆڕ دەکات بۆ بێ باوەڕان لە ئاینەکەی، لەبەر ئەوەی ئەوە سەر شۆڕ کردنە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ۝٩﴾[1]

واتە: (ئاواتە خوازن کە تۆ نەرمی بکەیت لە ئاینەکەتدا دەربارەی بیرو باوەڕەکەت، جا ئەوانیش ئەو کاتە نەرمیت لەگەڵ بکەن و ڕێکبکەون).

وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَبِهَٰذَا الْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ۝٨١﴾[2]

واتە: ( ئایە ئێوە هەر بەم قورئانە باوەڕ ناکەن ؟! ).

وە خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ ۖ وَإِذًا لَّاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ۝٧٣ وَلَوْلَا أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا ۝٧٤﴾[3]

واتە: (بێ گومان ئەوەندەی نەمابوو هاوبەش دانەران و بێ باوەڕەکان سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە بە وەحی بۆمان ناردووی کلات بکەن و لەخشتەت بەرن و لەهەندێ

---

[1] القلم: ٩

[2] الواقعة: ٨١

[3] الإسراء: ٧٣ – ٧٤

فەرمانمان بترازێیت، تا شێوازی بانگەوازەکەت بگۆڕی و غەیری قورئانیان بۆ بخوێنیتەوە و درۆ لەسەر ئێمە هەڵبەستیت، ئیتر دەیانکردی بە دۆست و خۆشەویستیان دەبوویتە پیاوی چاك).

جا لەبەر ئەوە سەرشۆڕ کردن لە ئاینی خوای گەورەدا دروست نییە ئەگەر چیش مرۆڤ بترسێت بەڵکو پێویستە لەسەری کە دەست بە ئاینەکەیەوە بگرێت لەگەڵ ترسیشدا تا ئەو کاتەی نەگاتە ڕادەی زۆر لێکردن ئەوا دروستەبۆی شتێکیان بداتێ لەوەی داوایان لێکردووە تا زۆر لێکردنەکەی لێ دوور دەکەوێتەوە بەمەرجێ دڵەکەی دامەزراو بێت بە باوەڕ .خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ﴾[1]

واتە: (مەگەر لێیان بترسن و بتانەوێ لەشەڕیان خۆ قوتار بکەن و خۆ بپارێزن، ئەوا لەو کاتەدا چاك وایە بە ڕواڵەت دوژمنایەتی و دژایەتی نەکرێن).

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا ﴾[2]

واتە: (مەگەر کەسێك زۆری لێکرابێت و لەو کاتەشدا دڵنیابێ بە ئیمان، بەڵام کەسێك بە پێخۆشبوونی خۆی سینگی بۆ بێ باوەڕی فراوان و گوشاد بکات و کوفرەکەشی پێ خۆش بێت).

---

[1] آل عمران: ٢٨

[2] النحل: ١٠٦

## بۆیە دەبێت ئەم مەرجانەی تیادا بێت

**مەرجی یەكەم:** دەبێت زۆری لێكرابێت نەك بترسێت بە تەنها وە خۆی نەباتە پێشەوە بۆ لای بێ باوەڕان تا پێگەیەك بۆخۆی لایان دروست بكات یان لێیانەوە سودێكی دەست كەوێت، بە هیچ جۆرێ دروست نییە خۆ بردنە پێشەوە بۆ لای بێ باوەڕان لە ئاییندا .

**مەرجی دووەم:** كە دەبێت دڵەكەی ئارام و دامەزراو بێت بە ئیمان و باوەڕ بەڵكو دەبێت بە تەنها بە زمان بیڵێ لەگەڵ مانەوەی باوەڕ لە دڵەكەیدا .

**مەرجی سێیەم:** كە دەبێت مەبەستی دورخستنەوەی زۆر لێكردن بێت نەك ڕازیكردنی بێ باوەڕان، هەروەكو لە عەماری كوڕی یاسر ڕەزای خوای لێبێت ڕوویدا كە ئەو هۆكاری دابەزینی ئەم ئایەتە بوو، كە ئەویش ئەوە بوو بێ باوەڕان گرتیان و زۆریان لێكرد لەسەر ئەوەی كە جنێو بدات بە پێغەمبەرﷺ، وە بەریان نەدا هەتا ئەوەی نەوت بە پێغەمبەر ﷺكە دەیانویست، پاش ئەوە هات بە ڕوویەكی پەشیمانیەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺپێی ووت (( كيف تجد قلبك ؟ ))

واتە: (( دڵەكەت چۆن دەبینیت )) عەمار فەرمووی: دەیبینم ئارام و دامەزراوە بە ئیمان و باوەڕ، جا پێغەمبەر ﷺفەرمووی: (( ان عادوا فعد))[1]

واتە: (( ئەگەر گەڕانەوە ئەوا تۆش بگەڕێوە بۆ سەر بارەكەی خۆت )) .

---

[1] تقدم تخريجه .

جا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾[1]

واتە: (هەر كەسێك پاش بڕواهێنانی بە خـوا، كـافر و بـێ بـاوەڕ بێتـەوە بـێ گومـان سزای توند دەدرێ و دەكەوێتە بەر قەهر و تووڕەی خوا، مەگەر كەسێك زۆری لێكرابێ و لەو كاتەشدا دڵنیا بێ بە ئیمان وەكو عەماری كوڕی یاسر خوا لێیان ڕازی بێـت، بـەڵام كەسێك بە پێ خۆشبونی خۆی سینگی بۆ كوفر فراوان بكات و كوفرەكەشی پێ خـۆش بێت ئەوە قەهر و تووڕەی خوایان لەسەر دەبێت و سزایەكی گەورەشیان لە دواڕۆژدا بـۆ هەیە * چونكە ئەوان ژیان و گوزەرانی ئەم دونیایەیان هەڵبـژارد بەسـەر پاشەرشـۆژدا، وە هەڵبژاردنی دونیا بەسەر پاشە ڕۆژدا بێ باوەڕ بونە، بێ گومان خواش خەڵكانی بـێ باوەڕو كافرو شارەزا ڕێنمونی ناكات بۆ سەر ڕێی ڕاست).

جا هەر كەسێك دابەزێت لە شتی ئاینەكەی لە پێناو بـە دەسـت هێنـانی تـەماحێكی دونیایی یان لە پێناو ڕازیكردنی بـێ باوەڕانـدا یـان لەبـەر ئـەوەی خـۆی باتـە پێشەوە لایان ئـەوە دەبێتـە كەسـێكی تەڵەكـە بـازو بـەزیو و سەرشـۆڕ لـە ئـاینی خـوای بـەرزو بەڕێزدا، بە پێچەوانەی خۆ پاراستن كە هەندێ جار ناچار دەبێت پـەنای بـۆ ببـات كـە ئەویش لە پێناوی دوورخستەوەو نەهێشتنی زۆر لێكردندایە، وە كـە ئـارام دەگرێـت لـە

[1] النحل: ١٠٦ - ١٠٧

سـەر ئـازارو دەرفـەت و ئاسـانکاری  وەرناگرێـت هـەروەکو چـۆن پێـشەوا ئەحمـەد ڕەحمەتی خوای لێبێت لەکاتی ئاژاوەی دروسـتکردنی قورئانـدا کـردی باشـترە لـەوەی دەرفەت و ئاسانکاری وەربگرێت .

**زانای پایە بەرز محمد ی کوڕی عبد الوهاب ڕەحمەتی خـوای لێبێـت فەرمویـەتی (( وە هــەر هــەموویان لــە گەورەترینی ئەوانەن کە مەترسیدارن و زۆریش لەوانەن کە ڕوودەدەن )) .**

## ( ڕاڤە )

بۆچی زانای پایە بەرز ئەم دە هەڵوەشێنەرەی هەڵبژارد لەگەڵ ئەوەی کە هەڵوەشێنەرەکان زۆرن ؟

لەبەرئەوەی ئەم دە هەڵوەشێنەرەی هەڵبژارد لەبەر ئەوەیە کە لەناو هەڵوەشێنەرەکاندا ئەمانەیان زۆر ڕوو دەدەن لە ناو خەڵکیدا، وە لەبەر ئەوە خراپترینیانن لە مەترسی و ترسناکیدا، لەبەر دوو هۆ هەڵیبژاردووە .

**یەکەم:** لەبەر ئەوەی زۆر ڕوو دەدەن لەناو هەڵوەشێنەرەکاندا .

**دووەم:** توندترینی هەڵوەشێنەرەکانە لە ڕووی مەترسیەوە .

وە هەر چیەکیش وەکو ئەوە وابێت ئەوا جێگەی گرنگی و بایەخدان و ئاگاداربوونەو پێویستە هۆشیاربین لە بارەیەوە .

زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خودای لێبێت فەرمویەتی:
(( جا بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان کە ئاگاداریان بێت و بترسێت لێیان لەوەی کە تووشی بێت)).

( ڕاڤە )

وتەی (( جا بۆیە پێویستە )) واتاکەی پێویستە، واتە پێویستە لەسەر موسڵمانان کە بترسێن لەوەی بکەوێتە ناویەوەو تووشی ببێت .

وتەی (( ئاگاداریان بێت )) واتە: پاکانەی خۆی نەکات و بڵێت من شارەزام و من پێویستم بەوە نیە کە فێریان ببم، وە خەڵکیش پێویستیان بەوە نییە کە فێری یەکتا پەرستی ببن و بیخوێنن و خەڵکی موسڵمانن، پارێزراون لە مەترسی، وە مرۆڤ تا ئەو کاتەی لە ژیاندا بێت ئەوە دەگونجێت دووچاری ئاژاوە و فیتنە ببێت، وە ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت کە بەدەستی خۆی بتەکانی شکاندوخرایە ناو ئاگر لە پێناوی ئەوەدا لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە دەفەرموێت: ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ﴾[1]

واتە: ( خوای پەروەردگار، خۆم و نەوەکانیشم بە دوور بگرە لەوەی بکەوینە ناو بت پەرستیەوە * پەروەردگارم بە ڕاستی ئەو بتانە خەڵکێکی زۆریان سەرلێشێواو گومڕا کردووە).

[1] إبراهيم: ٣٥ – ٣٦

جا ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت لە خۆی ترسا لەوەی بکەوێتە ناو بت پەرستیەوە لەبەر ئەوەی دڵەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجانەکانی خوای پەروەردگاردان، لەبەر ئەوەی مرۆڤ دەگونجێت کە گومڕا ببێت و سەری لێبشێوێ لەپاش ڕێنمونی، جا بۆیە مرۆڤ دڵنیا نابێت لە خۆی لە گومڕایی و سەر لێشێواوی، چەند زانا هەیە گومڕا بووە، وە چەند لە خوا ترس هەیە پاش ئەوە تاوانبار و پاشگەز بوویەوە، جا تا موسڵمان لە ژیاندا بێت ئەوا دڵنیا نابێت لە خۆی لەوەی تووشی ئاژاوە و فیتنە ببێت بە تایبەتی لەکاتی زۆر بوونی ئاژاوەدا: ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ ﴾ [1]

واتە: ( پەروەردگارم بە ڕاستی ئەو بتانە خەڵکێکی زۆریان سەرلێشێواو گومڕا کردووە).

وتەی: (( وە بترسێت لەوەی کە تووشی ببێت )) واتە: بترسێت و دڵنیا نەبێت لە خۆی لەوەی کە بڵێ من ناکەومە ناویانەوە نە خێر بەڵکو دەبێت زۆر هۆشیارو ئاگادار بێت .

---

[1] إبراهيم: ٣٦

**زانای پایە بەرز ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمویەتی: ((پەنا دەگرین بەخوا لە ئەنجامدانی کارێك کە ببێتە هۆی توڕەبوونی خوا، وە پەنا دەگرین بە خوا لە ئێشی سزاکەی)).**

## ( ڕاڤە )

زانای پایە بەرز کۆتای پەیامەکەی بە پەنا گرتن بە خوا هێناوە و دەستگرتن پێوەی و پەنای بۆ بردووە لە توڕەی و هۆکارەکانی سزاکانی، ئەوە وا دەکات کە موسڵمان لە خوای بەرزو بەڕێز بترسێت، وە کە دڵنیاش نەبێت لە خۆی لە توش بوون و کەوتنە ناو ئاژاوە و گومڕاییەوە تا لە ژیاندا بێت، وە هەر لەبەر ئەوەیە کە ئیبن و مەسعود ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت (( من كان مُسْتَناً فليستَنَّ بمنْ قَدْمات، فإن الحيي لا تؤمن عليه الفتنة )) [١] .

واتە: (( هەر کەسێ لە ئێوە دەیەوێت شوێن کەسێ بکەوێ و ڕێ و شوێنی هەڵگرێ‌و بیکاتە دەمڕاست و پێشەوای خۆی ئەوا با کەسێك بکاتە پێشەواو دەمڕاست و شوێنی بکەوێت کە مردووە، لەبەر ئەوەی زیندوو پارێزراو نابێت لە تووش بوون و کەوتنە ناو ئاژاوەوە )) .

جا بۆیە کەسێ زیندوو پارێزراو نابێت کە کەوتە ناو ئاژاوەو خراپە کاریەوە ئەگەر چیش لەوانە بێت کە زۆر لە خوا دەترسن و زاناترینیان بێت چونکە تا لەژیاندا بێت دەگونجێت دووچاری ئاژاوەو فیتنە ببێت .

---

١ اخرجه اللا لكائي في اصول السنة ( ١٣٠ – ١٣١ )، والخطيب في الفقيه و المتفقيه ( ٤٦٠ )، و اخرجه ابن عبدالبرفي جامع بيان العلم و فضله ( ١٨٨١ ) نحوه عن علي رضي الله عنه، قال الهيشمي في الجامع الزوائد (١/ ١٨٠ ) : (( رجاله رجال الصحيح )).

**پاشـان دەفـەرموێت: (( درود و سـلاّوی خـوا لەسـەر باشـترین دروستکراوی موحەمەدﷺ و خزم و کەسە نزیکە ئیماندارەکانی و هەموو هاوەڵە بەڕێزەکانی ڕەزای خوایان لێبێت ))**

**( ڕاڤە )**

وەشیخ الآسلام موحەمـەدی کـوڕی عبـد الوهـاب کۆتـای بـە نامـەو پەیامەکـەی بـە سـلاّواتدان لەسـەر پێغەمبـەرﷺ هێنـاوە، وە ئـەوەش باشـترین کۆتاییـە، جـا درودو سـەلام لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ دروسـتە لەسـەرەتای هـەموو کارەکانـدا و لـە کۆتاییەکەیشیدا، لەبەر فـەرموودەی خـوای گـەورە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾[1]

واتە: (بەڕاستی خـواو فریشـتەکانی درودو صـلاوات لەسـەر پێغەمبـەرﷺ دەدەن، خوا بەزەیی ومیهرەبـانی خـۆی ئەڕێـژێ بەسـەریا و فریـشتەکانیش داوای پایەبـەرزی و لێبوردنی بۆ دەکەن، دەسا ئێوەش ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! درودو صـلاواتی لەسەر بدەن، وە سەلامی لێبکەن).

وە ئـەوەش لـە مـافی پێغەمبـەرە ﷺ بەسـەرمانەوە کـە صـلاواتی لەسـەر بـدەین و سەلامی لێ بکەین .

وە صلاواتی خوا لەسەر بەندەکەی واتاکەی ئەوەیە کە ستایش و باسکردنیەتی لای فریشتەکان، وە صلاواتی فریشتەکانیش بـۆ پێغەمبـەر ﷺواتاکـەی ئەوەیـە کـە داوای لێخۆشبونی بۆ دەکەن. وە صلاواتی ئادەمیەکان و موسڵمانانیش واتاکەی ئەوەیە کەلە

---

[1] الأحزاب: ٥٦.

خوای گەورە دەپارێنەوە بۆی، جا ئێمە ئەگەر وتمان: صلّى الله وسلم على محمد صلّى الله عليه وعلى اله و سلم، ئەوا ئێمە داوا لە خوا دەكەین كە پاداشتی بدانەوە و پلەی بەرز بكات و سەلامی لێبكات و باسی چاكەو گەورەی بكات لەلای فریشتە پایە بەرزەكان.




**پرسیار:** کۆمەڵێك هەیە ناویان لە خۆیان ناوە (( قورئانیەکان ))، ئەوانە هیچ وەرناگرن و باوەڕیان پێ نییە تەنها قورئان نەبێت، ئایە حوکمی بێ باوەڕی دەدرێت بەسەریاندا ؟

**وەلام:** بەڵێ گومان لە بێ باوەڕیاندا نییە، وە لەبەر ئەوەی ئەوان درۆزنن لە وتەکانیاندا کە دەڵێن ئێمە کردەوە ناکەین تەنها بە قورئان نەبێت، جا هەر قورئانە فەرمانمان پێ دەکات بەشوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە کردەوە بکرێت بە سونەتەکەی، لەبەر ئەوە خوای بڵند دەفەرموێت: ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝١٣٢ ﴾[1]

واتە: (گوێڕیەڵی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن تا بەڵکو بەر ڕەحمەتی و بەزەیی خوای گەورە بکەون).

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ﴾[2]

واتە: (خۆ ئەگەر فەرمان بەرو گوێڕایەڵی ئەو بن ئەوا ڕێنمون و بەختیار دەبن).

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ﴾[3]

واتە: (( گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بن ﷺ لە هەموو کاروبارێکدا)) .

---

[1] آل عمران: ١٣٢

[2] النور: ٥٤

[3] النساء: ٥٩

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴾[1]

واتــە: ( وە هەرچــی پێغەمبــەرﷺ پێــی دان وەری بگــرن واتــە: بەچــی فــەرمانی پێکردن بیکەن، وە ڕێشی لە هەر شتێ لێ گرتن ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن)

وە قورئان کۆمەڵێك شتی زۆر کۆبەندو کورتی تیایە کە ڕاڤەو شــی ناکرێتــەوە تــەنها لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺنەبێت وەکو نوێژ، جا خوای بەرزو بــەڕێز لــە قورئانــدا باســی نوێژی کردووە و هانی داوە بــۆ ئەنجامــدان و کردنــی بــەڵام ئایــە بۆمــان ڕونکراوەتــەوە ژمارەی ڕکاتەکانی نیوەڕۆ و عەسرو شێوان و خەوتنان و بەیانی، ئایە قورئــان ئــەوەی بۆ ڕوون کردوینەوە ؟ ئەوە ڕوون کراوەتــەوە لــە سوننەتی پێغەمبــەر ﷺبــە گــوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: ((صلوا كما رأيتموني أصلي ))[2].

واتــە: (( نوێــژ بکــەن وەکــو مــن دەبیــنن نوێــژ دەکــەم — واتــە: هــەر وەکــو مــن نوێژەکانتان بکەن )) .

وە هــەروەها زەکــات دان لــە قورئانــدا باســکردنی هــاتووە و فــەرمانیش کــراوە بــە دەرکردنی لە ماڵ و سامان، بەڵام ئایە قورئان ڕادەی زەکــات و بڕەکــەی ڕونکردۆتــەوە کە وەردەگیرێ لەو ماڵانەی کــە زەکــاتی تیایــەو لێــی دەردەکرێــت، ئــەوە هەرهــەمووی پێغەمبــەرﷺ ڕونیکردۆتــەوە، جــا بۆیــە ســوننەت ڕوونکەرەوەیــە بــۆ قورئــان، جــا هەرکەسێ کردەوە نەکات بە سوننەت ئەوا کردەوەشی نەکردوە بە قورئان .

[1] الحشر: ٧

٢ اخرجه البخاري ( ٦٣١ ) من حديث مالك بن الحويرث رضي الله عنه .

وە هەندێ شتیش هەیە لە قورئاندا باس نەكراوە بەڵكو پێغەمبەرﷺ هاتووە باسی كردوەو فەرمانیشی پێكردووە بۆ نمونە قەدەغەكردنی لە كۆكردنەوە لە نێوان ئافرەتێك و پورەكەی ئیتر لە دایكەوە بێت یان لە باوكەوە[1].

(( واتە: دروست نییە موسڵمان دوو ژن بێنێ كە یەكیان پوری ژنەكەی خۆی بێت.. وەرگێڕ )) .

ئا ئەوە باس نەكراوە لە قورئاندا بەڵكو پێغەمبەرﷺ زیادی كردووە لە سوننەتدا كە دروست نیە كۆكردنەوەی لە نێوان ژنی خۆی و پورەكەیدا، وە پێویستە لەسەرمان كە كار بە سوننەت بكەین هەروەكو چۆن كار بە قورئان دەكەین: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ الحشر: ٧

ئا ئەوانە – واتە: ئەو قورئانیانە – پێغەمبەر ﷺ ئامارژەی پێداون كە بەهەواو ئارەزووی خۆی قسە ناكات بە فەرمایشتی جوانی (( یوشك رجل شبعان متكيء على أريكته يقول: بيننا و بينكم كتاب الله نحل حلاله ونحرم حرامهُ )) ثم قال ﷺ: (( ألا إني او تيتُ القرآن و مثلهُ معهُ ))[2] .

---

١ اخرجه البخاري ( ٥١٠٩ )، ومسلم ( ١٤٠٨ ) من حديث ابي هريرة رضي الله عنه .

٢ اخرجه احمد ( ١٧١٧٤، ١٧١٩٤ )، وابو داود ( ٤٦٠٤ )، و الترمزي ( ٢٦٦٤) و ابن ماجه (١٢)من حديث المقداد بن معدي كرب رضي الله عنه و صححه الألباني .

خۆزگایە شێخی پایە بەرز دەقی فەرموودەكەی هێنایە وەكو خۆی و بەو شێوەیەی كە هاتووە لە پەرتووكەكانی فەرمودەدا، ئەوەی شایەنی باسە ئەو فەرمودەیەم بەم شێوەیە بینیوە كە دەیهێنم بۆتۆی بەڕێزی خوێنەر بەو هیوایەی سوودی لێ ببینی :

سنن أبي داود – ٤٦٠٦ – حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ نَجْدَةَ حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرِو بْنُ كَثِيرِ بْنِ دِينَارٍ عَنْ حَرِيزِ بْنِ عُثْمَانَ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِى عَوْفٍ عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– أَنَّهُ قَالَ « أَلاَ إِنِّى أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ فَأَحِلُّوهُ وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ أَلاَ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ لَحْمُ الْحِمَارِ الأَهْلِىِّ وَلاَ كُلُّ ذِى نَابٍ مِنَ السَّبُعِ وَلاَ لُقَطَةُ مُعَاهِدٍ إِلاَّ أَنْ يَسْتَغْنِىَ عَنْهَا صَاحِبُهَا وَمَنْ نَزَلَ بِقَوْمٍ فَعَلَيْهِمْ أَنْ يَقْرُوهُ فَإِنْ لَمْ يَقْرُوهُ فَلَهُ أَنْ يُعْقِبَهُمْ بِمِثْلِ قِرَاهُ ».

واتــە: (( دوور نیــە و نزیکــە پیــاوێ تێــری خــواردبێ و پــاڵی دابێتــەوە لەســەر قەنەفەکەی‌و بڵێ: لە نێوان ئێمەو ئێوەدا قورئانەکەی خوا هەیەو بەس، حەڵاڵەکانی حەڵاڵ دەکەین و قەدەغە کاوەکانیشی قەدەغە دەکەین .....، پاشان فەرمووی ﷺ: ((ئاگاداربن کە من قورئان و وێنەی ئەوم پیادا نێردراوە و پێم دراوە ))

جا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین دەربارەی ئەوانەو ئاگاداریکردوینەتەوە لێیان .

**پرسیار**: ئایە هەڵوەشێنەری دەیەم: پشتهەڵکردن لە ئاینی خوا ئایە جێ بە جێ دەبێت لەسەر شیعە ڕافیزیەکان ؟

وەڵام: ئەوە جێ بە جێ دەبێت لەسەر هەموو کەسێك پشتهەڵبکات لە ئاینی خوا کەنە فێری دەبێت و نە کردەوەشی پێ دەکات ئیتر ئەو کەسە شیعەیەکی ڕافیزی بێت یان صۆفی بێت یان گۆڕ پەرست بێت یان هەرکەسێکی تر جگە لەوانە .

**پرسیار**: ئایە زۆر لێکردن ڕوودەدات بۆ کەسێ کە ئاژەڵ بۆ جگە لە خوای بەرزو بەڕێز سەر ببڕێت یان کڕنوش بەرێت بۆ بتێك ؟

**وەڵام**: زۆر لێکردن لە قسەو وتەدا دەبێت نەك لەکردەوەو ڕەفتاردا . هەرچی قسەیە دەگونجێ ووشەی بێ باوەڕی بڵێت ئەگەر زۆری لێکرا لەسەر ووتنی بۆئەوەی زۆر لێکردنەکە نەهێڵێ و لابیات، ئەوەیە کە هاتوە لە قورئاندا .

**پرسیار**: من پێش سێ مانگ موسڵمان بووم و دایك و باوکێکی بێ باوەڕم هەیە، ئایە چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەم ئایە بۆ من هەیە ڕقم لێیان بێت و دژایەتیان بکەم بە هەموو شێوەیەك؟

وەلاّم: هەڵسوکەوت و مامەڵە کردن بەو شێوەیە دەبێت کە خوای بەرزو بەڕێز لە قورئانـدا دیـاری کـردوەو دەفـەرموێت: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ﴾[1]

واتە: (هیچ کۆمەڵێ نابینیت کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژەکەی تر هەبێت دۆستایەتی ئەوانە بکەن کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن هەرچەندە ئەوانە باوکیان بن).

جا لەبەر خوا ڕقت لێیان بێت، بەلاّم هەرچی دەربارەی چاکە کردن لەگەڵیان ئەوا باش بە لەگەڵیان و بەچاکە ڕەفتاریان لەگەڵ بکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ﴾[2]

واتە: (هەمیشە گوێڕایەڵیان بە لەسنوری ڕەزامەندی خوادا، خۆ ئەگەر هەوڵیشیان داو پێیان داگرت لەسەر ئەوە کە شتێك بکەی بە شەریك و هاوبەشم، کە هیچ بەڵگەو زانیاریەکت پێ نییە ئەوسا گوێڕایەڵیان مەکە. وە لە دونیادا لەگەڵ هەردوکیاندابە شێوەیەکی چاك وپەسەندهاوەڵی بکە هاوڕێ وهاوکارێکی چاك بە بۆیان بە جل وبەرگ و خۆراك و هەڵسوکەوتی چاك دڵخۆشیان بکە).

[1] المجادلة: ٢٢

[2] لقمان: ١٥

ئەنجامدانی ئەم کارەباشانە لەگەڵ ئەوەی ئەوان بێ باوەڕن لە ڕووی ڕەدانەوەی کارەجوانەکانیان کە گەورەیان کردوەو باش بوون لەگەڵیدا، جا باوك و دایکیش مافیان هەیە چاکەیا لەگەڵدا بکرێت و باش بن لەگەڵیاندا، بەلاّم خۆش ویستن لە دڵدا ئەوا هەرگیز بێ باوەڕت خۆش نەوێت، وە لە کاتێکدا ئیبراهیم ﷺ بۆی ڕون بویەوە کە باوکی دوژمنی خوایە پشتی تێکردو دوورە پەرێزبوو لێی.

وصلّى الله وسلم على نبينا محمد و اله و صحبه وسلم




داواکارم کە خوای پەروەردگار نیاز پاکیمان پێ ببەخشێت و بمانکاتە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی پێغەمبەرەکەیﷺ، وە بە دوورمان بگرێت لە تازە داهێنراوەکان لە ئایندا لەو کەسانەشی کە ئالودەی ئەو داهێنراوانەن، وە داواکارم ئەم کارەم تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت و بەشی ڕوپامای تیادا نەبێت، وە داواکارم کە بیخاتە سەر کێشانەی کردەوە چاکەکانم و لە گوناهی من و دایك و باوکم و مامۆستاکانم خۆش بێت بیکات بە خاتری ناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی .

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

وآخر دعواي أن الحمد لله رب العالمين

وصلّى اللهُ على سيِّدِنا ونبيِّنا محمَّدٍ وعلى آلِه وصحبِه وسلّمَ

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

براتان ئاکۆ جلیل کریم (( گۆخلانی ))

سلێمانی - کوردستان

هەینی ٣- ڕەجەب - ١٤٣٠ کۆچی

٢٦ -حوزەیران - ٢٠٠٩ زاینی

## پێرستی بابەتەکان